# ناوەڕۆک

# پێشەکی

خوێنەری مێژا:

هەرەشەو مەترسی ڕاستەقینە لەسەر پارچە پارچەکردنی زمانی کوردی هەیە. هەندێک دەبێژن با دیالێکتی کرمانجی خواروو، دەڤۆکی سلێمانی، بێتە سەپاندن بۆ هەموو تەڤایێ کوردان. گوتنی لەم جۆرە لە ڕوانگەی زانستی زمان و ڕەوشی هەنووکەیی جڤاکی، ڕامیاری و دەروونی ئاخێوەرانی کوردستان نادروستە. هەندێک دەبێژن بلا جووت ستاندارد بێت، واتە هەردوو دیالێکتی کرمانجی ژووروو و خواروو ببێت بە ستاندارد. گوتنی لەم جۆرە بە واتای سەرەتای پارچە پارچەکردنی زمانی کوردی دێتە ئەژماردن، چونکە ئەمە بیانوو دەدات بۆ سێ، چوار، پێنج، بەڵکو پتر ستاندارد. لە ڕاستیدا هەندێک لە نووسەرانی زازا، لوڕو هەورامی بانگەشەی ستاندارد بەخۆ دەکەن، بەڵکو دەبێژن کە هەورامی، زازاو لوڕ زمانی سەربەخۆیەو کوردی نییە.

هەروەها مرۆڤ نازانێت کیژان دەڤۆک یان شێوەزار لە کرمانجی ژووروو بۆ ستاندارد دروستە. لەوڕا بۆیە جووت ستاندارد دەکرێت بۆ چەند پارچەی دی بچوک بچوک بێتە پارچەکردن. هەندێک دەبێژن با کرمانجی ژووروو و خواروو بێتە تێکەلکردن بە ئومێدی زمانێکی یەکگرتوو لە داهاتوو. گوتنی لە ئەم جۆرە تەواو نادروستە چونکە تێکەڵکردنی هەرەمەکی و نازانستی دەبێت بە پشێوی و سەرگەردانیی پتر. هەندێک دەبێژن زمانێکی فەرمی کە بۆ هەموو کوردان پەسەند بێت خەیاڵە و تووجار نایەت سازکردن. ئەز بە ئەم هەندە کەسانە دەبێژم ئێوە نەکوردن. ئەگەر زمانی فەرمی بۆ هەموو کوردان نەیەتە سازکردن ئەی ئیدی کوردان بۆچی خەبات دەکەن؟

ئەز دەبێژم: ئێمە پێکڤە دەتوانین زمانی فەرمی بۆ کوردستان و نەتەوەی کورد دروست بکەین، ئەویش لەسەر بنەمای زانستی زمان وەکو ئیتمۆلۆجی، دیالێکتۆلۆجی، سێمانتیک، سینتاکس و فۆنۆلۆجی، سۆسیۆلینگویستیک، سایکۆلینگویستیک، دیسکۆرس و جوداکردنی زمانی قسەو نووسین لە یەکدی و ڕەچاوگرتنی ڕەوشی ڕامیاری و جوگرافیی هەنووکەیی کوردستان. مخابن هەندێک لە نووسەران و ڕەوشەنبیرێن کورد لەسەر بنەمای زمانی قسە، ناوچەیی، هزری خێلەکی، ڕق، پارەپەیداکردن و هیدی بێڕێزی بە زمان و مرۆڤی کورد دەکەن و دەخوازن زمان و نەتەوەی کورد پتر پارچە پارچە بکەن. بە کەیف خۆشی زمان و نەتەوەی کورد گەلێک بەهێزەو زمانێکی فەرمی کە جێگەی پەسەندی هەموو بێت دێتە دروستکردن.

هەتاکو ئەمڕۆ زمانی قسە، کە زمانی شێوەزارو دەڤۆکی جودا جودای دیالێکتەکانی زمانی کوردییە، بووە بە نۆرم و بە فۆرمی نووسین. مەزنترین پێنگاڤ/هەنگاو بە ئاراستەی زمانی نووسین یان فەرمی جوداکردنی زمانی قسەیە لە نووسین. زمانی قسە هەردەم ئالوگۆڕی فۆنۆلۆجی بەسەر دێت. بە درێژایی مێژوو گەلێک گۆڕانکاری فۆنۆلۆجی بەسەر زمانی شێوەزارو دەڤۆکی جودا جودای زمانی کوردی هاتووە. ئەمە هۆکاری مەزن بووە لە دوورخستنی شێوەزارو دەڤۆکێن کوردی لە یەکدی. لە ڕاستیدا گۆڕانکاری زۆر لە ئاستی دەنگ، وشەو ڕستە لە زمانی کوردی پەیدا بووە.

دەگوترێ تاقیکردنەوە باشترین بەڵگەیە. لە ئەم کتێبە پێنج تێکست لە نێوان هەردوو دیالێکتی سەرەکی کرمانجی ژوورو و خوارو هاتۆتە بەراوردکردن. دیسان لە هەموو ئاستەکانی زمان زیاتر لە ٥٠٠ وشە لە نێوان ئەم دوو دیالێکتە هاتۆتە بەراوردکردن. لە ئەم بەراوردکردنە یارمەتی لە دیالێکتی لوڕو گۆرانی (هەورامی و زازا) هاتۆتە وەرگرتن. لە گۆڕی ئەنجام و دەرئەنجامی ئەم تاقیکردنەوەو بە

پشتبەستن بە ڤەکۆڵینی زانستی ئەوە دێتە سەلماندن کە بەڵێ زمانی فەرمی بۆ کورد کارێکی کردە نییە و دێتە چێکردن.

لە ئەم کتێبە، ئەو گۆڕانکارییانەی کە بوون بە هۆکاری جیاوازی لە نێوان وشەی بەکارهێنراو لە زمانی کوردی، بە تایبەتی کرمانجی ژووروو و خواروو، هاتۆتە دەستنیشانکردن. ئەم جیاوازییانە لە ڕوانگەی فۆنۆلۆجی، دیالێکتۆلۆجی و سێمانتیک هەوڵی نەهێلانی دەدرێ. بە ڕاستی پڕانی جیاوازی لە چۆنیەتی بێژانکردنی وشە لە نێوان دیالێکتی ک.ژ. و ک.خ. دێتە چارەسەرکردن، واتە ئەم جیاوازییانە نامێنن. دەنگ، وشەو ڕێزمان، واتە فۆنۆلۆجی، لێکسیکۆن و سینتاکس، لەگەڵ یەکدی بەندن و ناهێننە دابڕاندن. ئەگەر ئێمە بتوانین، یان ڕاستتر بخوازین، گرفتی دەنگ و وشە چارەسەر بکەین، ئەوا گرفتی ڕێزمانیش چارەسەر دەکەین. زمان، هەروەکو مرۆڤ، پێویستی بە خۆراک و خزمەتی بەردەوام هەیە بۆ ئەوەی بژی. هیچ زمانێک لە ئەم جیهانە بێ گرفت نییە بەڵام دەزگا و زمانناسانی خودانی زمان ئەرکی تەندروستی و پێشخستنی زمانەکە لەئەستۆ دەگرن.

خۆزگە ئێمەی نووسەر و ڕۆشنبیر بتوانین پێکڤە کاربکەین، ڕێز لە یەکدی بگرین و بڕوامان بە زمانی فەرمی بۆ کورد هەبێت. خۆزگە پەرتکردنی زمانی کوردی نەبێت بە ئامانج بەڵکو ڕێکخستنی. خۆزگە ئێمە لە ڕوانگەی نەتەوەیی بیر بکەینەوە نەک دیالێکت، خێڵ یان شارو گوند. خۆزگە ئێمە لە ڕابردوو نەژین و فرمێسکی درۆ نەڕێژین بۆ بابا تاهیری هەمەدانی، ئەحمەدی خانی، نالی، مەولەوی و هتد. خۆزگە ئێمە لە ئێستا بژین و تەماشای داهاتوو بکەین. خۆزگەخواستن نیشانەی بێدەستەڵاتییە، بەڵام ئێمە دەبێت گۆڕانکاری لە بیرکردنەوەی خۆ بکەین. هەروەها ئێمە دەبێت دارشتنی نوێ بۆ ئەم بیرکردنەوانە چێ بکەین.

ڕاستییەکەی گرفت لە ئەوە نییە کە زمانی کوردی لە چەندین دیالێکت و زاراوە پێکدێت بەڵکو گرفت لە بەکارهێنەرانی زمانی کوردییە. لە ڕوانگەی مێژوو بڕوانین

ئـەوا نـەتـەوەی کـورد هـەردەم لـەتلـەت بـووەو گیـانی لووتبـەرزی و دوویـەرەکـی، دوژمنکاری و تۆڵە لەیەکدی سەندن زاڵ بووە. ئەم هۆیانە ڕێگر بووە لە ڕێکخستن و یەکخستنی زمانی کوری. کام زمان لە ئەم جیهانە لە چەندین دیالێکت و زاراوە پێک نەهاتووە؟ بۆچی دەبێت نەتەوەی دی خودانی زمانی نەتەوەیی، فەرمی یان ستاندارد بێت بەڵام ئێمە نەء؟ من جارێکی دی دووپاتی دەکەم کە دەکرێت زمـانی سـتاندارد، واتە زمانی فەرمی یان نەتەوەیی، بەدی بهێنرێ. بۆ سەلماندنی ئەم گوتنە ئەم کتێبە باشترین بەڵگەیە.

خوێنەری هێژا!

ئەم کتێبە تەنها بە مەبەستی خوێندنەوە نەهاتۆتە نڤیسین، بەڵکو بـە مـەبـەستی دروستکردنی زمانێکی فەرمی بۆ گشت کوردستان. تێگەیـشتنی تـۆ، هـەڵـسەنگانـدن و بەرسڤی تۆ بۆ بەدیهێنانی ئەم ئاواتە گرنگە. تەنها زمانی فەرمی دەتوانێت نوێنەرایەتـی رابردوو، ئێستاو داهاتووی ئێمە بکـات. ڕابردوویـەک کـە پڕیـەتـی لـە هـەڵـە، نـەزانـی، شکـست و ملێۆنـەهـا قوربـانی. ئێـستایەک کـە سـەدەهـا ئاریـشەو گرفتـی ڕابـردوو دەگرێتەخۆ، بـە جۆرێـک خـەریکـە دەرگـای داهـاتوو لـە نـەوەی نـوێی کـورد دابخـات. بەدیهێنانی زمانی فەرمی بۆ کوردستان ئەرک و لێپرسراویەتی ئێمەیە کە ئێستا دەژیـن. لە ڕاستیدا زۆرێک لە کێشەو گرفتی کورد لە ڕێگەی زمانی فەرمی دێتە چارەسەرکردن.

لە نووسینی ئەم کتێبە گەلێک کەس هاریکار بوون کە جێگای سوپاسن. ژێدەری هەورامی بۆ ئەم کتیبە مامۆستا عوسمان مەحەممەد هەورامی-یە، زازا کەنعان دۆغـان و مالمیسانژ، هەروەها لوڕ عاسف کەلهوڕو هی دی. بێجگە لە ژێدەری زۆری کتێـب و فەرهەنگ ئەوا من بۆ کرمانجی ژووروو یارمەتیم لە نەوزاد هروری لە دهـۆک، ئـوێکتن مەحەمەد لە دیاریەکر وەرگرتووە. دیسان ئەز گەلێک سوپاسی کتێبخانەی کوردی لە ستۆکهۆلم دەکەم. لە کۆتاییدا گەلێک سوپاس بۆ هەموو هەڤال و دۆسـتانی دی کـە بە گەلێک جۆر هاریکار بوون لە بەرهەمهێنانی ئەم کتێبە.

# بەشی یەکەم

## زمان، دیالێکت و زمانی فەرمی

### سەرەتا

زمان تەنها کەرەستەیەک نییە بۆ ناردن، وەرگرتن و لێتێگەیشتنی پەیامی نێوان مرۆڤەکان، بەڵکو دیسان زمان کەرەستەی ناسین و ناساندنی تاک و کۆیە بۆ هەر شوێن و دەمێک. لە دەوروبەری ئێمە هەزاران زمان و دیالێکت هەیە کە گوزارشت لە جۆرەها بۆچوونی هزری، کۆمەڵایەتی/ جڤاکی، چینایەتی، ڕەگەزی، وێژەیی، شێوازی ژیان هتد. دەکەن.

زمان دیاردەیەکی کەلتورییە، بۆیە گەلێک پەیوەستە بە بوونیادی جڤاکی و بەهاکانی سیستەمی کۆمەڵگا. شێوازی بەکارهێنانی زمان لە لایەن گروپی جودا جودا یان بەکارهێنانی دیالێکتی جودا جودا، کە دەچنە نێو چوارچێوەی یەک زمان، بە شێوەی جیاواز دێنە هەڵسەنگاندن و تەماشاکردن. لە ڕاستیدا ئەم جۆرە هەڵسەنگاندنە جڤاکییە/کۆمەڵایەتییە نەک لینگویستیکی.

بە پێی سیستەمی لینگویستیک هەموو زمانەکان و هەموو دیالێکتەکان وەکو یەک 'باشن' ، بۆ نموونە دیالێکتی A باشتر نییە لە دیالێکتی B، هەروەها شێوازی بەکارهێنانی زمانی گروپی A باشتر نییە لە B.

هەڵسەنگاندنەکە/تەماشاکردنەکە خودیـیە، واتە سەبجێکتیڤە. ئەمە دەکەفێتە سەر ئەو کەسەی/کەسانەی کە هەڵسەنگاندنەکە دەکات/دەکەن کە

هەڵبەت دەشێت باش بۆ خۆیان بێژن و خراپ بۆ ئەوانی تر. بۆیە/لەوما زمان دەکرێت وەک فاکتەرێکی گرنگ بۆ پێناسەکردنی گروپێک، هاوسۆزی بۆ گروپێک یان جوداکردنی گروپێک بێتە ئەژماردن. لە ڕوانگەی سۆسیۆلینگویستێک کۆمەڵگا کاریگەری هەیە بەسەر زمان، بۆیە ڕەوشی جڤاکی کاریگەری بەسەر بوونیادی زمان هەیە، بەڵکو تەنانەت بەهاکانی کەلتووری کۆمەڵگا کاریگەری بە سەر زمان هەیە.

زمان دیاردەیەکی فرە بگۆڕە، هێندەی ئەم گۆڕاندنە بەندە بە خودی زمان دەکرێت هێندە ژی بەند بێت بە کۆمەڵگا. زمان تەنها کۆدێکی سادە نییە کە لە لایەن هەموو مرۆڤەکان و لە هەموو ڕەوشێک بە هەمان شێوە بێتە بەکارهێنان، بەڵکو زمان کەرەستیەکی گەلێک ئاڵۆزە و دەبێت لە ڕوانگەی جودا جودا بێتە تەماشاکردن و خوێندن.

## ئەرکی زمان

زمان ئامرازی تێگەیشتنە. بەهۆی زمان مرۆڤ لە کۆمەڵگا و کۆمەڵگاش لە ئەو تێدەگات. هەروەک چۆن زمان هۆکاری نزیکخستنەوەی کۆمەڵگاکانە، هەر ئاواش ڕێگرێکە لە نێوانیان. بە کورتی زمان ئەم ئەرکانەی خوارەوە دەهێنێت بە جێگەیاندن:

١. کاری گەیاندن: زمان بۆ گەیاندنی زانیاری، بیروڕاو کۆنترۆڵکردنی خووی کەسانی تر دێتە بەکارهێنان. لە ئێرە زمان وەکو ئامرازی گەیاندن، دەربڕین و دەربەڕاندن باس دەکرێت.

٢. کاری ئامادەباشی هزری: زمان دێتە بەکارهێنان بۆ تێگەیشتن، وەرگرتن و دامەزراندنی هەڵوێست لە ژیان، دیسان لە مامڵەکردن و چارەسەرکردنی ئاریشەو بەجێگەیاندنی فەرمان.

٣. کــاری ئۆرگــانیزەکردنــی کۆمــەڵ. زمــان بــۆ ڕێکخــستنی کۆمــەڵگــاو دەستنیشانکردنی پەیوەندی چین و توێژەکانی کۆمەڵ دێتـە بـەکارهێنـان. دیسان زمان وەکو سیمبۆڵێک بۆ دەستنیشانکردنی پلەی کۆمەڵایەتـی/جڤـاکی مرۆڤـەکـان بۆ نموونە؛ باری ئابوری، کۆمەڵایەتی، تەمەن، پیشە، نەتەوە، ڕەگـەز، ئـایین هتـد. دێتە بەکارهێنان.

٤. کاری دەربڕینی هـەست. مـرۆڤ بـەهـۆی زمـان دەتوانێـت حـەز، ویـست و ئاواتی بۆ بەرامبەرو دەوروبەری دەرببڕێت، جا ئەم حـەزانـە بـاش بـن یـان خـراپ، گشتی بن یان تایبەت.

٥. کاری تۆمارکردنی ڕاستی. زمان بۆ پاراستنی زانیاری دێتە بەکارهێنـان، بـۆ نمونە زانیاریی مێژوویی، زانستی، بازرگانی، دارایی، یاسایی هتد.

جگـە لـە ئـەو خاڵانـەی سـەرەوە زمـان ڕۆڵێکـی سـەرەکـی لـە دروسـتکردن، پەرەپێدان و پاراستنی کەلتووری نەتەوایەتی هەیە.

## زمان و هزر

نزیکایەتی زۆر لە نێوان زمان و هزر هەیە. ڕۆژانە چەندەها نیشانە بـەدی دەکرێت کە مرۆڤ بەهۆی زمان بیردەکاتەوە. بە پێچەوانە دۆخی واش بەدی دەکرێت کە مرۆڤ یەکەمجار بیردەکاتەوە دواتر بەرگ بە بەر بیرکردنەوەکانی دەکات. بە شێوەیەکی تر زمان ئامرازێکی گرنگە لە دەربڕینی هزر.

جۆرەها شـێوازی بیرکردنـەوە هـەیـە، بـەڵام مـەرج نییـە هـەمـووی پـەیـوەنـدی ڕاستەوخۆی بە زمان هەبێت. هـیچ بـەڵگـەیـەک نییـە ئـەوە بسەلمێنێت کـە زمـان پەیوەندی هەبێت لە دەربڕینی هەسـتەکـانی مـرۆڤ، بـۆ نموونـە لـە کاردانـەوەی بـۆ بابەتێک یان ڕووداوێک. لە ئێرە زمان دێتە بەکارهێنان بۆ ڕوونکردنەوەی کاریگـەریـی

ڕووداوەکە یان بابەتەکە، بەڵام جۆری دەربڕینی هەستەکە هیچ پەیوەندیی بە زمان نییە. بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونە بەڵگەی زۆر هەیە، بۆ نموونە ئێمە ڕۆژانە جۆرەها فەنتازی و خەیاڵ بێ یارمەتیی زمان ئەنجامدەدەین. لە هەمبەر ئەمە، زمان لە داڕشتنی بیرکردنەوەکانی مرۆڤ گەلێک چالاکە. مرۆڤ بەهۆی زمان لە گێڕانەوەی چیرۆکێک، چارەسەرکردنی گرفتێک یان پلاندانانی کارێک بیردەکاتەوە، بۆ نمونە قسەکردن لەگەڵ خۆ پێش گوتنی گوتارێک یان ئەنجامدانی کردارێک. ئەم جۆری بیرکردنەوانە پێی دەگوترێت بیرکردنەوەی لۆجیکی، چونکە هەردوو توخمی دیدەکتیڤ و ئیندەکتیڤ دەگرێتەخۆ[1]. زمان بۆ ئەم جۆرە بیرکردنەوانە گرنگە چونکە یارمەتیدەری سەرەکییە لە ئۆرگانیزەکردن و پێشکەشکردنی ئەوەی مرۆڤ لە هوندرێدا/ناخیدا هەیە و دەخوازێت بیهێنێتە دەربڕین.

ئاشکرا نییە کە تاکو چی ئاستێک زمان لە داڕشتنی بیرکردنەوەکانی مرۆڤ و تێگەیشتنی لە ڕاستییەکانی ژیان خۆی هەڵدەقورتێنێت، بەڵام وا دیارە کە پەیوەندییەک هەبێت لە نێوان هەردوولا. بە شێوەیەکی گشتی هەموو زمانەکان هەمان بوونیادیان هەیە، هەمان توانایان لە دابینکردنی پێویستی و ئەرکەکان هەیە. کاراکتەری زمان تا ڕادەیەکی زۆر بایۆلۆجی دامەزراوە. پێکهاتەی زمان بریتییە لە دەنگ، وشە و ڕێزمان. بوونی زمانی جیاواز واتای بیرکردنەوەو زیرەکیی جیاواز نابەخشێت، بە گشتی زارۆک/منداڵ هەمان ماوەی دیاریکراوی دەوێت بۆ فێربوونی زمانی زگماکی بەبێ ڕەچاوکردنی جۆری زمان. بە کورتی

---

[1] Deductive elements: لە کاتی بیرکردنەوە و چارەسەرکردنی گرفتێک یان هاوکێشەیەک بە پێی مەرجی پێدراو، بۆ نموونە لە هاوکێشەیەکی ماتماتیک.

Inductive elements: لە کاتی مامڵە و چارەسەرکردنی گرفتێک بەپێی زانیاری زانراو، بۆ نموونە لە شوێنێکی کار.

هەڵگرانی باوەڕی گەردوونی Universalism دەبێژن زمان هیچ ڕۆڵی نییە لە ئەوەی کە چۆن مرۆڤ لە ڕاستییەکانی ژیان تێدەگات. بە باوەڕی ئەمان هەموو زمانەکان خودانی هەمان بنەمای یەکسانن. بە پێچەوانەوە گریمانەیەک هەیە لە لایەن پەیوەستبووەکان Relativism کە دەبێژن تێگەیشتنی مرۆڤ لە ڕاستییەکانی ژیان (واقع) ڕاستەخۆ پەیوەستە بە ئەو زمانە کە مرۆڤ بە ڕێکەفت فێری بووە. بە پێی ئەمان ئەو مرۆڤانەی کە زمانی جیاواز دەئاخافن لە دنیای جیاواز دەژین. ئەوان جیاواز بیردەکەنەوە چونکە بە تەواوەتی زمانەکە بڕیار دەدات لە چۆنیەتی بیرکردنەوەی ئەوان.

ڤەکۆلین ئەوەی نیشانداوە کە ئاستەنگە ئەوە بێتە سەلماندن کە ئەو جیاوازییانەی لە نێو زمانەکان هەیە ببێت بە هۆکاری ئەوەی کە قسەکەران تێگەیشتنی جودایان لەمەڕ ژیان هەبێت. بەڵام لە لایەکی دی مرۆڤ بەبێ زمان ناتوانێت باسی تشتێک بکات، ڕوونکردنەوە لەسەر تشتێک بدات یان لە ژیان تێبگات. ئێمە لە ڕێگەی پەیوەندی بە یەکدی لە نێو جۆرەها کۆنتێکستی جڤاکی ئامادەیی جودا جودا وەردەگرین و چالاکانە لە ئاڵوگۆڕکردنی زانیاری پشکدار دەبین. بۆیە زانیاری وێستگەکراوە (هەردەم دەخرێتە نێو کۆنتێکستێکی مێژوویی، جڤاکی و کەلتووری)، و پەیوەندییەکەش دروستکراوە، بەڵام ئەم زانیاری و پەیوەندییە لە شێوەی زمان بونیادنراوە. بە پێی ئەم ڕوانگە سۆسیۆکەلتوورە، بیرکردنەوەی ئێمە، زمانییە.

بە ئەم جۆرە ئێمە لە دەرەوەی بازنەی زمان، ناتوانین زانیاری دەربارەی واقعێکی ئۆبجێکتیڤانە وەربگرین. بەڵێ بە بێ بونیادێکی زمانەوانی و جڤاکی بۆ ئەم واقیعە، بیرکردنەوە ئاستەنگ دەبێت. لە ئەم ڕوانگەوە بیرکردنەوەو زانینی ئێمە، بەبێ ئەو بونیادە زمانەوانییە، بۆ ئەم بیرکردنەوەو زانینە ناهێتە کردن. بە سادەیی ئێمە دیلی زمان-ین.

## زمان گۆڕین

له جیهاندا خەڵکانێکی زۆر کە خودانی زمانی جیاوازن شانبەشانی یەکتر دەژین. لە زۆربەی دۆخەکان سیستەمە ڕامیاری ڕێڤەبەرییەکە ئەم خەڵکانەی لەیەک کۆکردۆتەوە، جودا کردۆتەوە. یان خەڵکێکی یەک زمانی بۆ چەند بەشێک دابڕاندووە. بە جۆرێکی تر، چەند کۆمەڵێکی زمان جیاوازی لە چوارچێوەی یەک وڵات کۆکردۆتەوە. یان کۆمەڵێک کە خاوەنی یەک زمانن، بەسەر چەند وڵاتێک دابەشکردوە. هۆکارەکانی کۆمکردن و پەرتکردنی خەڵکانی یەک/فرە زمان زیاتر مێژووییە.

لە باری کۆنتاکتی لە ئەم چەشنە Language contact situation لەوانەیە بە دوای چەند نەوەیەک کۆمەڵێک خەڵک کۆتایی بە بەکارهێنانی زمانی خۆ بهێنن و ببن بە هەڵگری زمانی خەڵکێکی تر، ئەم ڕەوشە پێی دەگوترێت زمان گۆڕین Language change. زۆر جار هەوڵدان بۆ پاراستن و مانەوەی زمانێک بێهودەیە، چونکە ئەو زمانە چیتر ناتوانێت پێویستی/پێدڤی زمانیی بەکارهێنەرانی دابین بکات، بۆیە خەڵک ناچار دەبێت ببێت بە هەڵگری زمانێکی تر.

زمان گۆڕین لە گۆشەنیگای مێژوویی و جیهانی، دیاردەیەکی سروشتییە. وازهێنان لە زمانێک و تواندنەوەی لە بۆدەقەی زمانێکی تر هەبووە. بۆ نمونە لە ئەم سێسەد ساڵەی دواییدا بەهۆی داگیرکاری ئەوروپییەکان دەیەها زمان لەناوچوون. لەناوچوونی زمانێک تەنها واتای زیان نییە لە کۆمەڵێکی دیاریکراوی خەڵک، بەڵکو ئەمە زیانێکە بۆ سەرجەم شارستانییەت، کە پێکهاتەکەی فرە زمانییە. هەر زمانێک هەڵگری کەلتوور، فەلسەفەو شێوازی ژیانێکی تایبەتە.

هۆکارەکانی مردنی زمانێک یان دیالێکتێک دەگەڕێتەوە بۆ گۆڕانکاری لە پێکهاتەی ئابووری، جڤاکی، ڕامیاری و دیمۆگرافی کۆمەڵگا. گۆڕینی هەیکەلی

کۆمەڵگایەکی کشتوکاڵی و خێڵەکی بە یەکێکی تری تازەی پیشەسازی یان نیمچە پیشەسازی دەبێت بە هۆکاری گۆڕانکاریی گەورە لـە زمـان و کـەلتووردا، چونکـە خەڵک لە گەلێک ناوچەی جیاواز تێکەڵ دەبێت. لە پاڵ ئەمەشدا دامەزراوەی نوێ، کارگە، دەزگاکانی بەڕێوەبردن، میدیا، پرۆسەی فراوانبوون و گەشـەسـەنـدن بـرەو دەدات بە پترکردنی بزاڤی جڤاکی و تێکەڵبوونی دانیشتوان لەنێو هەموو ناوچەکانی وڵات و توێژەکانی کۆمەڵدا. ئەمانە هۆکاری گرنگن لـە لاوازکردنـی دیالێکتـەکـان و بەهێزکردنی یەک زمانی وڵات. لە ڕەوشێکی لە ئەم چەشنە، زمـانی زۆرینـە زیـاتر بەکاردێت و تـاکو دێـت زمـانی کـەمینـە لاوازتـر دەبێـت، چونکـە کـەمتـرو کـەمتـر بـەکاردێـت. ئـەم گۆڕانکارییانـە دەکرێـت سروشـتی بـن، بـەڵام زۆرجـار ڕامیـاریی داڕێژکراوی وڵاتی زمانی باڵادەستی لە پشتە بۆ تواندنەوەی زمانی کەمینە.

بـەکارهێنـانی زمـانی کـەمینـە بـە بـەراورد لـەگـەڵ زمـانی زۆرینـە، هـەردەم سنووردارە، چونکە زمانی کەمینە لە سیستەمی ڕامیـاری، دەزگـا، فـەرمانگاکـان و خوێندنگاکان ناهێتە بەکارهێنان، بەڵکو تەنها لە دۆخی نافـەرمی وەکو هێمایـەک بۆ ئەمەک و پابەندبوونی کۆمەڵایەتی بەکاردەهێنرێ. ئەمە وا دەکـات کـە کـەمینـە هەرچی دۆمێنی کارکردنی زمانی باڵادەستە بیزانێت و بەکاری بهێنێت کە هەڵبـەت لـە زمانـەکـەی خـۆی نییـە، یـان هـەیـەو پێـی نازانێـت. بێجگـە لـە ئـەوەش بـارە ئابوورییە کۆمەڵایەتییەکـە مرۆڤـەکـان ناچـار دەکـات کـە جووتزمـان بـن بۆئـەوەی چالاک بن لە ژیاندا، بـۆ نمونـە لـە دەسـتکەفتنـی کـارو پیـشە. جووتزمـانزانی بـە قۆناغی یەکەم دێتە ئەژماردن لە پرۆسەی زمان لەدەستدان. ئەمـە بـۆ مـاوەیـەکـی درێژخایەن دەبێت بەهۆی کەمکردنی قسەکەرانی زمانی کەمینە کە ئـەمـیش واتـای زمان گۆڕین یان مردنی زمان دەدات.

وازهێنـان یـان تواندنـەوەی زمانێـک بـە تێکـەڵبـوونی کـەمینـە لـەگـەڵ زۆرینـە دەستپێدەکات کاتێک کەمینە بە خۆشی بێت یان تـۆپزی لـە هـەموو پرسـەکـانی کۆمـەڵگـا چالاکانـە بـەشـدار دەبێـت و ڕۆڵ دەبینێـت. بـە پێچـەوانـەوە ئـەگـەر کەمینەیەک نەخوازێت لە کۆمەڵگا چالاک و هەڵسوڕاو بێت یان خـۆی دوورەپـەرێـز بگرێـت یـان بێتـە دوورەپـەرێزگـرتن ئـەوا گۆڕانکـاری کۆمـەڵایـەتـی و هۆشـیاری فەرهەنگـی کـەمتـر تێیـدا ڕوودەدات و لـە لایـەن زۆرینـەی خـەڵـک بـە تـەمبـەڵ و پاشکەفتی ناوزەد دەکرێت یان وای لێدەکرێت.

## زمان و دیالێکت

زمانێکی جێگیر، لە قاڵبدراو و بێ گۆڕانکاری نییە؛ هەمـوو زمانـەکـانی جیهـان دیالێکت و دەڤۆکی جودا جودا دەگرنەخـۆ. زمـانی بـەکـارهێنراوی هـەنوکـەیـی لـە کۆمەڵێک خەڵک بۆ یەکێکی تر یان لە قسەکەرێک بۆ یەکێکـی تـر لـەنـاو هـەمـان بازنەی زمان بە گوێرەی ڕاڤەکردنی زمانەوانی، هەڵبژاردنی وشەو بەخـشینی واتـای ئەم وشانە هەروەها لە دارشتنی ڕستەکانیش یەک جۆر نییە.

کاتێک زمانی بەکارهێنراوی کۆمەڵێک لـە کۆمـەڵێکـی تـر لـە نێـو چوارچێـوەی هەمان زمـان جیـاوازیی ئاشـکرای هـەبێـت، ئـەوا ئـەم جیاوازییـە پێـی دەگوترێـت دیالێکت. پێناسەکردنی چەمکی دیالێکت هێندە ئاسان نییە، چونکە چەمکەکـە بـە گەلێک جۆر دێتە بەکارهێنان. بـەڵام پێـشئەوەی بچینـە نێـو ئـەم باسـە، دەکرێـت بپرسین بۆچی یەک زمان بۆ چەند دیالێکت کەرت دەبێت و چـۆن ئـەم دیالێکتانـە بڵاو دەبن. هۆکارەکان زۆرن، بەڵام گرنگترینیان مێژوویی، کۆمەڵایەتی و جوگرافین.

ژیـان و گـوزەرانـی مرۆڤـەکـان لـە سـەدەکـانی پێـشوو، ڕێگـای جۆراوجـۆری گرتۆتـەخـۆ، کـارو پیـشەی مرۆڤـەکـان لـە دەڤـەرێکـی دیـاریکراو بـە پێـی چـەنـد

مەرجێکی پێویست و تایبەت گۆڕاوەو بە پێی تێپەڕبوونی کات ئاڵوگۆڕی پێکراوە. مرۆڤەکانی ئەم دەڤەرە وشەی نوێیان داهێناوە، قەرز کردوە، هەروەها دەستەواژەی وایان داهێناوە کە بۆ کار و گوزەرانیان پێویست بووە، بۆ نمونە زمانی بەکارهێنراوی کوێستاننیشینەکان جیاواز بووە لە گەرمیاننیشینەکان، گوندنیشینەکان لە شارنیشینەکان، جوتیاران لە پیشەوەران هتد. بە شێوەیەکی گشتی، فاکتەری جوگرافی لە ئاراستەکردنی گوزەران و پەیوەندی دروستکردن و کۆنتاکتکردنی دەڤەرێک بە دەڤەری تروکۆمەڵی تر یەکلاییکەرەوە بووە.

باری ژیان، پەیوەندی و کۆنتاکتکردن دەبێت بە هۆکاری گۆڕانکاری ئابووری و جڤاکی؛ ئەمیش دەبێت بەهۆی گەشەسەندنێکی داینامیکییانەی دیالێکتێکی لە ئەم جۆرە خەسڵەتە. هەموو جۆرە کۆنتاکتێکی زمانی لە ئەم چەشنە، ڕۆڵی گەورەی لە گۆڕانکاری و ئاراستەکردنی دیالێکتەکان هەبووە بۆ هەردوو فەراهەمکردن و ڕێگاکردنەوەی خەسڵەتی زمانەوانی دیالێکتەکان و زمانەکانی تر بۆ سەر دیالێکتێکی دیاریکراو، یان کاریگەری ئەم دیالێکتە لە بڵاوبوونەوەو وەرگرتنی لە لایەن دیالێکت و زمانی تر. بە پێچەوانە، ئەو دیالێکتەی کە گۆشەگیرو داخراو بووە بە ڕووی دیالێکتی تر کەمتر گۆڕاوەو گەشەی کردووە، واتە کەمتر کاریگەری بەسەر دیالێکت و زمانی تر هەبووە، بە پێچەوانەوەش.

بۆ وەڵامی چۆنییەتی بڵاوبوونەوەی دیالێکتەکان دوو ڕێگا هەیە؛ بەردەوامی و پازدان. بەردەوامی بە واتای بڵاوبوونەوەی هێدی هێدی دیالێکتێک دێت لە چەقێکی دیاریکراو بە دەوروبەری خۆی، بە جۆرێک کە خەسڵەتەکانی ئەم دیالێکتە بەرەبەرە فراوانترو فراوانتر دەبێت تاکو ئەو سنورەی کە لە دەرگای دیالێکتێکی تر دەدات کە پێشبڕکێی لەگەڵ دەکات. دووەم ڕێگا پازدان، بە واتای دوورە بڵاوبوونەوەی دیالێکت دێت، بۆ نموونە پازدانی دیالێکتێک لە دەڤەرێکی

قەرەباڵغ بۆ یەکێکی دوور کە دراوسێی نییە بێ ئەوەی خەڵکانی نێوان ئەم دوو دەڤەرە بکەونە ژێر کاریگەری زمانەوانیی ئەم دیالێکتە. سەیری وێنەی ١ بکە.




وێنەی ١. شێوازی بڵاوبوونی بەردەوامی و پازدانی دیالێکتەکان.

ژێدەر (Staffan Nyström 1996:3).

با ئێمە ڤەگەڕێین/بگەڕێینەوە بۆ لای پێناسەی دیالێکت. بە پێی پێناسەی پێشوو، ئەگەر کۆنتاکتی دیالێکت پێوەرێک بێت بۆ تێگەیشتنی هاوبەش (هەڤپشک) Mutual Intelligibility و کۆنتاکتی زمان پێوەرێک بێت بۆ ناتێگەیشتنی هەڤپشک، ئەوا زۆر ئاستەنگە لە ڕووی کردەنی زمان لە دیالێکت بێتە جوداکردن. لە هەندێک شوێنی جیهان دەڤۆکە جیاجیاکانی "زمانێک" بە دیالێکت ناودەبرێت ئەگەرچی تێگەیشتنی هەڤپشک نییە، بەپێچەوانەوە لە هەندێک شوێنی تر تێگەیشتنی هەڤپشک هەیە بەڵام جیاوازی لە شێوەی زمانبەکارهێنان بە زمان ناودەبرێت. ئەم ئاستەنگییە دەکرێت بە نمونەیەکی سادە بێتە ڕوونکردنەوە.

ئەڵمانی و هۆڵاندی وا ناسراوە کە دوو زمانی جودا بن. هەرچۆنێک بێت، لە هەندێک شوێن بە درێژایی سنووری نێوان ئەڵمانیاو هۆڵاندە دیالێکتی قسەپێکراو هەیە کە زۆر نزیکن لە هەڤدی. ئەگەر ئێمە بێژین کە خەڵکانی لایەکی سنوورەکە بە ئەڵمانی و خەڵکانی لایەکەی تری سنوورەکە بە هۆڵاندی قسەدەکەن، ئەوا گۆتنەکەمان وابەستەی فاکتەری ڕامیاری و جڤاکییە تاکو لینگویستیکی. ئەم خاڵە ڕوونتر دەبێت کاتێک ئێمە ئەو ڕاستییە بزانین کە توانای قسەکەرانی هەردوو لای سنوورەکە بۆ تێگەیشتن لە هەڤدی گەلیک زیاترە لە ئەوەی کە ئەڵمانییەک لە ئەم سنوورە هەیەتی لەگەڵ قسەکەرانی هەندێک دیالێکتی تری ئەڵمانی لە ناو سنووری نەمساو سویسەرە. لە ئێرە دەکرێت چەمکی کۆنتینیۆم بۆ جوگرافی دیالێکتەکان a geographical dialect continuum بهێنرێتە بەکارهێنان[٢].

---

[2] Continuum واتە زنجیرەیەک ئایتمی لەیەکچوو بە شێوەیەک کە ئایتمی یەکەم لە دووەم دەچێت، دووەم لە سێیەم، تاکو ئەوەی کە دواهەمین ئایتم زۆر جیاواز دەبێت لە یەکەم.

به شێوەیەکی تر، بایەخی چەمکی لێتێگەیشتنی هەڤپشک کەمتر دەبێت لە چوارچێوەی بەکارهێنانی هەردوو چەمکی دیالێکت و زمان تاکو فاکتەرەکانی کەلتووری و ڕامیاری، نەخوازە لەناو هەردوو چەمکی گرنگی ئۆتۆنۆمی (سەربەخۆیی) autonomy (independence) و یەک جەمسەری (ناسەربەخۆ) heteronomy (dependence). ئێمە دەتوانین بێژین کە هۆلاندی و ئەڵمانی ئۆتۆنۆمن، چونکە هەردوو سەربەخۆن، دوو زمانی ستانداردی جودای دوو وڵاتن. لە لایەکی تر، دیالێکتێن ناستانداردی ئەڵمانیا، نەمساو سویسەرا یەک جەمسەرن بە ئاراستەی زمانی ستانداردی ئەڵمانی، سەرباری ئەو ڕاستییەی کە ئەم دیالێکتانە لەوانەیە زۆر لەیەک نەچن، هەروەها هەندێک لە ئەم دیالێکتانە لەوانەیە نزیکتر بێت لە دیالێکتەکانی زمانی هۆلاندی. ئەمە لەبەرئەوەی قسەکەرانی دیالێکتەکانی ئەڵمانی سەیری ئەڵمانی دەکەن وەکو زمانی ستانداردی خۆیان، لە خوێندن و نووسین، هەروەها لە گوهداری بۆ ڕادیۆ و تەلەفیزیۆنی ئەڵمانی. بەهەمانشێوە لە سنووری ئەولاتر، قسەکەرانی دیالێکتەکانی هۆلاندی ڕۆژنامە دەخوێننەوەو نامە دەنڤیسن بە هۆلاندی، هەرچی گۆڕانکاری بەرەو ستانداردبوون لە ئەم دیالێکتانە بێتە ئاراوە ئەوا بەرەو لای زمانی ستانداردی هۆلاندی دەچێت، نەک ئەڵمانی.

به کورتی، زمان لە دیالێکت دێتە جوداکردن لەبەرئەوەی زمان لە لایەن تێکڕای دانیشتوان دێتە بەکارهێنان، دیسان زمان ڕێنووسی ستانداردی هەیە، ڕێزمانی هەیەو بەکاردێت لە فێرگە، دامەزراوەکان، میدیا و هتد. لە هەمبەر ئەمە، دیالێکتەکان لە لایەن خەڵکێکی کەمتر و پانتاییەکی دیاریکراوی جوگرافی دێتە بەکارهێنان.

لە هەمووی گرنگتر، دیالێکت بەرهەمێکی سروشتی ناوچەیەکی دیاریکراوە، بەڵام زمان بەرهەمێکی دەستکردو پلان بۆ داڕێژراوە 'دەکرێت بگوترێت کۆکراوەی هەموو دیالێکتەکانە'و ئاراستەی هەموو ناوچەکانی وڵات دەکرێت و ئامانجی ڕامیاریی هەیە، بۆ نمونە زمانی X لە چوار دیالێکت پێکدێت (وێنەی ٢).




وێنەی ٢. زمانی X لە چوار دیالێکت پێکدێت A, B, C & D.

## ئێتنیک و نەتەوە Ethnic & Nation

لە زۆربەی داڕشتنەکان، کاتێک پاراستنی زمان دێتە باسکردن، کەمینە لە هەمبەر ئێتنیک دادەنرێ. هۆکارەکانی ئەم بەرامبەرکردنە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە کەمینە هۆی زیاتری هەیە بۆ نیشاندانی خەسڵەتەکانی ئێتنیکی.

پێناسەیەکی گشتی بۆ ئێتنیک بریتییە لە "هەستی هاوهامەنگی لەگەڵ گروپێک کە بنچینەکەی خەسڵەتی هاوبەشە، بۆ نمونە زمان، ئایین و ڕەگەز". خاڵی ناوەندی ئەم پێناسەیە بریتییە لە ئەو هەستە خودی و دەروونی جڤاکییە هەڤپشکە وەکو پێویستییەکی یەکلاکەرەوەی ئێتنیکی.

بۆ نیشاندانی کاراکتەرە بابەتییەکانی ئێتنیک. دەکرێت لە ئێرە ئاماژە بە چەند خاڵێکی گرنگ بدرێ:

١. سەرچاوەیەکی هاوبەش، بۆ نمونە ئایین، زمان هتد.

٢. ناوچەیەکی دیاریکراوی هاوبەش.

٣. کەلتوورێکی هاوبەش.

٤. بەتەنگەوەبوون، ئەمەک و شۆفینیزم.

٥. فۆرمی خێزان دروستکردن و بونیادی خێزانی.

٦. ژنهێنان لە چوارچێوەی گروپێک.

نەتـەوەو ئێتنیـک گـەلێک خـاڵ کۆیـان دەکاتـەوە بـەڵام دەکرێت بـە نـەتـەوە بگوترێت "ئێتنیکێکی هۆشیار"، "ڕێکخستنێکی هاوهامـەنگی فـرەکـەلتـوور" یـان "ئێتنیکێکی نارازی کە داوای جیابوونەوە دەکات". هەرچۆنێک بێت چەند خـاڵێکی هاوبەش هەیە بۆ پێناسەکردنی نەتەوە کە بریتییە لە:

١. هەستکردن بە یەکبوونی گروپێکی بەهێز.

٢. هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی مافی ڕێڤەبەری.

٣. بوونی هەرێمێک، یان هەوڵدان بۆ دروستکردنی لە ئەم جۆرە.

٤. هەڕەشەیەکی هەستپێکراو لە لایەن گروپێک یان چەند گروپێک.

٥. خاوەن پێشڕەوانێکی بەرزو خوێندەوارو بەهێزە.

خاڵێکی جیاوازی تر لە نێوان نەتەوەو ئێتنیک ئەوەیـە کـە نـەتـەوە نـەک هـەر داوای یەکسانی لەگەڵ نەتەوەکانی تـر دەکـات، بـەڵکو مـەرجـی خـۆ ژی بـەسـەر ئەوان دەسەپێنێت. لە ڕوانگەی مێـژووییـەوە سێ کوچکـەی نـەتـەوە پێکدێت لـە یەک خەڵک، یەک زمان و یەک وڵات.

## فەرمی، ئاخافتنی فەرمی و زمانی فەرمی

چونکە بە زمانی کوردی فەرهەنگێکی کوردی-کوردی دەوڵەمەندو جێی باوەڕ نییە، ئەوا من ناچارم سەرەتای باسەکەم بۆ پێناسەکردنی هەردوو وشەی فەرمی و ئاخافتن لە زمانی سویدی دەست پێبکەم و بە پشتبەستن بە کتێبی "زمان و فەرمی-یەتی" (Språk och offentlighet) ی نووسەر (Jan Svensson 1993:15) بە پێی چەند فەرهەنگێکی سویدی، جان سڤێنسۆن ئەم پێناسانەی خوارەوەی بۆ فەرمی-یەتی نووسیوە:

١. کراوەیە یان لە بەردەستی هەموو هاووڵاتیان دایە.

٢. پەیوەستە بە چالاکی دەوڵەتی یان شارەوانی/بازێڕڤانی و شارۆچکەکان.

یان

١. بە کراوەیی/ئاشکرایی ڕوودەدات بە جۆرێک هەموو تێدەگات.

٢. بە ئامادەبوونی گشت ڕوودەدات.

٣. بەندە بە دەوڵەت یان کۆمەڵگا.

یان

١. ئەو تشتەی کە لە لای گشت ئاشکرایە (یان لە بەر دەستە).

٢. (لێتێگەیشتراوە) لە لایەن زۆرینەی/پڕانی هاووڵاتیانی کۆمەڵگا.

وشەی ئاخافتن (بەراوردی *گەنگەشە، گفتوگۆ و دێیات* بکە) بە ئەم شێوە پێناسە دەکرێت: **ئاڵوگۆڕی زانیاری یان بۆچوون بەهۆی دەم.**

پێناسەیەکی بەربڵاوتر لە فەرهەنگێکی تر وا دەبێژێت: ئاخافتن دەکرێت کەم تا زۆر لە گفتوگۆی/گەنگەشەی فەرمی بێتە بەکارهێنان بە جۆرێک کە نوێنەرانی جۆرەها ئاراستەی واتادار ڕوانگەی خۆیان دەربارەی بابەتێک دەخەنە بەر چاڤ.

هەرچەندە دوو پێناسەکەی وشەی *ئاخافتن* پتر وەکو ئاڵوگۆڕپێکردنی زانیاری دەمی دێتە تێگەیشتن، بەڵام مەبەست ئەو گفتوگۆ/گەنگەشە/دێباتەیە کە لە چاپەمەنی و بلاڤۆک بە شێوەی نووسین، دێتە بەرهەمهێنان.

دواتر جان سڤێنسۆن واتایەک بۆ فەرمی، فەرمییەتی یان فەرمیبوون پێشکەش دەکات کە لە فەرهەنگەکانیش نییە، بە پێی باوەڕی ئەو فەرمییەتی؛ **سەکۆیەکە بۆ گفتوگۆکردن سەبارەت بە ئەو بابەتانەی کە لە کۆمەڵگا پڕبایەخن.** دیسان سڤێنسۆن ئاخافتنی فەرمی-ش بە ئەو زمانی بەکارهێنراوە دەزانێت کە لە ناو ئەم فەرمی-یەتییە دێتە بەکارهێنان.

بە پشتبەستن بە تیۆرییەکانی یۆرگن هابەرماس (فەیلەسوفێکی ئەڵمانییە) ئەوا جان سڤێنسۆن چەند خاڵێکی دەستپێکی دەربارەی بوونیادی فەرمی-بوون لە وڵاتی سوید لە پاش شەڕی جیهانی دووەم دەخاتە ڕوو. من ئەم خاڵانەم وەرگێڕاوە بۆ زمانی کوردی، چونکە یارمەتیدەرە بۆ تێگەیشتنی ئەم وشەیە.

دەستپێکێکی بنەڕەتی دەربارەی واتای وشەکە دەکرێت بە ئەم جۆرە بێت:

١. ئەو فەرمی-بوونە نەریەتییە ڕامیارییە، کە سەکۆ نیارەکەی پەرلەمانە، بەڵام کە هەروەها دەکرێت بواری لە چاپەمەنی، بلاڤۆک و مێدیاکانی تر هەبێت.

٢. ئەو کەلتوورە فەرمییە، کە سەکۆ نیارەکەی لاپەڕەی کەلتووری و نووسراوەی کەلتوورییە، هەروەها ئەو بەرنامانەی کە هەمان ناوەرۆکیان لە ئامێرەکانی ئەلکترۆنی هەیە.

دەستپێکێکی دی دەکرێت دەربارەی فۆڕمی ڕێکخستن بێت:

٣. ئەو فەرمی-بوونە دەوڵەتی و شار و شارۆچکەییە، کە بەر لە هەر تشتێک لە زانیاری دام و دەزگاکان، خۆیان نیشان دەدەن.

٤. ئەو فەرمیـ-بوونە ڕامیارییە لابەلایە، کە خۆی لە گفتوگۆکانی ناوخۆی پارتێین ڕامیاری نیشان دەدات. ئەمانە زیاتر لە کۆنگرێسی پارتەکان دێنە بەر چاو. تەنانەت بزاڤی کرێکاری دەتوانێت بەشێکی ئەم فەرمیـ-بوونی لابەلایە بهێنێتە پێکهێنان.

٥. ئەڵتەرناتیڤی/بژارەی بزاڤی لابەلایی تر. جۆرەها بزاڤی کۆمەڵگای مەدەنی تر وەکو بزاڤی ژینگەپارێزی، ئاشتیـ-پارێزی یان ڕێکخراوی مەدەنیی تر.

مرۆڤ دەتوانێت بێژێت کە لەبەردەستبوون یان دەستڕاگەیشتن بەسەر (یان ڕادەی دەستبەسەرڕاگەیشتن) وەکو دەستپێکێکی دی بخەملێنێت:

٦. مێدیا-ی فرە، کە سەکۆیەکی فەرمی پێک دەهێنێت. هەموو تشتێک کە لە مێدیاکان جێگایان دەبێتەوە دەکرێ بگوترێ دەکەفێتە چوارچێوەی فەرمیـ-بوونەوە.

بە پشتبەستن بە ئەو ڕوونکردنەوانەی سەرەوە دەکرێت بگوترێت کە "زمانی فەرمی ئەو زمانەیە کە لە لایەن زمانبەکارهێنەرانێک، لە سەر سەکۆیەک، دێتە بەکارهێنان کە لە ئەوێدا ئاڵوگۆڕی زانیاری و خستنەڕووی بۆچوونی جوداجودا دەربارەی بابەتێک دەخرێتە بەرچاو، یان دێتە گوهداریکردن کە جێگای بایەخی گشتە. هەر بۆیە ژی دەبێت زمانی بەکارهێنراو لێتێگەیشتراو بێت لە لایەن گشتەوە". ئەم زمانبەکارهێنانە جیاوازە لە ئەو زمانبەکارهێنانەی کە لە بواری تایبەت بۆ نمونە لە چوارچێوەی خێزان، خزم، دراوسێ و دۆستان دەکرێت کە دەربارەی بابەت یان تشتی سنووردارکراون، لە ناوچەیەکی سنووردارکراو و بۆ کەسانێکی سنووردارکراو.

زۆرجار چەمکی زمانی فەرمی لەگەڵ زمانی نەتەوەیی دێتە تێکەڵکردن. ڕوونکردنەوەیەکی ئاشکرا بۆ جوداکردنەوەی ئەم دوو چەمکە لە یەکتر ئەوەیە کە:

وڵاتەکان زمانی فەرمی-یان هەیە، نەتەوەکان، کە مەرج نییە وڵاتیان هەبێت، زمانی نەتەوەییان هەیە. جگە لە ئەمەش چەمکێکی تریش دێتە بەرچاو: زمانی ستاندارد. جێگای خۆیەتی بگوترێت کە زمانی ستاندارد دەخوڵقێنرێ و گەشەی پێدەکرێ لە ڕێگەی پلانی زمانەوانی و خزمەتکردنی زمانەوانی. نۆرمەکانی زمانی ستاندارد لە گەردانکردنی وشە، سینتاکس، گەنجینەی وشە، حینجەکردن و هتد بە هۆی کتێبی ڕێزمان و فەرهەنگی وشە دێتە دامەزراندن و بڵاوکردن. بە واتایەکی تر زمانی ستاندارد بەرهەمێکی هونەرییە کە لە هەل و مەرجێکی جڤاکی و ڕامیاری دیاریکراو دێتە بەدیهێنان بە مەبەستی گەیشتن بە ویستی خوازراو. جگە لە قازانجی زۆری زمانی ستاندارد، ئەوا ئەم زمانە ئەرکێکی گەلێک گرنگی هەیە، ئەویش زمانی هەڤپشکە کە لە لایەن تێکرای گروپێک دێتە بەکارهێنان و لێتێگەیشتن (Kenneth Hyltenstam & Christopher Stroud 1991:43-44).

زمانی ستاندارد دوای چەند هەنگاوی/پێنگاڤی یەک لە دوای یەک دێتە بەرقەراربوون. Haugen هاوگن پێشنیاری چوار توخمی سەرەکی بۆ بەدیهێنانی زمانی ستاندارد دەکات (Kenneth Hyltenstam & Christopher Stroud 1991:44):

١. هەڵبژاردن SELECTION.

٢. کۆددانان CODIFICATION.

٣. ئەرکەکانی تاقیگەیی THE FUNCTION OF LABORING.

٤. ڕازیبوون ACCEPTING.

لە توخمی هەڵبژاردن دیالێکتێک یان زیاتر دێتە هەڵبژاردن بۆ ئەوەی ببێت بە بنچینەی زمانی ستاندارد. ئەم هەڵبژاردنە پشت بە هەڵوێستی ڕامیاری دەبەستێت و زۆر جار دوورە لە هەڵسەنگاندنی زمانەوانی.

کۆددانان —ستانداردکردن- واتە چۆنیەتی قاڵب وەرگرتنی فۆرمی نووسین لە زمانی ستاندارد (یاساکانی دەنگ/ تیپەکان و بەلکاندنیان، وشەسازی و ڕستەسازی). دوای ماوەیەک لە بەکارهێنانی ئەم ڕێنماییانە دەکرێت زمانی ستاندارد ببێت بە نۆرمێکی ئاسایی نووسین و قسەکردن (لە دۆخی فەرمی).

مەبەست لە ئەرکەکانی تاقیگەیی پەیوەندی زمانی ستانداردە بە بواری جێبەجێکردن، کە بۆ یەکەمجار لە دەزگاکانی فەرمی وەکو فێرگە، خوێندنگاکان، پەرلەمان، دام و دەزگا، ڕێڤەبەرییەکان و مێدیا جێبەجی دەکرێ. بۆئەوەی زمانی ستاندارد لەگەڵ داواکاریی هەموو بوارەکان بگونجێت دەبێت وشەو دەستەواژەو گرێی نوێ دروستبکرێ و گەشەی پێبدرێ و بەرجەستەش بکرێ، بۆ نمونە فەرهەنگ لە ئەم جۆرە فەراهەم بکرێت، هەر یەک بە گوێرەی بواری دیاریکراو (ئابووری، پزیشکی هتد.) وەکو یەکەمین هەنگاو.

ڕازیبوون: بەهای زمانی ستاندارد پشت بە ئەوە دەبەستێت کە تاکو چەند قسەکەران/نووسەران پێی ڕازین یان ڕازی دەکرێن. توانای قسەکەران/نووسەران لە بەکارهێنانی زمانی ستاندارد بەندە بە دابینکردنی پێویستییەکانی فێربوون و خوێندنەوە. هەڵبەت مسۆگەرکردنی چەند ساڵێکی خوێندن بەردی بناغەی ئەم پرۆسەیە دەبێت، هەروەها ناکرێ ڕۆڵی مێدیا، ڕیکلام، چالاکیی هونەری، گەیاندن و بازرگانییەکان فەرامۆش بکرێن. دیسان دەبێت دەزگاکانی پەیوەندیدار وەکو ئەکادیمیی زمان، بەشەکانی زمان لە زانکۆکان هەردەم بە مەبەستی سەرخستنی ئەم پرۆسەیە چاودێری، ڤەکۆلین و توێژینەوە بکەن.

# بەشی دووەم

## زمانی قسەو زمانی نووسین

**سەرەتا**

ئاساییانە جیاوازی لە نێوان نووسین و قسە بۆ هەر زمانێک هەیە، بە جۆرێک کە شێوەکانی جودا جودای قسە لەگەڵ یەکترو ئەو زمانی هاوبەشەی نووسین جیاواز بێت. هەڵبەت هۆکاری زۆر لە پشت ئەم جیاوازییانە هەیە، لە ئەوانە؛ مرۆڤ ئاساییانە بەپێی دەڤۆک یان دیالێکتەکەی قسەدەکات (لەگەڵ هەموو ئەو جیاوازییانەی کە لە بێژان، گەردانکردن، هەڵبژاردنی وشە و ڕێزمان هەیە)، بەڵام هەمیشە مرۆڤ وا ڕاهاتووە کە بە ئەو جۆرە بنووسێت کە نزیکە لە زمانی ستاندارد یان بە ئاراستەی ئەو شێوازە بنووسێت کە دادەنرێ وەکو زمانی هاوبەش. شێوازی زمانی نووسین تاڕادەیەک پارێزەرە، واتە ئاسان نییە گۆڕینی. زمانی نووسین تاکو ڕادەیەکی زۆر هەمان شێوازی کۆنی هەیە، بەڵام زمانی قسە هەمیشە لە ئاڵوگۆڕدایە. دیسان زمانی قسەو نووسین دەبێت بەپێی تاڕادەیەک ئاراستەی جیاواز گەشە بکەن، چونکە دۆخی پەیوەندیکردن لە نێوان گفتوگۆ و تێکستی نووسراو تەواو جودان و هەردوو مەرجی جیاوازییان هەیە. هەروەها بوارەکانی کارپێکردنی زمانی نووسین و قسە جیاوازە، هەر بۆیە ئەرکی ئەوان جیاوازە.

بە گشتی کاتێک مرۆڤ سەیری زمان دەکات، ئەوا سەیری زمانی نووسین دەکات. لینگویستەکان تاکو ڕادەیەکی زۆر لێکۆڵینەوەیان لەسەر ڕستەو تێکستی

نووسراو کردووه بەڵام لە ئەم چەند ساڵانەی دوایی خوێندن و توێژینەوە لەسەر زمانی قسەو هەروەها چۆنییەتی بەکارهێنانی زمانی قسە لە پەیوەندیکردن دەستپێکربوە. لە ڕاستیدا مرۆڤ لە مێژە باوەڕی وابووە کە زمانی قسە تاکو ڕادەیەکی زۆر سەرەکییە. گشت زمانەکانی جیهان لە شێوەی قسە هەیە، هەمانکات ژمارەیەکی زۆر لە زمان و دیالێکتەکانی جیهان تاکو ئێستا خودانی وێژەی نووسراو و سیستەمی نووسین نین.

کاتێک زمانی نووسین هەبێت، ئەوا ئەم زمانە بە بەراورد لەگەڵ زمانی قسە وەکو پلە دوو، دێتە خەملاندن. زمانی قسە دەچێتە ئەو چوارچێوەیەی کە هەموو منداڵان لە باری ئاسایی فێری دەبن، وەکو بەشێک لە ئەو ئەرکانەی کە دەکەفێتە نێو کۆمەڵایەتیبوونیان لە ژیانی ڕۆژانە. لە دەمێکدا کە زمانی نووسین ژمارەیەکی کەمتر مرۆڤ فێری دەبێت ئەوا ئەم فێربوونەش لە ڕێگەی ڕاستەوخۆی پرۆسەی خوێندنەوە دەبێت، هەروەها وەکو پرۆسەیەکی پلە دوو دێتە ئەژماردن. لە ڕاستیدا بڕێکی زۆر لە ئەندامەکانی کۆمەڵگاکانی سەر ئەم زەمینە توانای خوێندن و نووسینیان کەمە. لە کوردستانی لکێندراو بە عێراق، دەکرێ بگوترێت ئاستی خوێندەواری لە پلەیەکی باشدایە بەڵام خووی خوێندن و نووسینی ئەم خوێندەوارانە لە ئاستێکی نزمدایە. بۆ نمونە ژمارەیەکی باش لە هەڵگری بڕوانامەی زانکۆ و پەیمانگاکان توانای داڕشتنی نووسینێکیان نییە.

بە شێوەیەکی نەریتی زۆربەی کۆمەڵگاکان بە ڕێزەوە سەیری زمانی نووسینیان کردووەو بە بەراورد لەگەڵ زمانی قسە پێگەیەکی زۆر بەرزتریان بۆ داناوە. بە گشتی زمانی نووسین وەکو زمانێکی ڕاست، دروست، بەپێزو ڕەسەن ئەژمارد کراوە، بەڵام دیالێکتەکان وەکو تشتێکی سادە، بێفەڕ، نادروست و ناڕاست کە پێداویستی زمان بەکارهێنەران وەڵامناداتەوە، سەیرکراوە. ئێستا

توانای فێربوونی زمانی نووسین بۆ زۆرێک لە هاووڵاتیان فەراهەمکراوە، بەڵام پێشتر تەنها ژمارەیەکی کەم لە هاووڵاتیان توانای خوێندیان هەبوو و دەیانتوانی بخوێنن. هەربۆیە ئەم ژمارە کەمە کە توانای خوێندن و نووسینیان هەبووە بە ڕێز و شکۆ لە لایەن خەڵک سەیر کراوە. لە ڕاستیدا ئەم ژمارە کەمەی نووسەران زانیارییەکی زۆریان بۆ نەوەکانی داهاتوو بەجێ هێشتووە کە لە توانای زمانی قسە نەبووە بیکات.

جیاوازییەکانی نێوان زمانی قسەو نووسین ناکرێ فەرامۆش بکرێت، چ لە ڕوانگەی تاکەکەس، یان کۆمەڵ. لە ڕوانگەی تاکەکەس، مرۆڤ لەگەڵ زمانی نووسین شارەزاییەک پەیدادەکات کە تەواو لەگەڵ کەلتووری قسە جیاوازە. لە ڕاستیدا پرۆسەی فێربوونی خوێندن و نووسین لە خوێندنگاکان تەنها زانیاری و زانین نابەخشێت بە خوێندکار، بەڵکو لانی کەم توانای تێگەیشتنی پتر دەکات و پەیوەندی لەگەڵ ڕابردووی دوورو نزیکی نەتەوەو مرۆڤایەتی گرێدەدات. لە ڕوانگەی کۆمەڵ زمانی نووسین بە ئەرکی تۆمارکردنی ڕاستی، ڕووداو، بەسەرهاتەکانی نەتەوەیەک هەڵدەستێت و چۆنیەتی ژیانی نەوەی کۆن لەگەڵ ئێستاو داهاتوو گرێدەدات و دەپارێزێت. بەڵێ زمانی نووسین بۆ پاراستنی زانیاری بەکاردەهێنرێ، بۆ نموونە زانیاریی مێژوویی، زانستی، بازرگانی، دارایی، یاسایی، زمانەوانی هتد.

کە زمانی قسەو نووسین لە یەکتر جیاوازە لەبەر ئەوەیە کە مەرجەکانی بەکارهێنانی نووسین و قسە جیاوازە، ئەمیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بارودۆخی پەیوەندیکردن لە ساتی بەکارهێنانی قسەو نووسین جیاوازە. ئێمە لە ئێرە تیشک دەخەینە سەر سێ خاڵی گرنگ بۆ ئەم دوو جۆری بەکارهێنانی زمانە.

یەکەم: مەرجەکانی زمانی قسە:

١. میدیۆمی ئەکویستی؛

قسە میدیۆمێکی ئەکویستیی هەیە، واتە قسە بریتییە لە شەپۆلێک هەوا کە لە دەمی قسەکەر دەردەچێت، لە ڕێگەی ئەو بۆشاییەی، کە بریتییە لە هەوا، کە لە نێوان قسەکەر و بیسەردا هەیە، و بەر گوێچکەکانی بیسەر دەکەفێت. ئەمیش واتای ئەوە دەگەیەنێت کە نە قسەکەر دەتوانێت یەکەکانی دەنگی وشەو ڕستەکان لێک جودا بکاتەوە نە بیسەریش توانای ئەم کارەی هەیە. لە ڕاستیدا دەنگەکانی وشەو ڕستە لە ساتی قسەکردندا لە یەکتر جودا ناکرێنەوە. بەلام تێگەیشتن لە نێوان هەردوو لا (قسەکەر و بیسەر) دروست دەبێت. ئامارژەکانی قسە خێرا پەیدادەبێت و خێراش نامێنێت. تێگەیشتن لە قسە داواکاریی زۆر لەسەر توانای یادی کورتخایەن Short-term memory و توانای دیکۆدکردنی (شرۆڤەکردنی) بیسەر بۆ ئامارژەکانی قسەی هاتوو دادەنێت. سەرەڕای ئەوەی کە ئامارژەکانی قسە ئاستێکی بەرزی ڕێدوندانس نیشان دەدەن کە ئەمیش ڕۆڵی گرنگ دەبینێت بۆ دیکۆدکردن و تێگەیشتنی پەیامی قسە، بەلام هەڵەگوتن و هەڵەبیستن هەر ڕوودەدات (بڕوانە وێنەی ٤)[٣].

٢. ماوەی کورتی پلاندانان

کاتێک مرۆڤ لەپڕ قسەدەکات (کە پێشدەم پلانی بۆ دانەنابێت، ئەو تشتەی کە دەیڵێت لەبەری نەکردبێت یان نەینووسیبێت بۆ ئەوەی بیخوێنێتەوە)، ئەوا

---

[3] ڕێدوندانس بە واتەی زۆریی زانیاری دێت، نەک بە ئەو واتایەی کە ئێمە پێویستمان بە زانینی نییە، بەڵکو بە واتای زۆریی ئامارژەی هاتوو بۆ ئەو تشتەی کە دەمانەوێت بیزانین. بڕوانە لارس مێلین (٢٠١٠:١٤). وەرگێڕانی غازی عەلی خورشید. سەبارەت بە دیکۆدکردن بڕوانە غازی عەلی خورشید فۆنەتیک و فۆنۆلۆجی (٢٠١١).

دەبێت بیرکردنەوەکانی مێشکی لە ماوەیەکی زۆر کورت بە وشە دابڕێژێت. ئەمیش ئەوە دەگەیەنێت ئەو دەربڕینەی کە دەخوازرێ بێتە گوتن، دەبێت لە ماوەیەکی زۆر کورت، ئەنجام بدرێ. گرێ و ڕستەی قسەی لەپڕ، کەمتازۆر بێسەروبەرە، کورتەو لە ڕووی ڕێزمان، نادروستە. لە زمانی قسە، وشە لەیەکتر سەندن، بڕینی قسەی یەکتری هتد. ئاساییە. لە گفتوگۆی ئاسایی ڕۆژانە ئەم دۆخەی قسەکردن نۆرماڵەو تێگەیشتن قورس ناکات. هەرچۆنێک بێت ئەمە بە بەراورد لەگەڵ زمانی نووسین واتای هەڵە دەبەخشێت.

### ٣. پابەندی بە دۆخی هەنووکەیی

پەیوەندی قسەکردن لە دۆخێکدا دروست دەبێت کە هەردوو قسەکەر و بیسەر لە شوێنێکی دیاریکراو ئامادەن، (ئەگەر باس لە گفتوگۆی تەلەفۆن، ڕادیۆ هتد. نەکرێ). هەر لەبەرئەمە پەیوەندییەکە بەندە بە دۆخی هەنووکەیی دەربڕینەکان، کە ئەمەش لە زمانی نووسین نییە. هەردوو قسەکەر و بیسەر چاوەڕوانییەکی زۆری هاوبەشیان لە یەکتر هەیە، هەردوولا کەمتازۆر ناسیاوی و زانیارییان دەربارەی یەکتر هەیە. قسەکەر و بیسەر یەکتر دەبینن، هەر بۆیە پرۆسەی تێگەیشتن هۆکاری یارمەتیدەری تری، لە شێوەی جوڵانەوەی دەست و دەربڕینەکانی لەش و ڕوو و دەم و چاو، دەبێت. ئەو پەیوەندییەی کە لە نێوان قسەکەر و بیسەر هەیە گرنگە، چونکە دەربڕینی هەست و بۆچوون و ئاماژەی واتاهەڵگری تری بێدەنگی، کە بە قسە دەرنابڕرێ، دەبێت بە بەشێکی زۆر گرنگ لە پرۆسەی پەیوەندیکردنی زمانی قسە، هەروەها تێگەیشتن.

## دووهەم: مەرجەکانی زمانی نووسین:

### ١. میدیۆمی بینراو؛

نووسین میدیۆمێکی بینراوی هەیە، نووسین لە هێماکانی نووسین پێکدێت بە جۆرێک مرۆڤ دەتوانێت لە ڕێگای هەستی دیتن/ تەماشاکردن تۆماریان بکات. مرۆڤ تیپەکانی وشەیەک، وشەکانی ڕستەیەک و ڕستەکانی تێکستێک دەبینێت. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئاماژەکانی نووسین هەمیشەییەو وەکو دەرئەنجامێک بۆ ئەمەش، خوێنەر دەتوانێت دارشتنی گەلێک ئاڵۆز دیکۆد (شرۆڤە) بکات و لێی تێبگات.

### ٢. ماوەی درێژی پلاندانان

ئاساییانە مرۆڤ کاتێکی زۆری هەیە بۆ داڕشتنی نووسینی پەیامێک. ئەمەش دەبێت بەهۆی کەمکردنی کەموکورتی دەربڕین، وەکو هەڵە، دووبارەکردنەوەی زۆر، نالۆجیکی هتد. تەنانەت خوێنەریش دەتوانێت کاتێکی زیاتر تەرخانبکات بۆ خوێندنەوەی پەیامێکی نووسراو.

### ٣. ناپابەندی بە دۆخی هەنووکەیی

مەبەست لە نووسین خوێندنەوەیە، هەڵبەت نووسین زۆرجار دێتە خوێندن، بەڵام دۆخی نووسین و خوێندنەوە وەکو یەک نییە. ئاساییانە نووسەر نازانێت لە کام دۆخ و کێ نووسینەکەی دەخوێنێتەوە. زۆربەی جاران نووسین ئاراستەی خوێنەرانێکی زۆر دەکرێ، هەمانکات چاوەڕوانییەکانی نووسەر لە خوێندەواران جیاواز دەبێت. بۆیە داڕشتنەکانی نووسین ڕاستن، دروستن، ڕوون و ئاشکران.

# بەشی سێیەم

## لە دەنگ تاکو وشە

### سەرەتا

لە ڕوانگەی لینگویستک هەر زمانێکی سروشتی لە ژمارەیەک یەکە پێکدێت. ئەم یەکانەش بەپێی ڕێسا پێکەوە دێنە لکاندن بۆ ئەوەی دواتر بەپێی ڕەوشی گفتوگۆکردن یان نووسین دەربڕین ببەخشن. بڕوانە وێنەی خوارەوە کە وێنەیەکی زۆر سەرەتایی دەربارەی زمان و ڕێزمان نیشان دەدات.




وێنەی ٣. پێکهاتەی زمان (Lars-Gunnar Andersson 1999:15).

وەک لە وێنەی سەرەوە دیارە بەشەکانی زمان یان پێکهاتەی زمان لە سەرەتادا لە دەنگەکان (٣٧ دەنگ لە زمانی کوردی هەیە) پێکدێت بۆ ئەوەی دواتر مۆرفیم/وشە، گرێ، ڕستە و تێکست دروست بکەن. دەنگەکانی زمان بە هەڕەمەکی ناهێنە لکاندن لەگەڵ یەکدی، بەڵکو بەپێی ڕێزمان، بۆ ئەوەی دواتر جۆرەها وشە بێنە دروستکردن و بە جۆرەها شێوەش گەردان بکرێن بە گوێرەی پێویستی زمان- بەکارهێنەر. دواتر ئەم وشانە بەپێی ڕێزمان ڕستە دروست دەکەن بۆئەوەی ئەمانیش دواتر تێکست یان دەقی دوور و درێژی پێ دروست بکرێت.

بە مەبەستی سنووردارکردنی بابەتەکە ئەوا من لە بەشەکانی زمان تەنها باس لە فۆنێم، مۆرفیم و وشە دەکەم. لە بەشی ڕێزمان من تەنها باس لە فۆنۆلۆجی و مۆرفۆلۆجی دەکەم. هەرچۆنێک بێت من بە کورتی دەربارەی ڕێزمان قسە دەکەم.

## ڕێزمان چییە؟ What is grammar?

پێناسەیەکی سادە بۆ ڕێزمان دەکرێت "مەرجی لکاندنی دەنگەکان بۆ وشەو وشەکان بۆ دروستکردنی ڕستە" بێت. بەپێی مەرجەکانی زمانی کوردی، دیالێکتی کرمانجی خواروو، دەنگەکانی [ئ]، [ا] و [و] بە لەدوای-یەک وشەی [ئاو] پێک دەهێنن. بەپێی مەرجەکانی زمانی کوردی دیالێکتی کرمانجی ژووروو دەنگەکانی [ئ]، [ا] و [ڤ] لە دوای یەکتر، وشەی [ئاڤ] پێکدەهێنن، کە هەمان واتای [ئاو]ی هەیە. هەڵبەت ناکرێت ئەم سێ دەنگە هەڕەمەکیانە پێکەوە بێنە لکاندن چونکە ئەگەری هەیە کە هیچ واتایەک نەبەخشن بۆ نموونە [ڤئا] یان [وئا]، هەروەها [ڤائ] یان [وائ]. بە هەمانشێوە بۆ دروستکردنی ڕستە ناکرێت وشەکان هەڕەمەکیانە بە دوای یەکتر بێن چونکە ئەگەری واتا بەخشینیان نابێت. بۆ نموونە *ئازاد ئاو دەخوات* ڕستەیەکی دروستە، بەڵام ئاو ئازاد دەخوات یان

دەخوات ئاو ئازاد ڕستەیەکی نادروستە. لە ئێرە هەمان ڕستە بە کرمانجی ژووروو بە ئەم شێوەیە دەبێت ئازاد ئاڤێ دخۆت بەڵام نەک ئاڤێ ئازاد دخۆت یان دەخۆت ئاڤێ ئازاد.

وشەی [ئاو] و [ئاڤ] و ڕستەی "ئازاد ئاو دەخوات" و "ئازاد ئاڤێ دەخۆت" لە لایەن زمان بەکارهێنەرانی کرمانجی خواروو و کرمانجی ژووروو کە هەمان واتاو مەبەستی دەربڕینیان هەیە بەکاردەهێنرێت. لە ڕوانگەی ڕێزمان باسکردنی ئەم جۆری لکاندنی دەنگانە بۆ وشە و وشەکان بۆ ڕستە پێی دەگوترێت ***ڕێزمانی باسکراو*** **Descriptive grammar**. واتە باسکردنی زمان بە ئەو شێوەی کە هەیە نەک بە ئەو شێوەی کە دەبێت ببێت (یان دەبوایە هەبوایە). ڕێزمان بە ئەو شێوەیەی کە دەبێت ببێت پێی دەگوترێت ***ڕێزمانی خوازراو/ویستراو*** **Normative grammar**. هەڵبەت ئەو ڕێزمانە باسکراوەی کرمانجی خواروو تاکو ڕادەیەکی زۆر ڕەنگدانەوەی زمانی قسەی دانیشتوانی شاری سلێمانییە. هەروەها ئەو ڕێزمانە باسکراوەی کرمانجی ژووروو ڕەنگدانەوەی زمانی قسەی بەکارهێنراوی شاری دهۆکە! هەرچەندە لە کوردستانی لکێندراو بە عێراق کۆڕی زانیاری کورد (کە ئێستا بووە بە ئەکادیمیای کوردی) و بەشی زمانی کوردی لە زانکۆکان هەیە بەڵام هێشتا بەرهەمە چاپکراوەکانی بابەتی ڕێزمان ڕەنگدانەوەی ڕێزمانی باسکراوە نەک ڕێزمانی خوازراو یان ویستراو. ڕێزمانی خوازراو، واتە ئەو ڕێزمانەی کە دەبێت ببێت، دەبێت دەزگای زمانەوانی فەرمی و ڕێپێدراو لە ڕوانگەکانی گەشەسەندنی مێژوویی ڕێزمان و چۆنیەتی پراکتیزەکردنی ئەم ڕێزمانی خواستراوە ڕێنمایی بدات. ئەمە بێجگە لە ڕوانگەکانی تر وەکو دیالێکتۆلۆجی، کۆمەڵایەتی، ئیتمۆلۆجی، سایکۆلۆجی و دابینکردنی پێویستییەکانی کردەنی ئەم ڕێزمانی خواستراوە و هی تر.

## یەکەم: پێکهاتەی دەنگی قسە

### ١. ڕوانگەی فۆنەتیک و فۆنۆلۆجی

مرۆڤ دەتوانێت پێکهاتەی دەنگی قسە، واتە بیژانکردنی گوتنەکان، لە ڕوانگەی جیاوازەوە بخوێنێت. لە ئێرە باس لە دوو ڕوانگەی جیاواز دەکرێت، بەڵام زۆر نزیک لە یەک؛ فۆنەتیک و فۆنۆلۆجی.

فۆنەتیک بە واتای زانیاری دەربارەی دەنگەکانی زمانی قسەکردن دێت (لە وشەی phoné ی یۆنانی هاتووە کە واتای دەنگ دەگەیەنێت). بابەتی فۆنەتیک دابەش دەکرێت بە سەر: قسەی بەرهەم هاتوو، ئەکویستیک و قسەی وەرگیراو/بیستراو، واتە پەیوەندیکردن لە ڕێگەی زمانی قسەکردن بە لایەنی کەم دوو کەس دەخوازێت: قسەکەر و بیسەر (بڕوانە وێنەی ٤). ئەو تشتەی کە قسەکەر بیری لێدەکات و دەخوازێت دەری ببڕێت دەکرێ بە وشە و لە ڕێگەی ئەندامی ئاخافتن دەکرێ بە دەنگ و دواتر لە ڕێگەی هەوا، بە شێوەی شەپۆلە دەنگ، بەر ئەندامی بیستنی وەرگر دەکەفێت. ئەوەی بیسەر لێی تێدەگات ئەوەیە کە مێشکی شرۆڤەی کردووەو چاوەڕوان دەکرێ ڕەنگدانەوەی ئەو بیرۆکەیە بێت کە قسەکەر خوازیاری گەیاندنی بووبێت.

وێنەی خوارەوە پرۆسەی ڕەوانەکردنی زانیاری لە لایەن قسەکەر/نێنەر بۆ لایەنی بیسەر/وەرگر، لە ڕێگەی پانتاییەکی ئەکویستی (هەوا) acoustic medium، ڕوون دەکاتەوە. سەرنج بدە کە قسەی دەرچووی دەمی قسەکەر، لە شێوەی شەپۆلە هەوا، بەر گوێی قسەکەریش دەکەفێت؛ ئەمیش پێی دەگوترێت لینکی فیدباک.




وێنه‌ی ٤. قسه‌كه‌ر و بیسه‌ر. ئه‌و په‌یامه‌ی كه‌ له‌ لایه‌ن مێشكی قسه‌كه‌ر ده‌رده‌چێت و له‌ لایه‌ن مێشكی بیسه‌ر وه‌رده‌گیرێ (غازی عه‌لی خورشید ٢٠١١:).

به‌ شێوه‌یه‌كی سه‌ره‌كی پرۆسه‌ی به‌رهه‌مهێنانی ده‌نگ له‌ رێگه‌ی هه‌ناسه‌ ده‌ردان دروستده‌بێت. ئه‌ویش به‌هۆی جوڵاندنی ماسولكه‌كانی ناوپه‌نچك و قه‌فه‌سی سنگ بۆئه‌وه‌ی دواتر سییه‌كان به‌رز و نزم ببن و هه‌وا له‌ رێگه‌ی بۆری هه‌وا، قورقوراگه‌، قورگ، بۆشایی ده‌م و لوت به‌ شێوه‌ی شه‌پۆل بێته‌ ده‌ره‌وه‌. له‌ راستیدا قورقوراگه‌ به‌ یه‌كه‌مین وێستگه‌ یان زاڵگه‌ داده‌نرێت بۆ رێگرتنی ئه‌و شه‌پۆلی هه‌وایه‌ كه‌ له‌ سییه‌كان دێت، هه‌ر له‌ ئێره‌ش ده‌نگه‌كانی زمانی مرۆڤ بۆ یه‌كه‌مینجار دروست ده‌بێت. دواتر ئه‌ندامی ئاخافتن، كه‌ له‌ بۆشایی قورگ، بۆشایی ده‌م و لووت پێك دێت، كۆنترۆڵی ئه‌و شه‌پۆلی هه‌وایه‌ ده‌كات و به‌ ئه‌و شێوه‌یه‌ی كه‌ مرۆڤ ده‌خوازێت هه‌واكه‌ له‌ ده‌م یان لووت دێته‌ ده‌ره‌وه‌، واته‌ ده‌نگه‌كانی تر دروست ده‌كات. هه‌ڵبه‌ته‌ جوڵاندنی لێوه‌كان و زار له‌ ده‌م رۆڵی سه‌ره‌كی ده‌بینن له‌ چۆنیه‌تی به‌رهه‌مهێنانی ئه‌و ده‌نگانه‌ی یان قسانه‌ی كه‌ مرۆڤ به‌رهه‌می ده‌هێنێت. بێژانی ده‌نگێك، وشه‌یه‌ك یان رسته‌یه‌ك له‌ مرۆڤێك بۆ یه‌كێكی تر، له‌ دۆخێك بۆ یه‌كێكی تر ده‌گۆرێت (بگۆڕ). گۆكردن یان

ئارتیکولەکردن هەمیشە بەردەوامە؛ قسەکەر دەبێت بەرەبەرە شێوەی ئەندامی ئاخافتنی بگۆڕێت کاتێک ئەو بیەوێت لە دەنگێک (بەپێی تێگەیشتنی ئێمە بۆ دەنگ) بۆ یەکێکی تر هەنگاو بنێت. قسە لە هەندێک وێستگەی جودا جودای لە پاش یەکتر هاتووی ئارتیکولەکردن پێک نایەت، بە جۆرێک لە هەر وێستگەیەک یەک جۆر دەنگ بێتە بەرهەمهێنان. بەڵکو دەنگەکانی وشەیەک و تەنانەت وشەکانی ڕستەیەک لە ساتی قسەکردنی ئاسایی لە یەکتر ناهێنە جوداکردن. بە کورتی شەپۆلەکانی هەوا، یان شەپۆلەکانی دەنگی قسەکردن خەسڵەتی بگۆڕی و بەردەوامی هەیە و ناکرێت بەسەر چەند کەرتێکی جوداجودا دابەشبکرێت.

لە ساتی بیستن و تیگەیشتنی قسە ئێمە "پارچە و دیمەنەکانی" قسەکردن دەناسینەوە. قسە لە وشەو گرێ و ڕستە پێک دێت، هەروەها ئێمە لە ساتی بیستنی وشە دەکرێ ئەو هەستەمان لە لا دروست بێت کە وشەش لە چەند یەکەیەکی (بزوێن و نەبزوێن) جوداجودا پێک دێت. هەڵبەت ئێمە ئەم یەکانە سنووردار و دیاریکراو دەکەین. فۆنۆلۆجی خوێندن لەسەر ئەم یەکانە دەکات کە گوایە (دەنگەکانی هەر زمانێک) لە ژمارەیەکی جودای نەگۆڕ و دیاریکراو پێک دێت. ئێمە بە ئەم یەکە دەنگییانە دەبێژین فۆنێم **phoneme**.

## بنەماکانی فۆنەتیک

وەکو بنەمایەکی تێگەیشتن لە بونیادی دەنگی قسەکردن، وا چاوەڕوان دەکرێ مرۆڤ زانیاریی پێویستی لەسەر پێکهاتەو ئەرکی ئەندامی ئاخافتن هەبێت، هەروەها زانیاری سەرەتایی سەبارەت بە چۆنیەتی دروستبوونی دەنگەکانی زمان و سروشتی ئەکویستیکی ئەم دەنگانە هەبێت. من بە کورتی باس لە ئەم زانیارییانە دەکەم.

لە ڕوانگەی ئەکویست دەنگ بەهۆی گۆڕانکاریی پەستانی هەوا دروست دەبێت، ئەویش لە شێوەی شەپۆل لە هەوادا بڵاو دەبێتەوە. هەڵبەتە شەپۆلەکانی دەنگ دەبێت سەرچاوەی دەنگییان هەبێت. دەنگی قسە بەهۆی لەرینەوەی (لێکجودایی و لکاندنێکی) زۆر خێرای ژێیەکانی دەنگی قورقوڕاگە دروست دەبێت کە ئەوانیش بریتین لە دوو دەستە ماسولکەی بەرامبەر بە یەک، هەر وەکو لێوەکان. هەڵبەت ئەم جوڵاندنەوەیە پێوانەکراوەو لە ڕێگەی شەپۆلی هەوا کە لە سییەکان و بۆری هەواوە دێت، دەخوڵقێنرێ و بەهۆی میکانیزمی هەناسە هەڵمژین/دەردانەوە و ماسولکەکانی قورقوڕاگە کۆنترۆڵ دەکرێت.

بە شێوەیەکی نەریەتی دەنگی قسە دابەش دەکرێت بەسەر بزوێن/ڤاوڵ و نەبزوینەکان/کۆنسونانتەکان. ئاگادار بە کە ئێمە لە ئێرە سروشتی بەردەوامی و بگۆڕی دەنگەکانی قسە باس ناکەین، بەڵکو لە ڕوانگەی فۆنۆلۆجی قسە دابەش دەکەین بەسەر چەند یەکەیەک! بێجگە لە ئەم یەکە دەنگییانە، ئەوا هەندێک خەسڵەتی پرۆسۆدی Prosody properties هەیە، واتە *ئاوازە* Intonation، ڕیتم Rhythm و *درێژیی دەنگ* length کە دیسان لە ئێرە باس ناکرێن[4].

***بزوێنەکان/ڤاوڵەکان*** لە ساتی بەرهەمهێنانی دەنگەکانی بزوێن هەوا لە قورگ یان بۆشایی دەم ڕێگەی لێناگیرێت یان تووشی ڕێگرییەکی توند نابێت. هەوا بە ئازادی، بێبەربەست، تێپەڕ دەبێت (هەوا لە دەم دێتە دەرەوە). بەڵام بۆ دەنگی نەبزوێن/کۆنسونانت هەوا لە ڕێڕەوی قورگ یان بۆشایی دەم تەسکدەکرێتەوە یان بە تەواوی ڕێگەی چوونەدەرەوەی لێدەگیرێت.

لە دەمی قسەکردنی ئاسایی، بزوێنەکان گڕن و قورقوڕاگە بە سەرچاوەی دەنگ دێتە ژماردن، ژێیەکانی دەنگ دەلەرێن. لە بەرامبەردا نەبزوێنەکان، لە

---

[4] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە *فۆنەتیک و فۆنۆلۆجی* (غازی عەلی خورشید ٢٠١١).

دەمی قسەکردنی ئاسایی، دەکرێت گڕ بن یان کپ. لە ساتی بەرهەمهێنانی نەبزوێنە کپەکان، ژێیەکانی دەنگی چالاک نینو سەرچاوی ئەم دەنگانە لە جێگەیەکی تردایە (لە هەندێک شوێنی جودا جودا لە بۆشایی دەم).

ئاساییانە بزوێنەکان لە ساتی بێژانکردن بەسەر چوار خاڵ، بەپێی ڕادەی کردنەوەی دەم (شێوەی لێوەکان) و جوڵەی ئاسۆیی زار، دابەش دەکرێن (بڕوانە وێنەی ٥). بۆ نموونە ڕادەی کردنەوەی دەم بۆ دەنگی /ی/ تاکو دەنگی /ا/ کەمتر کراوەترە. هەروەها زار بەرەو پاش دەڕوات لە ساتی بەرهەمهێنانی دەنگی /وو/ (شێوەی لێوەکان خڕن دەبن) تاکو دەنگی /ی/ (شێوەی لێوەکان خڕ نابن بەڵکو ئاسۆیی درێژ دەبن).

لە ئێرە مرۆڤ باس لە بزوێنی پێش و پاش دەکات. لە هەمان سات مرۆڤ باس لە شێوەی لێوەکان دەکات چەمکی خڕ و ناخڕ بەکاردەهێنێت. ئێمە بەپێی ئەم خەسڵەتانە وێنەی بزوێنەکانی زمانی کوردی نیشان دەدەین.




وێنەی ٥. جێگۆڕکێی زار لە ئارتیکولەکردنی بزوێنەکان.

(غازی عەلی خورشید ٢٠١١: )




*وێنەی ٦* . خانەی چوارلایی بۆ گرنگترین هێماکانی دەنگەکانی بزوێن. تێبینی بکە کە لێوەکان لە ساتی بەرهەمهێنانی دەنگی /i/ کراوەیە و شێوەی خڕی هەیە، لە بەرهەمهێنانی /وو/ لێوەکان شێوەی خڕی هەیەو تاکو ڕادەیەک داخراوە بەڵام لە ساتی بەرهەم هێنانی دەنگی /ی/ لێوەکان شێوەی ئاسۆیی وەردەگرن. لە بەرهەمهێنانی دەنگەکانی بزوێن هەوای هەناسەدەردانەوە بەبێ گرفت دەچێتە دەرەوە لە دەم. ژێدەر (غازی عەلی خورشید ٢٠١١: )

***نەبزوێنەکان***، بێجگە لە ئەوەی کە بەسەر دەنگی گڕ و کپ دابەشدەکرێن، ئـەوا بەسەر شوێن و چۆنیەتی ئارتیکولەکردنیانیش دابەشـدەکرێن. بـە گشتی شـوێنی ئارتیکولەکردن ئەو شوێنە دەگەیەنێـت کـە لـە ئـەوێدا شـەپۆلی هـەوای هـەناسـە دەردانەوە ڕێگەی لێدەگیرێت یان بەربەستی بۆ پەیدا دەبێـت (بڕوانـە وێنـەی ٧). هاوکات لەگەڵ شوێنی ئارتیکولەکردن ئەوا بـاس لـە چۆنیـەتـی ئارتیکولـەکـردنیش

دەكرێ بە جۆرێك باس لە ئارتیكولەكەر (ئەو بەشە جوڵاوە) دەكرێ كە هۆكاری پەیداكردنی ئەو بەربەستەیە. نەبزوێنێكی ددانی-لێوی وەكو دەنگی /ڤ/ بە ئەو جۆرە بێژان دەكرێت كە لێوی خوارەوە بەرەو لای ددانەكانی سەروو دەجوڵێت. ئاساییانە دەنگەكانی نەبزوێن بەپێی چۆنیەتی ئارتیكولەكردنیان دابەشدەكرێنە سەر ئەم جۆرانە:

**یەكەم: وەستاو Stop**

چۆنیەتی بەرهەمهێنانی دەنگەكانی وەستاو لەگەڵ ڕێگرتنێكی تەواوی هەوای هەناسەدەردان پەیدا دەبێت لە بۆری قسەكردن. ڕێگرتنەكە لە شوێنی جیاوازی ئەندامی ئاخافتن دروست دەبێت. بەرهەمهێنانی دەنگەكانی وەستاو لە دوو قۆناغ پێك دێت:

**قۆناغی كۆكردنەوەی هەوا Occlusion step**

ڕێڕەوی هەوا لە بۆری قسەكردن تەواو داخراوە. لەبەرئەوەی هەوای هەناسەدەردان بەردەوام لە قوڕقوڕاگە دێت، ئەوا هەوایەكی زۆر كۆم دەبێت و پەستانێكی زۆر لە پشت ئەم داخرانە/ڕێگرتنە دروستدەبێت.

**قۆناغی تەقینەوە Explosion step**

ڕێگرتنەكە نامێنێت و هەوا بە تەوژم و خێرایی زۆر دەردەچێت. دەنگ دروست دەبێت.

**دووهەم: كۆسپەك Affricative**

دەنگەكانی كۆسپەك وەكو دەنگەكانی وەستاو لەگەڵ قۆناغی هەوا كۆكردنەوە دەستپێدەكات، بەڵام لەبری تەقینەوە ئەوا دەنگێكی خشۆك دروست دەبێت لە

ئەنجامی تەسککردنەوەی ڕێڕەوی هەوا. کۆسپەک وەکو پێکهاتەی هەردوو دەنگی وەستاو و خشۆکی دەژمێررێ.

سێهەم: خشۆکی Fricative

دوو بەش لە ئەندامی ئاخافتن زۆر نزیکی یەکتر دەبن بە جۆرێک کە ڕێڕەوی دەرچوونی هەوا لە بۆری قسەکردن زۆر تەسک دەبێت. ئەمیش دەبێت بە هۆکاری دەنگی خشۆکی. تەسککردنەوەکە لە شوێنی جیاوازی ئەندامی ئاخافتن دروست دەبێت.

چوارەم: لایی Lateral

ڕێڕەوی دەرچوونی هەوا تاکو ڕادەیەک بەهۆی زار دادەخرێت، بە جۆرێک کە هەوا بەبێ ئاستەنگییەکی زۆر لە لایەکی یان هەردوو لای زار دەچێتە دەرەوە.

پێنجەم: لەرزۆک Rhotic or Retroflex

لەرزۆک بە واتای بەرهەمهێنانی دەنگی /ر/ دێت. ئەم دەنگە لە لایەن زمانی جیاواز بە گەلێک جۆری جیاواز بەرهەمدەهێنرێت، بەڵام هەموو جۆرەکان هەمان خەسڵەتی ئەکویستی و بیستنیان هەیە. هەرچۆنێک بێت هەر دوو /ر/ و /ڕ/ بەربڵاوترین جۆرەکانن.

ئەم دەنگە لە ئەنجامی نزیکبوونەوەی نووکی زار بە ئارۆ دروستدەبێت. لە بەرهەمهێنانی دەنگی لەرزۆکی نووکی زار دەلەرێت (دەلەرزێت) ئەمیش پشت دەبەستێت بە گرژی ئەندامی ئاخافتن و پەستانی هەوای هەناسەدەردان. لە بەرهەمهێنانی دەنگی /ڕ/ زار بەرەو پاش دەچەمێت.

**شەشەم: لووتی Nasal**

ڕێڕەوی دەرچوونی شەپۆلی هەوا لە دەم داخراوە. زارە بچکۆلە بەرەو خوار شۆڕبووەو هەوا لە بۆشایی لووت دەچێتە دەرەوە. ڕێڕەوی دەرچوونی هەوا لە بۆشایی دەم دەکرێت بە گەلێک جۆر دابخرێت.

**حەوتەم: خلیسکاو (نیمچە بزوێنەکان) Glide (semivowel)**

نیمچە بزوێن بە ئەو دەنگە دەگوترێت کە لە ئەنجامی تەسککردنەوەی ڕێڕەوی ئەو شەپۆلی هەوایە دێت کە لە بۆشایی دەم یان لە نێوان لێوەکان دروست دەبێت. لە بۆشایی دەم زار زیاتر نزیک مەلاشوو دەبێت بە بەراورد لەگەڵ دەنگێکی بزوێنی ئاسایی. تەگەرەکە یان تەسککردنەوەی ڕێڕەوی هەوا هێندە زۆر نییە کە دەنگێکی خشۆکی لێ بەرهەم بێت. هەندێکجار بە نیمچە بزوێن دەگوترێت 'نزیکبووەکان' approximant.

وێنەی داهاتوو دەستنیشانی شوێنی هەندێک لە دەنگەکانی نەبزوێن لە زمانی کوردی دەکات. خشتەی دواتر دەستنیشانی هەموو دەنگەکانی نەبزوێن دەکات. ئەم دەنگانە بەپێی دۆخی لەرینەوەی ژێیەکانی دەنگی قورقوڕاگە، شوێن و چۆنیەتی ئارتیکولەکردن دابەشکراون.




وێنەی ٧ . ئاساییانە شوێنی ئارتیکولەکردن بە ئەم جۆرە دابەش دەکرێت. ئارتیکولەکەرە (شوێنی جوڵاندنەوەی ئەو بەشەی ئاخافتن کە دەبێت بە هۆی بەرهەمهێنانی دەنگ) جیاوازەکان دابەش دەکرێنە سەر: لێوەکان، نوکی زار، پێشی زار، پاشی زار و ڕەگی زار. لە وێنەکە شوێنی ئارتیکولەکردنی هەندێک لە دەنگەکانی نەبزوێن لە زمانی کوردی نیشان دراوە. ژێدەر (لەگەڵ هەندێک دەستکاری Linell .(Per 1978:141)

وێنەی ٨. دەنگەکانی نەبزوێن لە زمانی کوردی.

| | | شوێنی ئارتیکولەکردن | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| جۆنیەتی ئارتیکولەکردن Manner of articulation | ژێی دەنگی voicing | لێوی bilabial | لێوی/ ددانی Labio–dental | ددانی Inter–dental | ددانی/ ئارو Dental–alveolar | ئارو Alveolar | ئارو/ مەلاشووی رەق Alveo–palatal | مەلاشووی نەرم Velar | زارە بچکۆلە Uvular | قو /- |
| وەستاو Stops | کپ<br>گڕ | p پ<br>b ب | | | t ت<br>d د | | | k ک<br>g گ | q ق | |
| خشۆک Fricative | کپ<br>گڕ | | f ف<br>v ڤ | s س<br>z ز | | | ʃ ش<br>ʒ ژ | x خ<br>ɣ غ | | ح<br>ع |
| کۆسپەک Affricative | کپ<br>گڕ | | | | | tʃ چ<br>dʒ ج | | | | |
| لایی Lateral | گڕ | | | | l ل | | ʎ ڵ | | | |
| لووتی Nasal | گڕ | m م | | | n ن | | | ŋ نگ | | |
| لەرزۆک Rhotic | گڕ<br>گڕ | | | | | | r ر<br>R ڕ | | | |
| Glides نیمچە بزوێن | گڕ | w و | | | | | j ی | | | |

## فۆنێم

بەپێی بیرۆکەی فۆنۆلۆجی، هەر زمانێک لە ژمارەیەک دەنگ پێک دێت و بۆ هەر دەنگێک یەک هێما دانراوە بە جۆرێک کە هەر تاکە دەنگێک نەگۆڕو دیاریکراوە. هەڵبەت ئەم بیرۆکەیە لە مێشک و بیرکردنەوەی زمان بەکارهێنەران چەسپیوە. بە گشتی زمان بەکارهێنەران وا دەزانن کە هەر زمانێک لە ژمارەیەکی دیاریکراوی فۆنێم (دەنگ) پێک دێت و هەر وشەیەک لە چەند فۆنێمێکی جودا جودا پێک دێت، بۆ نموونە وشەی <u>خاڵ</u> لە سێ فۆنێم پێک دێت /خ/، /ا/ و /ڵ/. بۆ هەر یەک دەنگ/فۆنێم یەک هێما لە نووسین دانراوە، بە جۆرێک کە هەر هێمایەکی نووسین بەرامبەر یەک دەنگ بێت.

فۆنێم وەکو بچووکترین یەکەی واتا جوداکەرەوەی زمان پێناسە دەکرێت. بۆ نمونە گۆڕینی دەنگی یەکەمی ئەم وشانە: باڵ، داڵ، چاڵ و پاڵ دەبێت بە هۆی گۆڕینی واتایان.

لە ڕاستیدا مرۆڤ توشی ئاریشە دەبێت کاتێک دەڕوانێتە چۆنیەتی دەرکەفتنی فۆنێمەکان لە ساتی بەرهەمهێنانیاندا. تێگەیشتنی ئێمەی زمان بەکارهێنەر لە ئەوەی کە فۆنێم یەکەیەکی نەگۆڕو خاوەن خەسڵەتی تایبەتیی جێگیرە، تەواو نادروستە. ئەگەر ئێمە بڕوانینە ساتی بەرهەمهێنانی قسە یان دەرئەنجامە ئەکویستییەکەی، ئەوا ئێمە ئاڵۆزی زۆر دەبینین بۆ جیاکردنەوەی ئەم فۆنێمانە لەیەکتر (فۆنێمەکان جوداجودا نین)، هەروەها ئێمە ئەوەش دەبینین کە ئەم فۆنێمانە ئاڵوگۆڕی زۆریان بەسەر دێت. هەندێک لە ئەم ئاڵوگۆڕانە ڕێسایانە هەن، بە پشتبەستن بە ئەو فۆنێمانەی کە دەکەونە دەوروبەری فۆنێمێک لە ساتی بەرهەمهێنانیدا. ئەگەر /ت/ دوای /ڵ/ بکەوێت ئەوا ئەو دەنگی /ت/ە دەبێت بە [ط] لە ساتی بەرهەمهێنانیدا، بۆ نموونە لە

وشەکانی "گاڵتە، پاڵتۆ، خڵتە". هێمای / / بۆ فۆنێم بەکاردەهێنرێت بەڵام [ ] بۆ ترانسکریپشنی (نووسینی دەنگی) ئەلەفۆن بەکاردەهێنرێت. لە زمانی کوردی دەنگی [ط] وەکو ئەلەفۆنێک بۆ فۆنێمی /ت/ دادەنرێت. (بڕوانە وێنەی ٩).

بێجگە لە ئەم نمونەیە دەکرێت نمونەی تریش نیشان بدرێ، بەڵام ئەوەی گرنگ بێت ئەوەیە کە گەلێک هۆکار، وەکو شوێنی فۆنێم لە کۆنتێکست و جۆرەها قسەکەر لە جۆرەها دۆخ، دەبن بە هۆی پەیدابوونی ژمارەیەکی بێسنوور لە ئەلەفۆن لە ساتی گوتنی دەنگی وشە. ئەوەی جێگای سەرنج بێت ئەوەیە کە قسەکەرو بیسەر ئەم یەکانە، لە ئێرە /ت/، وەکو یەکەیەکی نەگۆڕ و جودا تێدەگەن، سەرەڕای ئەو ئاڵوگۆڕەی کە بەسەریدا دێت. لە ڕاستیدا کەس ناتوانێت هەمان دەنگ، هەموو جارێک و لە هەموو ساتێک و کۆنتێکستێکدا بە تەواوەتی وەکو یەک بەرهەم بهێنێت. قسە دیاردەیەکە کە خەسڵەتی بەردەوامی هەیە. ئەندامی ئاخافتن لە ساتی بێژانی دەنگێک، بەپێی بێژانی دەنگی پاشتر، بەرەو گۆڕانکاری دەچێت. ئاڵوگۆڕکردنەکەش بەپێی ئەو دەنگەیە کە دوای دەنگی یەکەم بێژان دەکرێ. بە بەراورد لەگەڵ زمانی نووسین، ئەوا یەکەکانی دەنگی زمانی قسە بەسەر یەکەی جودا و نەگۆڕ دابەش ناکرێن، مرۆڤ ناتوانێت خاڵی نێوان دوو دەنگ، بە جۆرێک کە گوتنی یەکێکیان تەواو بووەو دەنگەکەی تر خەریکە دەستپێدەکات، دەستنیشان بکات، بەڵکو دەنگەکان و خەسڵەتەکانی ئەم دەنگانەش دەچن بە نێو یەکتردا (هەر وەکو شەپۆلی هەوا).

ئارتیکولەکردنی دەنگی /ت/ بە تەنها ددانی/ئارووییە (بڕوانە وێنەی ٧ و ٨). لە ئارتیکولەکردنی دەنگی /ت/ لەگەڵ دەنگێکی بزوێنی خڕدا /وو/، بۆ نمونە لە وشەی 'توو'، ئەوا دەنگی /ت/ تاڕادەیەک بە لێوی دەبێت. دیسان لە وشەی "تواندن" شوێنی ئارتیکولەکردنی دەنگی /ن/ و /د/ تاکو ڕادەیەکی زۆر لە یەکتر

نزیکن، دەنگی /ن/ زیاتر ددانییە تاکو /د/ کە زیاتر ئارووییە. لە بێژانی وشەی 'تواندن' ئەوا دەنگی /ن/ کاریگەری زۆر لەسەر دەنگی /د/ دادەنێت، بە جۆرێک دەنگی /د/ بەرەو تواندن دەچێت. بەپێی تاڕادەیەک هەمان ڕوونکردنەوە دەنگی /د/ لە وشەی 'مندالْ' لادەبرێت. تواندن دەبێت بە توانن و مندالْ دەبێت بە منالْ.

| زمان | پیت | فۆنیم | ئەلەفۆن |
|---|---|---|---|
| کوردی | <ت> | /ت/ | [ت] وەکو ترێ و تاریک. |
| | | | [ط] وەکو سەڵتە و گاڵتە. |
| | <س> | /س/ | [س] وەکو سیروان و سەردار. |
| | | | [ص] وەکو سەگ و سەد. |
| زمان | گرافیم | فۆنیم | فۆنیم |
| عەرەبی | <ت> | /ت/ | /ت/ وەکو تلمیذ و تمرین. |
| | <ط> | /ط/ | /ط/ وەکو طیارە و قط. |
| | <س> | /س/ | /س/ وەکو سعد و سیف. |
| | <ص> | /ص/ | /ص/ وەکو صنم و صبی |

وێنەی ٩. پەیوەندی نێوان هێماکانی دەنگ (پیت) و بێژانکردنی دەنگەکان (فۆنیم)، غازی عەلی خورشید ٢٠١١: .

بە ئەم شێوەیە لە زمانی قسەکردن جۆرەها ئاڵوگۆڕ بەسەر دەنگەکانی پێکهاتەی وشەکانی گوتراو دێت. ئێمە بەرەبەرە ئاماژە بە ئەم ئاڵوگۆڕانە دەدەین و هۆکارەکانی ئەم ئالوگۆڕانەش ڕوون دەکەینەوە، بەڵام پێش هەموو تشتێک بە کۆئارتیکولەکردن دەستپێدەکەین:

## کۆئارتیکولەکردن Coarticulation

دیاردەی تواندنەوە تاکو ڕادەیەک بەندە بە چۆنیەتی کارکردنی ئەندامی ئاخافتن و تاکو ڕادەیەکیش لە تێکڕای دەربڕینەکاندا تواندنەوە ڕوودەدات. لە ساتی تێپەڕاندنی دەنگێکی زمانی بۆ یەکێکی تر ئەوا ئەندامی ئاخافتن بە بەردەوامی لە وێستگەیەک بۆ یەکێکی تر دەجولێت. لە ئەو ساتە کەمەی پەڕینەوەی زار لە نێوان دوو شوێنی دەنگدا ئەوا هەردوو دەنگەکە وێستگەی نێوەند وەردەگرن، هەروەها تێکڕای شێوەی بۆری ئاخافتن بە بەردەوامی دەگۆڕێت. دیسان خلیسکان لە دەنگێک بۆ یەکێکی تر دەبێت بە هۆی ئەوەی زنجیرەی قۆناغەکانی ئەکویستیی قسە ببێت بە دیاردەی پەڕینەوە لە نێوان جۆرەها دەنگی زمان. لکاندنی جۆرەها دەنگی جیاواز لە دەمی قسەکردن دەبێت بە هۆی ڕوودانی جۆرێک لە تواندنەوە لە نێوان ئەم دەنگانە. ئێمە بە ئەم جۆرە تواندنەوانە، لکاندنانە و پەڕاندنانە دەبێژین کۆئارتیکولەکردن (لە لاتینیەوە co واتە "پێکەوە" و articulation واتە "گۆکردن").

کۆئارتیکولەکردن دەبێت بە هۆی ئەوەی کە فۆنێمەکان، بەپێی ئەو دەنگانەی کە لە پێش و پاشیان دێن، بە جۆرەها شێوە دەربببڕێن. لە زنجیرەیەک دەنگی بە دوای یەکدا، وەکو دەرئەنجامێکی ئارتیکولەکردن، ئەوا کۆئارتیکولەکردن ئەوە نیشان دەدات، بۆ نمونە، زار لە ئارتیکولەکردنی دەنگێکی بزوێن زیاتر بۆ سەرەوە یان خوارەوە دەجولێت بە شێوەیەک کە تایبەتمەندی شوێنی ئارتیکولەکردنی ئەو دەنگە نەبزوێنە وەردەگرێت کە لە پاش یان پێشی ئەم دەنگە بزوێنە دێت. ئەو دەنگە بزوێنە بە تەنها ئەو خەسڵەتەی نییە کە پەیوەستە بە خۆی بەڵکو بە ئەو خەسڵەتانەش کە تایبەتە بە ئەو دەنگانەی کە هاوسێین. بۆ بیسەر ئەو دەنگە هاوسێیانە ڕۆڵی گرنگ دەبینن لە ناسینەوەی دەنگەکانی زمان لە دەمی

قسەکردندا. ئەگەر ئێمە وشەی "تارا"، کە گوترابێت لە ڕستەیەک، تۆماربکەین و دواتر بەشێکی وشەکە کە بەرامبەر بە دەنگی [ت] دەوستێت ببڕین، دەبینین کە ئەم دەنگە لە دەنگی [ا] دەبیسترێت. بە هەمان شێوە ئەگەر ئێمە [تا] لە وشەکە ببڕین ئەوا پاشماوەی دەنگی [ا] لە دەنگی نەبزوێنی [ر] دەبیستین. بە ئەم شێوەیە دەنگەکانی زمان لە ساتی ئاخافتن یەکەی جودا و نەگۆڕ نین بەڵکو ئەم دەنگانە بەپێی ئەو کۆنتێکستەی کە تێی کەوتوون دەگۆڕرێن. واتە جۆرەها ئاڵوگۆڕکردن بەسەر دەنگەکان دێن.

## لێکچوون Assimilation

وەکو پێشتر من ئاماژەم پێدا، ئەو دۆخەی کە دەکەوێتە دەوروبەری دەنگێک کاریگەری بەسەر چۆنیەتی پەیدابوونی ئەو دەنگە دادەنێت، بە شێوەیەک ئەم دەنگە پەیدابووە، بەپێی دۆخەکە، وەکو ئەلەفۆنێک دێتە ئەژماردن و شێوەیەکی لێکچووی لەگەڵ دۆخی دەوروبەری دەبێت. لێکچوون دەکرێت واتای ئەوە بدات کە دەنگی پێشتر کاردەکاتە سەر دەنگی دواتر، ئەمەش پێی دەگوترێ لێکچوونی پێشی progressive assimilation. بۆ نموونە شوێنی ئارتیکولەکردنی فۆنێمی /ک/ لە وشەی 'لیک'، لەبەرئەوەی /ک/ لە دوای دەنگی بزوێنی پێشەوەیی /ی/ دا دێت، تۆزێک دێتە پێشەوە (لە مەلاشووی نەرم) بە بەراورد ئەگەر ئەم دەنگە بزوێنە پاشەوەیی بێت وەکو /ا/ لە وشەی 'پاک'. ئەم کاریگەری بزوێنەش پێی دەگوترێ خڕکردنی نەبزوێن Rounding of consonants. هەروەها دەنگی زمانی دەکرێ لە پاشەوە کاریگەری لەسەر بێت، ئەمەش پێی دەگوترێ لێکچوونی پاشی regressive assimilation. بۆ نمونە ئێمە دەتوانین بەراوردی پەیدابوونی دەنگی /ش/ لە نێوان هەردوو وشەی 'شین' و 'شاخ' بکەین. لە ئارتیکولەکردنی

دەنگی /ش/ لە وشەی 'شین' دا ئەوا شوێنی ئارتیکولەکردن لـە مـەلاشـووی ڕەق بەرەو ئارو دێت لەبەرئەوەی بزوێنی /ی/ پێشەوەییە، بەڵام بزوێنی /ا/ لـە وشـەی 'شاخ' پاشەوەییە بۆیە شوێنی ئارتیکولـەکردنـی /ش/ لـە مـەلاشـووی ڕەق بـەرەو مەلاشووی نەرم دەڕوات.

## لێکنەچوون Dissimilation

لێکنەچوون واتە جودا لەیەک و بە پێچەوانەی لێکچوون دێت. لێکنـەچـوون بـە واتای ئەوە دێت کە کاریگەریی دەنگەکانی دەوروبـەر لـەسـەر دەنگێـک دەبێـت بـە هۆی پەیدابوونی ئەلەفۆن یان ئـاڵوگۆڕی تـر کـە فۆنـەتیکانـە جیـاوازتـرە لـە ئـەو دەنگانەی کە لە دەوروبـەری ئـەم دەنگـە هـەن، بـۆ نموونـە وشـەی لێکـدراو وەک دەست-گیران بۆ دەزگیران و دەست-گا بۆ دەزگا.

## کورتکردن Reduction

هەنـدێکجار درێـژی یـەکـەیـەکـی دەنگـی قـسە کـەمـدەکریـت یـان بـە تـەواوی لادەبرێـت/فرێـدەدرێـت. ئـەمـەش پێـی دەگوترێـت کـەمکـردن. کـەمکـردن پـشت دەبەستێت بە هێز (هێزی گوتن). ئاساییانە دەنگی بـەهێـز لـە بڕگـە کـەمناکرێـت یان لانابرێت، بەڵکو ئەمە دەنگی بێهێزە کە کەمدەکرێت یـان لادەبرێـت. هـەڵبـەت خێرایی و دۆخی قسەکردن ڕۆڵی گرنگ دەبینن، لە دۆخی نافەرمی قسە خێرایـە و کـەمکـردن ڕوودەدات. بـە پێچـەوانـەوە لـە دۆخـی فـەرمـی قـسە لـەسـەرخۆیـە و کەمکردن کەمتر ڕوودەدات. هەندێک دۆخی فۆنەتیکی، کە لـە ئـەوێـدا دوو دەنگـی نەبزوێن بە دوای یەکتر دێـن، دەبێـت بـە هـۆی ئـەوەی یـەکێـک لـە ئـەم دەنگانـە نەگوترێت یان لاببرێت، بۆ نموونە:

سوتاندن سوتانن

دڕاندن دڕانن

زەرد زەر

بردن برن

هۆکاری ئەم لابردنە لە دەمی قسەکردنـدا دەکرێت بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە شوێنی ئارتیکولەکردنی هەردوو دەنگی /ن/ و /د/ لە لایەکەوە، /ر/ و /د/ لە لایەکی ترەوە، لە یەکتر نزیکن (بڕوانە وێنەی ٧ و ٨)، چونکە قسەکەر ئەم دەنگانە (/ن/ لەگەڵ /د/ و /ر/ لەگەڵ /د/)، کە بە دوای یەکتردا دێن، لە ساتی قسەی خێرای ڕۆژانە دووبارە ناکاتەوە. ئەم جۆرە ئاسانکارییانە لە دەمی بێژان پێی دەگوترێت هاپلۆلۆجی haplology. باشترین نموونەی ئاسانکاری وشەی "تشت"ە کە لە دەڤەری گەرمیان، سنە، دهۆک و کوردستانی باکور و لوڕستان بەکاردەهێنرێ،بەڵام لە سلێمانی و مهاباد دەبێت بە "شت". لە ڕاستیدا شوێنی ئارتیکولەکردنی دەنگی /ت/ و /ش/ لە یەکترەوە نزیکە بۆیە لە ساتی قسەکردن زۆر ئاسایی دەبێت کە مرۆڤ ئەم دەنگە نەڵێت. لە ناوچەی هۆرێن لە خانەقین و لە بەشێکی ناوچەی کرماشان هەردوو دەنگی /ت/ و /ش/ لادەبرێت دەنگی /چ/ دەخرێتە شوێنیان. ئەمە لەبەرئەوەی شوێنی ئارتیکولەکردنی دەنگی /چ/ دەکەفێتە نێوان شوێنی ئارتیکولەکردنی هەردوو دەنگی /ت/ و /ش/ ، دەمەوێت بێژم کە وشەی "تشت" دەبێت بە "چت".

هەندێک جار بەدواهاتنی دوو دەنگ بە دوای یەکتر دەبێت بەهۆی پەیدابوونی دەنگێکی تر. ئاساییانە دوو بزوێن بە دوای یەکتر نایەت، ئەگەر هات، نەبزوێنێک شوێنی بزوینێک دەگرێتەوە. بۆ نموونە لە نێوان دەڤۆک و دیالێکتەکاندا:

| سلێمانی | هەولێر، گەرمیان، کرماشان و سنە |
| --- | --- |
| حەوت | حەفت |
| مزگەوت | مزگەفت |
| خەوت | خەفت |
| کەوت | کەفت |
| نیو | نیم |

هەڵبەت ئەم ئاڵوگۆڕی دەنگییە کە لە نێوان جۆرەها دەڤۆک و دیالێکتەکانی زمان هەیە ئاسایی و سروشتییە و ڕەگی مێژوویی هەیە.

## گۆڕینی تایبەتمەند

لە دیالێکتەکانی هەندێک زمان ئاڵوگۆڕ لە نێوان دوو دەنگ دەکرێ، بۆ نمونە دیالێکتێک لە ژمارەیکی زۆر لە وشەکان یەک جۆر دەنگ بەکاردەهێنێت بەڵام دیالێکتێکی تر ئەم جۆرە دەنگە لە زۆربەی وشەکان بە دەنگێکی تر دەگۆڕێت. ئاڵوگۆڕی نێوان دەنگی /و/ و /ڤ/ یان /ف/، کە لە نێوان دیالێکتەکانی زمانی کوردی هەیە، نمونەیەکی زیندووی ئەم ئاڵوگۆڕەیە. هۆکاری زۆر هەیە کە بۆچی دەنگی /ڤ/ یان /ف/ بۆ /و/ گۆڕاوە، یان بە پێچەوانەوە. لە ڕوانگەی فۆنەتیک: دواهەمین شوێنی دەرچوونی هەوا لە بۆشایی دەم لە ساتی بەرهەمهێنانی دەنگی /و/ لێوەکانە، کە خڕ ەکرێنەوە. شوێنی بەرهەمهێنانی دەنگی /ڤ/ یان /ف/ لێوی/ددانیە و هەردوو دەنگی [و] و [ڤ] گڕە. لەبەرئەوەی شوێنی بەرهەمهێنانی ئەم دوو دەنگە لە یەکتر نزیکە دەکرێت ئەمە هۆکارێک بێت بۆ ئەم گۆڕانکارییە. هەڵبەت ئەم دیاردە تشتێکی نامۆ نییە،

بەڵکو سەرهەڵدانیشی ئاسایی و سروشتیی. سەرەتای سەرهەڵدانی ئەم گۆڕانکارییە دەکرێت وەکو ڕێکەفت بێتە خەملاندن و پەیوەست بکرێت بە کۆمەڵێکی دیاریکراو لە زمانبەکارهێنان لە ناوچەیەکی دیاریکراوی جوگرافی. لەوانەیە ئەم جۆرە بێژانە یان ئەم جۆرە گوتنە پەسەند نەبووبێت لە قۆناغەکانی یەکەمی سەرهەڵدانی بەڵام دواتر بووبێت بە ڕاستییەکی پیادەکراو بۆ گشت زمان بەکارهێنەران.

لە هەندێک زمان بۆ نمونە سویدی و ئەڵمانی پیتی w بە ئەلفوبای لاتینی بە "ڤ" دەخوێندرێتەوە بەڵام لە زمانی ئینگلیزی بە "و". هەندێک ناوی کوردی وەکو "**ساوان و شوان**" کە بە ئینگلیزی وەکو Sawan و Shwan دەنووسرێت ئەوا لە زمانی سویدی دەبێت بە "**ساڤان**" و "**شڤان**". واتە دەنگی [و] دەبێت بە [ڤ]. هەروەها وشەی wire و whisky وەکو "ڤایەر و ڤیسکی" دێنە خوێندن. هەڵبەت سیستەمی نووسینی ئەلفوبای کوردی بەبەراورد لەگەڵ فارسی تازەیە. فارسەکان هەتاکو ئێستاش دەنگی [ڤ] لە بری [و] بەکاردەهێنن. زمانی فارسی کاریگەری بەسەر زمانی کوردی هەبووە و هەیە، بە تایبەتی ئێستاش دیاردەی ئاڵوگۆڕکردنی [و] بۆ [ڤ] بۆ کوردەکانی پارچەی ئێران لە دەمی قسەکردن هەستپێدەکرێت.

بەپێی پێناسەکەی، فۆنێم بچوکترین یەکەی واتاجیاکەرەوەیە، مەرجی سەرەکی فۆنێم جیاکردنەوەی واتایە، بۆ نمونە لە وشەکانی *ناڵ، داڵ، پاڵ، ماڵ* و هیتر فۆنێمی یەکەمی ئەم وشانە وەکو یەک نین بۆیە واتای وشەکانیش دەگۆڕرێت. بەڵام ئەگەر فۆنێمی کۆتایی لە وشەکانی ئاو و ناو بۆ ئاڤ و ناڤ بگۆڕدرێت واتای وشەکان ناگۆڕرێن، ئەم دۆخە ئەو جیاوازی دەنگەییە کە هەیە وەکو ئەلەفۆن تەماشا دەکرێت. ئەم دیاردەی زمانییە تشتێکی ئاساییە، ئەمە

لەبەرئەوەی زمانی قسەکردن هەمیشە و بەردەوام لە ئاڵوگۆڕکردنە. ئەم جیاوازیی دەنگییە لە ساتی بێژانی گەلێک وشە، کە نابێت بە هۆی گۆڕاندنی واتای وشە، خەسڵەتێکی ئاسایی نێوان دیالێکتەکانی یەک زمان و دەڤۆکەکانی یەک دیالێکتە[5].

## ۲. ڕوانگەی وشە

### پێشەکی

ئەگەرچی مرۆڤ بێ گرفت لە ئاخافتنی ئاسایی ڕۆژانە "وشە" بەکار دەهێنێت بەڵام لە ڕوانگەی زانستی پێناسەکردنی "وشە" تشتێکی پڕ گرانە. لە دەمی قسەی ئاسایی ڕۆژانە هیچ پاوسێک لە نێوان وشەکان نییە، بەڵکو قسەکانی مرۆڤ وەکو گرێیەکی فۆنەتیکی، لە شێوەی شەپۆلە دەنگ یان شەپۆلە هەوا، دەردەچێت. هەربۆیە ناشێت ئەو وشانەی کە ڕستەیەکی قسەکردن پێکدەهێنن لە یەکتر جودا بکرێن. بەڵام ئەگەر مرۆڤ لەسەرخۆ قسە بکات ئەوا دەکرێت پاوسەکانی نێوان وشەکان دیاری بکرێت.

خەسڵەتێکی تری وشە بەندە بە ئاڵوگۆڕکردنی گەلێک وشە بە وشەی تر بە جۆرێک کە وشە گۆڕاوەکە هەمان واتاو ئەرکی هەبێت، بۆ نمونە:

ئەز هەنووکە دەچم بۆ بازێڕ.

من ئێستا دەڕۆم بۆ بازاڕ.

---

[5] هێژا جەمال نەبەز (١٩٧٦:٥٩) دەنگی /ڤ/ بە پەسەند دەزانێت لە هەمبەر دەنگی /و/ بۆ زمانی یەکگرتووی کوردی. هەروەها سەبارەت بە ئەم دوو دەنگە بنەڕە هێژا فازل عمر (٢٠٠٤:٥٣). سەبارەت بە بۆچوونی من دەربارەی ئەم بابەتە بنواڕە میتودی کارکردن لە بەشی هەشتەم.

خەسڵەتێکی تری وشە بەندە بە ئەوەی کە زۆر جار دەربڕین لە تەنها وشەیەک پێک دێت، واتە ئەم دەربڕینە ڕۆڵی ڕستەیەک دەبینێت:

کەی؟ ئێستا.

کێ؟ ئەو.

کوێ؟ ماڵ.

بۆچی؟ نازانم.

هەرچۆنێک بێت هەموو وشەیەک بە تەنها ناتوانێت دەربڕین پێک بهێنێت. بەڵام بەپێی خەسڵەتی سێهەم دەکرێت هەوڵ بدرێ پێناسەی وشە بکرێت: **وشە کەمترین بەشی زمانە کە بە تەنها بتوانێت دەربڕین بهێنێتە دروستکردن.** ئاساییانە وشە ناوەڕۆک و واتای هەیە بەڵام برێک لە واتاو ناوەڕۆک پتر لە یەک وشە دەخوازێت (بڕوانە بەشی سیمانتیک)، بۆ نمونە:

هەرچۆنێک بێت، ب ڤی ئاوایی، لەبەر ئەوە، بە شێوەیەکی گشتی، ب ڤێ چەندی...

دیسان واتای وشە تاکو ڕادەیەک بەندە بە کۆنتێکست. قەبارەی گەورەیی لە "*مێرولەیەکی گەورە*" جودایە لە "*فیلێکی گەورە*"، هەروەها ڕەنگی سور لە "*لە شەرما سور هەڵگەڕا*" جودایە لە کەسێک بە ناوی "*ئازادە سور*".

لە وشەکانی نێوان هەر ڕستەیەکی نووسراو بۆشایی هەیە، بەڵام لە وشەکانی نێوان ڕستەیەکی قسەی ئاسایی بۆشایی نییە.

## وشە دروستکردن

وشە لە زمان بە گەلێک جۆر هاتۆتە دروست کردن و دەکرێت وشەی نوێی تریش بێتە دروست کردن، وەکو وشەی سادە، لێکدراو، داڕێژراو، قەرزکراو و

داتاشـراو. لـه ڕوانگـەی مۆرفۆلـۆجی دەکرێـت وشـە لـە چـەنـد پارچـەیـەکـی (یەکەیەکی) واتادار پێک هاتبێت. مۆرفێم ئـەو بەشـانەی وشـەیـە کـە بـە تـەنها دەتوانێت واتایەکی دیاریکراوی هەبێت. مۆرفێم وەکو بچوکترین یـەکـەی واتـاداری زمان پێناسە دەکرێت — بەراوردی فۆنێم بکە کـە وەکـو بچـوکترین یـەکـەی واتـا جوداکەرەوەی زمان دێتە پێناسەکردن. ڕەگی مـۆرفێم بـە تـەنها (یـان لـەگـەڵ پێشگرو پاشگری تر) دەتوانێت وشە پێک بهێنێت، بۆ نمونە *ناو*، لـەگـەڵ پێـشگر وەکو *بێناو*، لەگەڵ پاشـگر وەکـو *ناودار*. هـەروەهـا مـۆرفێم لـە ڕوانگـەی ڕێزمـان گەردان دەکرێت، بۆ نموونە *ڕۆژ* — *ڕۆژێک*، *ڕۆژەکە*، *ڕۆژەکان*، "*ئەو*" *ڕۆژانـە*. ئێمـە ئێستا ڕووناکی زیاتر دەخەینە سەر ئەم بابەتە:

-وشەی سادە

وشەی سادە ئەو وشانەن کە چیتر ناتوانرێت بەسەر مۆرفێمی بچوکتر دابـەش بکرێن. ئاساییانە ئەم وشانە لە یەک برگە پێک دێن وەکو *دار*، *شـیو*، *مێو*، *مـەڕ*، *با* هتد. هەندێک وشـە دەکرێـت لـە یـەک برگـە زیـاتر پێـک هاتبێـت وەکـو *باران*، *دەمار*، *دەریا*، *هونەر*، *هاڤین*، *پایز هتد*[٦].

[6] برگە یەکەیەکە، یان ڕێکخستنێکە، کە لە یەک یان زیاتر فۆنێم پێکدێت. هەر برگـەیـەک یـەک دەنگی بزوێن دەگرێتەخۆ، لەگەڵ یەک یان زیاتر دەنگی نەبزوێن کە لە پێشی یان لە پاشی ئەم دەنگە بزوێنە دێت. برگە زیاتر یـەکـەیـەکی دەنگییـە تـاکو یـەکـەیـەکی واتـایی. ئـەگـەر ئێمـە بزوێن/ڤاوڵ بە پیتی V و نەبزوێن/کۆنسونانت بە پیتی C دیارییکەیـن ئـەوا لـە زمـانی کـوردی دەکرێت ئەم چـەنـد جـۆر برگـە دیـاری بکرێـت (بڕوانـە فۆنـەتیـک و فۆنۆلـۆجی "غـازی عـەلـی خورشید ٢٠١١"):

خوارد CCVCC

برین CCVC

تۆ CV

نان CVC

**-وشەی لێکدراو**

وشەی لێکدراو ئەو وشانەن کە لە ڕێگەی دوو یان زیاتر وشەی فەرهەنگی لێکدراون و ئاساییانە وەکو تەنها وشەیەک ئەرک دەبینن وەکو، *وتەبێژ، شنەبا، ڕەشماڵ، دڵشاد* هتد. هەندێک وشە لە ڕێگەی گرێدەرێک لەگەڵ یەکتر دەلکێندرێن وەکو *بەردەنوێژ، مانگەشەو، سێڤەشەکر، گوڵەباخ* (پیتی 'ە' گرێدەرە)، *هێلکەوڕۆن، لەرزوتا، دەنگوباس، ژێروژوور، ژانوبا* (پیتی 'و' گرێدەرە)، *کولێرەبەڕۆن، کاربەدەست، سەربەگۆبەن* ('بە' گرێدەرە).

هەرچۆنێک بێت، مەرج نییە هەموو وشەی لێکدراوێک بریتی بێت لە پێکهاتەی دوو وشە. بە جۆرێکی تر هەندێکجار هەر دوو بەشی وشە لێکدراوەکە واتای خویان هەیە بەڵام پاش تێکەڵاوبوون واتایەکی تر دەبەخشن وەکو *بێوەژن، شاگردو دەستکێش* بەڵام نەک *پیرەژن* و *پیرەمێرد*[7].

**- وشەی داڕێژراو**

وشەی داڕێژراو ئەو وشانەن کە لە ڕێگەی پێشگر یان پاشگر یان هەردوو پێکڤە لەگەڵ وشەیەکی سادە دێنە دروست کردن، وەکو: ناتەبا، بێلایەن، بەدکار، پێشگوتن، نەخۆش، داڕشتن (پێشگر+ وشە)، ئاسنگەر، سەرباز، ڕێگە، گوڵزار (وشە+ پاشگر)، ناتەبایی، بێلایەنی، نەخۆشخانە، بەدکاریی (پێشگر+ وشە+ پاشگر).

---

ئارد CVCC

برا CCV

دەست CVCC

و V (وەکو ئامرازی پەیوەندی بۆ نموونە لە گرێی من و تۆ)

[7] لارس مێلین (٢٠١٠:٦٤). و. غازی عەلی خورشید.

-وشەی قەرزکراو

هەموو زمانێک وشە لە زمانی تر وەردەگرێت (قەرزدەکات) و دواتر دەبێت بە بەشێک لە فەرهەنگی زمانی. هەندێکجار وشەی قەرزکراو تاڕادەیەک بە ئەو شێوەیەی کە لە زمانی یەکەم بەکاردەهێنرێت، لە زمانی دووهەم (وەرگر) بەکاردەهێنرێت بەڵام هەندێک جار وشەی نوێ بۆ ئەو وشە قەرزکراوە دادەتاشرێت، بۆ نمونە:

١. وشەی قەرزکراو وەکو خۆی: خاڵ (برای دایک)، تەڵاق (لە عەرەبی)، ستراتیجی، میکانیک، گەرانتی، ئۆتۆمۆبیل (لاتینی و یۆنانی، زیاتر لە ڕێگەی زمانی ئینگلیزی).

٢. وشەی قەرزکراوی داتاشراو: ئەرێنی، نەرێنی، فەرمی، دەرونزانی، نووسینگە.

هەندێک جار وشەی قەرزکراوی زمانی دووهەم شوێنی وشەی بەکارهێنراوی زمانی یەکەم دەگرێتەوە وەکو: کتێب لەبری *پەرتوک*، *سیاسەت* لەبری *ڕامیاری*، *مەعیدە* لەبری *گەدە*. ئەم دیاردەیە لە زمانی قسەکردن زیاتر دیارە.

## یەکەم: وشە لە ڕوانگەی مۆرفۆلۆجی

دەستەواژەی وشە دەکرێت بە چەند شێوەیەک بێتە بەکارهێنان. هەندێکجار مرۆڤ تەماشای پشیلە و پشیلەیەک وەکو دوو فۆرمی هەمان وشە دەکات. پشیلە وشەیەکە کە لە فەرهەنگ دەبینرێت، واتە ئەم وشە فەرهەنگییە. ***پشیلەیەک*** فۆرمێکە کە دەشێت بچێتە نێو ڕستەیەک، کە بۆشاییەکی هەبێت لەگەڵ وشەیەکی تر، لە ئێرە مرۆڤ باس لە وشەی تێکستی دەکات، بڕوانە ئەم نمونانە:

پشیلەیەک هات.

پشیلەکە هات.

پشیلە هات.

پشیلەکان هاتن.

ئەو کەسەی زمانێک بزانێت دەستەڵاتی بەسەر چەند یەکەیەکی زمانی، وەکو یەکەکانی دەنگ و وشە، دەشکێت، بە جۆرێک ئەو دەتوانێت ئەم یەکانە بەپێی ڕێساکانی زمانی بەیەکەوە بلکێنێت و دەربڕین بهێنێتە دروستکردن.

ئێمە کاتێک وشەی پشیلە لە کۆنتێکستێکی بەرینتر بەکاردەهێنین ئەوا ناکرێ لەگەڵ دەوروبەری خۆمان بە وشەی تاک تاک پەیوەندی دروستبکەین. لە ئێرە پێویستمان بە توخمی تر، مۆرفێم، هەیە بۆ ئەوەی جۆرەها ڕستە دروستبکەین. ئەگەر ئێمە دەربارەی تەنها پشیلە-یێک قسەبکەین کە نادیارە ئەوا —یەک- دەخەینە سەر وشەکە، بەڵام ئەگەر ئێمە دەربارەی یەک پشیلە-ی دیاریکراو/ناسراو قسەبکەین —کە- دەخەینە سەر وشەکە، دەربارەی چەند پشیلە-ێکی نادیار/نەناسراو قسەبکەین دەتوانین هیچ تشتێک نەخەینە سەر وشەکە بەڵام ئەگەر دەربارەی چەند پشیلەیەکی دیاریکراو/ناسراو قسەبکەین ئەوا دەڵێین *پشیلە-کان*.

مۆرفێم بچوکترین یەکەی زمانە کە بتوانێت واتای ناوەڕۆک بگەیەنێت (بڕوانە بابەتی داهاتوو). بۆ تێگەیشتن لە ئەمە، ئێمە دەتوانین وشەکە بەسەر واتا هەڵگرەکانی دابەشبکەین، وەکو نمونەی سەرەوە. *پشیلە* مۆرفێمێکی فەرهەنگییە/لێکسیکاڵییە کە لە فەرهەنگی وشە هەیە، ئەم وشەیە پێی دەگوترێت وشەی فەرهەنگی lexical word. *-ێک، -ەکە، -ەکان* مۆرفێمی ڕێزمانین، لە ئێرەدا ئەم مۆرفێمانە پاشگرن و واتایان نییە بەڵام ئەرکی ڕێزمانیان هەیە. دابەشکردنی جۆری تری مۆرفێم دەستنیشانی پلەکانی بەراورد دەکات، بۆ نمونە

له ئاوەڵناوی *گران، گران‌تر، گران‌ترین*. ئەم جۆرە جیاوازییانە لە دەربڕینی مۆرفێمانە پێی دەگوترێت ئەلۆمۆرف **allomorph**. ساتێک مۆرفێم لەگەڵ وشە دەلکێنرێت، ئەوا ئەمە بەپێی هەندێک ڕێسا دەچێت بەڕێوە بەڵام نەک بۆ هەموو وشەیەک، بۆ نموونە لە فرمانی *بێ، نێت، بێت، هات*. لە ئێرەدا دەبینرێت کە شێوەی (یان فۆڕمی) وشەکە بۆ *دۆخە جیاوازەکانی کات* جیاوازە. ئەم جۆرە مۆرفێمانە بە ئەلۆمۆرفی تایبەت نوێنەرایەتی دەکرێن. بەراوردی فۆڕمی جیاوازی دۆخەکانی وشەی "کردار"ی پێشووتر بکە لەگەڵ خواردن، ***خواردی، دەخوات، بخوات***. بۆ زانیاری زیاتر فەرموون لەگەڵ یەک نموونەی تر کە بریتییە لە وشەی "**نائومێدێک**":

| | | |
|---|---|---|
| نا | ئومێد | ێک |
| پێشگر | ڕەگی وشە | پاشگر |
| **prefix** | **rott** | **Suffix** |

## جۆرەکانی زمان یان تایپۆلۆجی زمان

لەسەر بنچینەی کە چۆن مۆرفێمی پێشگر و پاشگر مامڵە لەگەڵ زمان دەکەن ئەوا لینگویستەکان پێش چەندسەد ساڵێک زمانەکانی جیهانیان بۆ چەند جۆرێک دابەش کردوە. بڕوانە نەخشەی خوارەوە کە بە کورتی دەستنیشانی جۆرەکانی زمان دەکات[8].

[8] ژێدەر بۆ هەموو نەخشەکانی ئەم بابەتە (Lars-Gunnar Andersson 1987:21-25)




وێنەی ١٠. جۆرەکانی زمان

## زمانی دابڕاو

لە ئێرە من ڕستەیەک پێشکەش دەکەم کە لە زمانی ماوری، لە نیوزلاند، وەرگیراوە. ڕستەکە واتای "پیاوەکە قرشەکەی دی". دەگەیەنێت.

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| Kua | kite | te | taŋata | i | te | maŋoo. |
| دەمی ڕابردوو | دی | فۆڕمی دیار | پیاو | بەرکار | فۆڕمی دیار | قرش |

پیاوەکە قرشەکەی دی.

وێنەی ١١. نموونەیەک لە زمانی دابڕاو

ئەم ڕستەیە لەگەڵ وەرگێڕانە کوردییەکە بەراورد بکە. وشەی کوردی "دی" لەزمانی ماوری لە دوو مۆرفێم پێکدێت "دی" و "نیشانەی دەمی ڕابردوو". ئەم

دوو مۆرفێمە لە کوردی دەتوێتەوە. لە ماوری ئەم دوو مۆرفێمە وەکو دوو وشەی سەربەخۆ دەنووسرێن. فۆرمی ناسراو لە کوردی سوینتێزانە نیشاندەدرێت، ئەویش لە رێگەی پاشگری (ەکە). لەزمانی ماوری پاشگر وەکو وشەی سەربەخۆ دیاردەکەوێت. بەراوردی the بکە لە زمانی ئینگلیزی کە وەکو وشەیەکی سەربەخۆ دەردەکەوێت. پیتی پاشگری "ی" لە "قرشەکەی" وەکو نیشانەی بەرکار دەردەکەوێت بەڵام لە ماوری وشەیەکی سەربەخۆیە.

مەترسیدارە ئەگەر مرۆڤ باس لە ئاسانی و گرانی زمانی جیاواز بکات بەڵام مرۆڤ دەتوانێت بێژێت کە زمانی دابڕاو ئاسانترە لە زمانی نووساو. گەنگەشەیەک بۆ ئەم بۆچوونە ئەوەیە کە سەرەتای گەشەسەندنی زمان و دەربڕینی زمانەوانی لە لای منداڵ دابڕاوانەیە. بەپێچەوانە ئەمە لە لای گەورە نووساوییە.

## زمانی لکێندراو

نموونەیەکی ئەم جۆرە زمانە تورکییە. بڕوانە ئەم نمونە:

| | |
|---|---|
| خانووەکان (ناسراو) ev-ler | خانووەکە ev |
| لە خانووەکان (ناسراو) ev-ler-de | لە خانووکە ev-de |
| لە خانووەکانەوە ev-ler-den | لە خانووکەوە ev-den |
| لە خانووەکانی منەوە ev-ler-im-den | لە خانووەکەی منەوە ev-im-den |

*وێنەی ١٢*. نموونەیک لە زمانی لکێندراو

زمانی تورکی سیستەمێکی دەوڵەمەندی لە پاشگر هەیە بە جۆرێک کە پاشگر لەدوای پاشگر بە ڕیز بە دوای یەکتر دێن. هەڵبەت مرۆڤ ئەم پاشگرانە لە یەکتر جودا دەکاتەوە.

## زمانیتواندراو

زمانی سامی لە ئەم جۆرە زمانەیە. بڕوانە ئەم نموونەیە:

| | | | |
|---|---|---|---|
| کتب | ئەو (نێر) نووسی | یکتب | ئەو (نێر) دەنووسێت |
| کاتب | (نووسەر) | کتبا | (نووسەر —کۆ) |
| کتاب | (پەرتووک) | کتب | (پەرتووک — کۆ) |
| مکتوب | (نووسراو) | مکاتب | (نووسینگە-کۆ) |
| مکتبە | (پەرتووکخانە) | | |

*وێنەی ١٣*. نموونەیەک لە زمانی تواندراو

هەموو ئەم وشانە لە یەک کێڵگەی سێمانتیک وەرگیراوە. هەموو وشەکان پەیوەندی یان گرێدراوی نووسینە. ئەوەی کە هەموو ئەم وشانە کۆدەکاتەوە هەر سێ پیتی نەبزوێنی "ک،ت،ب"ە. لە ڕوانگەی بەرهەمهێنانی وشەی نوێ ئەوا ئەم سیستەمی مۆرفۆلۆجییە گەلێک باشە. زمانی عەرەبی "گەردانکردنی ناوەکی" هەیە کە ئەمیش زیاتر بەهۆی (سکون، ضمە، فتحەو کسرە ° ʼ - ــ) دروست دەبێت.

## زمانی هەڤتێکەڵ

نمونەی ئەم جۆرە زمانە زمانی "گرینلاندی" و چەندین زمانی تری هیندییە سورەکانی باکوری ئەمریکایە. بڕوانە ئەم نمونەیە کە لە زمانی گرینلاندی وەرگیراوە.

| |
|---|
| سیکورسوارسیورپوگوت sikursuarsiurpugut |
| سیکو – رسوار – سیور – پو – گوت. Siku – rsuar – siur – pu – gut. |
| بەفر – مەزنە – ئەچین بە نێو – ئێمە |
| ئێمە بە نێو ئەو بەفرە مەزنە دەچین. |

*وێنەی ١٤*. نموونەیەک لە زمانی هەڤتێکەڵ

ئەوەی کە بە کوردی بە حەفت وشە دێتە دەربڕین بە گرینلاندی بە یەک وشـە بەرهەم دێت. بە شێوەیەکی سەرەکی دەتوانرێت بگوترێت کە زۆرێک لە وشـەکانی دەربڕینێـک لـە زمانـەکـانی "پـۆلی نووسـاوی" تـەنهـا بـە کردارێـک دەلکێنـدرێن. بەراوردی زمانی "پۆلی نووسـاوی" بکـە لـەگـەڵ ئـەم دەربڕینانـە کـە لـە دیـالێکتی کرمانجی خواروو زۆر باوە:

دەمبیستیت کە واتای: ئایا تۆ من دەبیستیت-ی هەیە.

دەمبیستن کە واتای: ئایا ئێوە من دەبیستن-ی هەیە.

دەمانبیستن کە واتای: ئایا ئێوە ئێمە دەبیستن-ی هەیە.

دەیانبیستن کە واتای: ئێمە ئەوان دەبیستن-ی هەیە.

دیارە کە ئەم جۆری زمانە، گرانە؛ بە تایبەتی بـۆ فێربـوون. لـە ڕاسـتیدا دیـاردەی لکاندن یان نەمان یان تواندنەوەی جێناو لە ئەم جـۆرە دەربڕینانـە دژواری زۆر لـە تێگەیشتن بۆ زمانبەکارهێنەرانی کرمـانجی ژووروو پـەیـدا دەکـات لـە تێگـەیشتنی ئەوان بۆ کرمانجی خواروو[٩].

---

[9] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە کتێبی "ڕێزمـانی رانـاوی لکـاو ١٩٨٦" لـە نووسـینی وریـا عمـر امـین. دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی.

## دووهەم: وشە لە ڕوانگەی واتا

مرۆڤ دەتوانێت بێژێت کە زمان لە هێما (لە وشەی یۆنـانی sema هـاتووە کـە واتـای هێمـا دەگـەیـەنێـت) پێکـدێت. هێمـا وەکـو دراوێکـە کـە دوو لای هـەبێـت. لایەکیان لە دەربڕین پێک دێت و بریتییە لە ژمارەیک فۆنێم یـان پیـت. لاکـەی تـر ناوەڕۆکە- ئەو واتایەی یان ئەو تشتەی کە هێماکە ئاماژەی بۆ دەکات. بـە گشتی زۆر جۆر هێما هەیە کە پشت بە ڕێژەی پەیوەندی سروشتییانەی نێـوان هێماکـانی دەربڕین و لایەنی ناوەڕۆکی دەبەستێت. هێماکـانی زمـانی بێجگـە نیـشانە symbols هیچی تر نین، ئەم ژی واتای ئـەوە دەگـەیـەنێـت کـە ئـەم پـەیـوەندییـە (لـە نێـو هێماکانی دەربڕین و ناوەڕۆک) خۆبەخۆیە (هەڕەمەکییـە). بـە جـۆرێکی تـر، هـیچ لێکچوونێکی فیزیکی لە نێوان دەربڕین و نـاوەڕۆک نییـە، بـۆ نمونـە ئـەسـپ پێـی دەگوترێت ئەسپ بە کوردی، Horse بە ئینگلیزی، häst بە سـویدی و حصان بـە عەرەبی.

هەڵبەت ئەم فیزیکە هەڕەمەکییە واتای ئەوە نابەخشێت کە مرۆڤ بـە ئـارەزووی خۆی ئەوەی کە خۆی دەخوازێت بە هەر تشتێک بێژێت. دەرئەنجـام ئـەگـەر مـن بـە "پـشیلە" بڵـێم "سـەگ" کـەس تێناگـات. پـەیـوەنـدیی نێـوان دەربـڕین و نـاوەڕۆک ڕێسایەکی جڤاکییە کە مرۆڤ فێری بووە بەڵام لە هەمان کات ناتوانێت بە ئاسانی لە دەرەوەی ئەم ڕێسایە گفتوگۆ بکات. فێربوونی زمان واتای فێربوونی گەلێک دەربـڕین دەگەیەنێت، هەروەها چۆن ئەم دەربڕینانە بە جۆرەها ناوەڕۆک پەیـوەسـت دەکـرێن. دیسان زمانی مرۆڤایەتی خاوەنی ئەو خەسڵەتانەیە کە وا دەکات هـەنـدێک هێمـا بـە هێمای تر پەیوەست بکرێن. ئەم دیاردەیەش لە زمانێک بۆ یەکێکی تر جودایە بـەڵام ئەمە تشتێکە کە ئێمەی زمانبەکارهێنەر فێری دەبین.

- دەریارەی واتا ئاماژە Reference

ئاساییانە زۆربەی هێماکان لە بوارێک دێنە بەکارهێنان بۆ ئەوەی ئاماژە بە تشتێک بدەن. ئاماژە بریتییە لە ئەو پەیوەندییەی کە هەیە لە نێوان ئەوەی کە گوتراوەو ئەو دیاردەیەی کە لە ژیان بوونی هەیە. قسەکەرێک کە دەبێژێت "ئەسپەکە لە مێرگەکە دەلەوەڕێت" ئاماژە بە ئەسپێکی دیاریکراو و مێرگێکی دیاریکراو دەدات. ئەم "ئەسپ" و "مێرگ"-ە ئاماژەپێکراوی هەردوو هێمای "ئەسپ" و "مێرگ"ن. ئەم دوو ئاماژەپێکراوەش لە ڕێگەی "لە" و"دەلەوەڕێت" لەگەڵ یەکتر گرێدروان. لە هەمان سات "ئەسپ"ەکە وەکو بکەری کردەوەیەکی دیاریکراو دەخرێتە بەرچاف (دەلەوەڕێت). بە شێوەیەکی بنەڕەتی قسەکەر، لە ساتی دەربڕین، دوو کرداری "*پەیوەندیگرتن*" بەرجەستە دەکات. یەکەم: قسەکەر ئاماژە بە یەکەیەک یان چەند یەکەیەک دەکات کە لە ژیان هەیە، هەروەها قسەکەر سیمای ئەو یەکە یان چەند یەکە نیشان دەدات ئەویش لە ڕێگەی ڕوانگەیەکەوە یان وەسفکردنی یان لە ڕێگەی پەیوەندیکردنی ئەم دووانە بە یەکتر. مرۆڤ دەکرێت ئەو هێمایانەی کە دێتە نێو باسکردن بۆ *ئاماژەپێکراو* و *وەسفکراو/پەیوەندکراو* دابەشبکات. ئاساییانە ناو nouns و جێناو pronoun بۆ ئاماژەپێکردن بەکاردەهێنرێت بەڵام ئاساییانە کردار verb، ئاوەڵناو adjective و ئامرازی پەیوەندی prepositions بۆ وەسفکردن یان/هەروەها بۆ پەیوەندیگرتن دێنە بەکارهێنان. هەرچۆنێک بێت باسەکە هێندە ئاسان نییە، چونکە هێمای "دەلەوەڕێت" ئاماژە بە کردارێک دەدات. بەڵام بەکارهێنانی هێمای "ئەسپ" وەسفی ئەو دیاردەیە دەکات کە لە ژیان هەیە و کە قسەکەر ئاماژەی بۆ دەکات. هەروەها لە بەکارهێنانی وشەی "ئەسپ" قسەکەر ئەو خەسڵەتانە دەخاتەڕوو کە تایبەتمەندن بە "ئەسپ" نەک "مانگا"، "سەگ" و هی تر!

ئاریشەیەکی تر کە یەکلاییکردنەوەی هێڵی نێوان ئامازە و وەسفکردن ئاڵۆز دەکات ئەوەیە کە هەمان هێما دەکرێت بە چەند شێوەیەک بێتە بەکارهێنان. ناوێکی وەکو "ئەسپ" دەکرێت وەکو ئامازە یان وەسفکراو بێتە بەکارهێنان. بەراوردی نێوان ئەم دوو ڕستە بکە: "ئەسپەکە لە مێرگەکە دەلەوەڕێت" و "ئەو ئاژەڵە کە لە مێرگەکە دەلەوەڕێت ئەسپە". "ئەسپەکە" لە ڕستەی یەکەم ئامازەپێکراوە بەڵام لە ڕستەی دووهەم وەسفکراوە.

هەندێک جار دەگوترێت کە ناوی زیندەوەر بە تەواوەتی هێمای ئامازەپێکراوە. بەڵێ ئەم ناوانە وەکو جۆرە ئێتیکێتێکە کە بە تاکی مرۆڤ و گیانلەبەر دەلکێنرێت. بەڵام تەنانەت ناو-یش پێکهاتەی وەسفکردن لەخۆ دەگرێت. شیرین، زیرەک، بۆرە ناو-ن. بەڵێ تەنانەت لەسەر بنەمای ناو، ئێمە دەتوانین گەلێک تشت دەربارەی ئامازە پێکراوەکە بێژین: شیرین ناوی ئافرەتە، زیرەک ناوی زەلامە، بۆرە ناوی سەگە.

هەندێک دەربڕین ئامازەپێکراوی نییە. مرۆڤ دەتوانێت بێژێت کە هەندێک هێما ئامازەپێکراوی نییە، چونکە ئەم هێمایانە دەستنیشانی یەکەیەک دەکەن کە لە ڕوانگەی هەستەکانی ئێمە بوونی نییە، بۆ نمونە دێو، درنج، خێو هتد. سەبارەت بە ئەم یەکانە دەکرێت مرۆڤ بێژێت کە "دێو، درنج و خێو" لە چیرۆکەکانی ئەفسانەیی بە دیمەنکراوە، لەوما/بۆیە ئەم هێمایانە دەکرێت ئامازە بە ئەم وێنانە بکات و یان بە ئەو وێنانەی کە لە فەنتازی هزری "خەیاڵی" ئێمە هەن. بێجگە ئەم جۆرە وشانە دەکرێت مرۆڤ باس لە چەندین یەکەی زانستی، وەکو یەکەکانی فیزیکی و ماتماتیکی، بکات کە ناکرێ لە ڕێگەی هەستەوە هەبوونیان بسەلمێنرێت بەڵام لە ڕاستیشدا هەن. ئێمە دەخوازین ئەوە بێژین کە چەمکی ئامازەدار بێگرفت نییە بەڵکو چەندین پرسیاری پڕپایەخی بواری

فەلسەفەی لێ دروست دەکرێ. ئێمە دەتوانین بڵێین کە زمانبەکارهێنەر زانیاری دەربارەی بەکارهێنانی ئەم جۆرە وشانە هەیەو مەبەستی بەکارهێنانیشیان دەزانێت. مەبەست لە ئاماژەدان بە ئەم جۆرە وشانە، وەکو **دێو و درنج**، بۆ خوێنەر بەجێدەهێڵین. واباشترە باس لە هەندێک وشەی تر بکرێ کە گرفتی کەمترە، وەکو **ئەسپ**.

**ئاماژەپێکراو و واتا**

با ئێمە باس لە ئەوە نەکەین کە زمانبەکارهێنەرێک لە ڕەوشێکی دیاریکراودا هێمایەک وەکو ئاماژەدانێک یان وەسفکردنێک بەکاردەهێنێت. با ئێمە بە تەنها باس لە خودی وشەکە بکەین، بۆ نمونە ئاماژەی "ئەسپ" چییە؟ وەڵامێکی سادە دەکرێ دەربارەی ئاماژەپێکردنەکە بێت، "ئەسپ" ئاماژە بە هەموو ئەسپ-ێک دەدات کە هەیە، کە هەبووە و کە لە داهاتوو دەبێت. وشەی "ئەسپ" ئاماژە بە گشت تاکەکانی ئەسپ دەکات و کە خاوەن خەسڵەتی گشتین ('زیندەوەرە'، 'ئاژەڵێکی دیاریکراوە'، 'چوار قاچە، 'دەزێت'، 'دەستەمۆدەکرێت' هتد.). بەڵام هەموو ئەسپەکان وەکو یەک نین، بەڵکو لە ڕوانگەی "ڕەگەز، قەبارە، ڕەنگ و هەندێک سیمای تر دێنە گۆڕین". ئەگەر لە دۆخێکی دیاریکراو وشەی "ئەسپ" ئاماژە بە "ئەسپ"ێکی دیاریکراو بدات، بۆ نمونە کە ناوی "ئەسپەڕەشە"-یە، ئەوا وشەکە تەنها واتای "ئەسپەڕەشە" دەگەیەنێت. بە ڤی ئاوایی ناکرێ بگوترێ کە وشەی "ئەسپ" واتای هەموو "ئەسپ"ێک یان بە تەنها "ئەسپەڕەشە" دەدات. ئەگەر ئێمە لە ڕوانگەی هزر-ەوە بڕوانینە وشەی "ئەسپ" ئەوا ناکرێت وا بیربکەینەوە کە زمانبەکارهێنەر مەبەستی ڕانە ئەسپێک[10]، یان تەنها ئەسپێک

[10] ڕەوە ئەسپ نەک ڕانە ئەسپ. (پیاچوونەوە)

بوویێت. بە پێچەوانەوە کە ئێمە لە ڕەوشێک ئاماژە بە ئەسپێک دەدەین، لەبەر ئەوەیە کە وشەی "ئەسپ" جۆرە واتایەکی هەیە، بەپێی ڕەوشەکە.

ئاماژەپێکراو و واتا هەمان تشت نین. هەمان هێمای ئاماژەپێکراو دەکرێت پتر لە یەک واتای هەبێت. ئێمە هێدی هێدی باس لە ئەم بابەتە دەکەین. لە ئێرە پێویست دەکات کە هەردوو وشەی ""دەربڕین' و "ئاماژەپێکراو (لە ئێرە بە دواوە پێی دەبێژین چەمک)" بۆ جارێکی تر ڕوونبکرێتەوە. مەبەست لە دەربڕین ئەو هێمایانەیە کە لە ڕێگەی پێکهاتەی دەنگ "فۆنێم" یان پیتەکان نوێنەرایەتی دەکرێن. مەبەست لە چەمک ئەو زانیارییانەیە کە بۆ نمونە لە ڕێگەی نابەرجەستەیی لێکچوون و لێکنەچوون سنوورداردەکرێت و دەخرێتە نێو تۆڕێک لە پەیوەندی وەکو بوونەهۆ-کاریگەری، بەش-تێکڕا یان ئارمانج-ئامراز.

## ناوکی چەمک و قەبارەی چەمک Intension and Extension of meaning

هەر دەربڕینێک بەرامبەر بە چەمکێک -ناوەڕۆکی چەمکێک- دەوەستێت intension مەبەست لە ناوەڕۆکی چەمک، ئەو دیاردە نەرییەتە هاوبەشانەیە کە بە چەمکەکە، بە ناوەڕۆکی چەمکەکە، گرێدراون. لینگویستەکان هەتاکو ئێستا لەسەر پێناسەی ناوکی چەمک پێکنەهاتوون، بەڵام بۆ تێگەیشتنی زیاتر دەکرێت بگوترێت کە ناوکی چەمک بە ئەو دیاردە هاوبەشانە دەگوترێت کە لە دووتوێی چەمکێکی دیاریکراو بەردەوام لە هزری زمانبەکارهێنەران چالاکدەکرێن. بە جۆرێکی تر دەربڕینەکە شوێنی لە نێو ئەو دیمەنە هزرییە هەیە کە زمانبەکارهێنەران هەیانە لەسەر ژیان.

مەبەست لە دەستەواژەی قەبارەی چەمک extension ئەو برە تشتەیە یان دیاردەیەیە ('تشت' یان 'دیاردە' دەبێت بە بەربڵاوترین شێوە بێتە تێگەیشتن) کە ڕێسایانە/نەریەتییانە چەمکەکە ئاماژەی بۆ دەکات. بە جۆرێکی تر:

ناوکی چەمک — چەمکەکە واتای چی دەگەیەنێت (ناوەڕۆکی چەمکەکە)

قەبارەی چەمک — چەمکەکە ئاماژە بەچی دەکات (ناوی تشتەکە)

لە ڕێگەی بیرکردنەوە لە ئەو خەسڵەتانەی، کە مەرجن، کە گرێدراوی تشتێکن و کە دەچنە نێو قەبارەی چەمکەوە ئەوا ئێمە دەتوانین ناوکی چەمک ڕوون بکەینەوە. ناوکی چەمک لە وشەی 'ژن' بۆ نمونە ئەمانەیە: 'زیندەوەر-ە'، 'مرۆڤ-ە'، 'مێ-یە' و 'پێگەیشتوو-ە'. ئەو مەرجانەی کە پێویستن بۆ ئەوەی X ژن بێت ئەوەیە کە X دەبێت مرۆڤ، مێ و پێگەیشتوو بێت. ئەگەر X تەنها مرۆڤ بێت واتای ئەوە ناگەیەنێت کە ژن-ە (پیاویش مرۆڤە)، ئەگەر X بە تەنها مێ بێت واتای ژن ناگەیەنێت (کەنیشک، کچ یان ئافرەتی کەم تەمەنیش مێ-ن). ئەو خەسڵەتانەی کە گرێدراوی ژن-ن جودایە لە ئەو خەسڵەتانەی کە گرێدراون بە پیاو و کەنیشک/کچ. بە ئەم جۆرە مرۆڤ دەتوانێت بەرەبەرە مەرجی زیاتر دابنێت بۆ ئەوەی پترتر دەستنیشانی ئەو خەسڵەتانە بکات کە بەندن بە ئەو تشتەو کە تێگەیشتن لە سەری سنووردارتر دەکات، بۆ نمونە 'جوانی' و 'باڵابەرزی' خەسڵەتی پێویست نین بۆ دەستنیشانکردنی ژن.

بە گشتی پەیوەندی نێوان ناوکی چەمک و قەبارەی چەمک هەڤدژە، ئەو کاتەی ناوکی چەمک زیاددەبێت قەبارەی چەمک کەمدەکات و بە پێچەوانە. چەمکی گوڵ لە ڕێگەی لێکدانی ئەم وشە لەگەڵ یەکێکی تر دێتە گۆڕین، بۆ نمونە لە وشەی گوڵەباخ. دەربڕینەکەی دواتر ئاماژە بە یەک جۆر گوڵ دەدات کە لە باخەکانی ماڵان یان باخەکانی گشتی شار و شارۆچکەکان دەبینرێت.

باخ خەسڵەتێکی نوێ دەدات بە چەمکی گوڵ و لە ڕوانگەی واتای زمانییەوە مەرجێکی پێویست و بەسە کە دەخرێتە سەر ناوکی چەمکی گوڵ. ئەمەش کاریگەریی لەسەر کەمکردنەوەی قەبارەی چەمک دادەنێت: گوڵەباخ جۆرێکە لە جۆرەکانی گوڵ. بە هەمان شێوە قەبارەی چەمکی گوڵ زیاترە لە نێرگز. قەبارەی چەمکی "گوڵ" گەورەیە چونکە هەموو جۆرە گوڵێک دەچێتە نێو ئەم قەبارەیەوە.

### واتای ڕەوشی Situationell meaning

هەندێک واتا دەتوانرێت گرێدراوی دۆخێک یان ئەو ڕەوشەی کە دەربڕینە زمانەوانییەکەی تێدا بەکاردەهێنرێت، بکرێ. دۆخی جیاواز پلەی جیاوازی فەرمییەتی هەیە، هەربۆیە داوای دەربڕینی زمانەوانی جیاواز دەکات. مرۆڤ بە ئەمە دەڵێت "شێوازی واتا". مرۆڤ ئاماژە بە جۆرەها ئاستی شێوازی واتا دەکات وەکو ئەرکێک بۆ پلەی فەرمییەتی ئەو دۆخە، بۆ نمونە ڕۆژانە، بازاڕی، فەرمی. هەندێک هۆکاری تر کە بتوانێت کاریگەری لەسەر شێواز دابنێت بابەتە، کەناڵی دەربڕینە (قسە یان نووسین)، دەڤۆک یان شوێنی جوگرافی هتد. نمونەی دەربڕین بە چەندین شێواز: منداڵ، مناڵ، زاڕۆک، ڕۆڵە.

### پەیوەندییەکانی وشە words relations

ئاساییە کە وشەیەکی سادە چەندین واتای هەبێت، بە جۆرێکی تر باس لە فرەواتایی یان ناڕوونی واتا دەکرێت. بە گشتی لینگویستەکان جیاوازی لە نێوان دوو جۆر لە فرەواتایی دەکەن: وشەی جیاواز بە هەمان شێوە بێژان دەکرێت یان بە هەمان پیت دێنە نووسین، هەروەها کە وشەیەک پتر لە یەک واتای هەبێت. ئێمە لە

ئێره هەوڵ دەدەین باس لە ژمارەیەکی کەم لە پەیوەندییەکانی نێوان دەربڕینی وشە- شێوەی وشە- و پەیوەندییەکانی نێوان واتای ناوەڕۆکی وشە ڕوونبکەینەوە.

### پەیوەندیی شێوەیی

هەندێکجار بە ڕێکەفت پتر لە یەک وشە بە هەمان شێوە دەگوترێت، هاوبێژان (Homophone) و دەنووسرێ، هاوشێوە (Homograph). بۆ نموونە *کار، گاز، خاڵ*. <u>کار</u> بە واتای ئیش و بێچووی بزن دێت، <u>گاز</u> بە واتای جۆرێک سوتەنی، کەرەستەیەکی کارکردن، گەستن دێت، هەروەها <u>خاڵ</u> بە واتای برای دایک، نیشانەی کۆتایی ڕستە، یان نیشانەی سەر پێست یان ڕووی مرۆڤ دێت.

### پەیوەندیی واتایی

ئاشکرایە کە لە زماندا وشەی ناوەڕۆکی (بڕوانە بەشی دواتر) چەندین پەیوەندی ناوەڕۆکی لەگەڵ یەکتر هەیە. ئەم دیاردەیەش بەشێکی گرنگ لە بابەتی واتایی یان سیمانتیک پێکدەهێنێت. دوو جۆر لە ئەم پەیوەندییانە هاوواتایی و دژەواتاییە:

- **هاوواتایی** Synonym

کاتێک دوو وشە هەمان یان نزیکەی هەمان واتایان هەیە بۆ نموونە:

کەنیشک، کچ، کیژ و دوێت

مەت، پوور، پلک و میمک

هاوواتایی ئەو چەمکانەش کە پتر لە یەک وشە دەخوازێت دەگرێتەوە بۆ نموونە:

بە ئەم شێوەیە، بە ئەم جۆرە، بە ڤی ئاوایی

هەندێکجار هاوواتای وشەیەک بە دوو یان زیاتر وشە دەبێت یان بە پێچەوانـە، بـۆ نموونە: نمازە، بە تایبەتی، نەخاسمە

- دژەواتایی

زۆرێک لە وشەکان، بەڵکو تەنانەت زۆر دەربڕین کـە پتـر لـە یـەک وشـە پێـک دێت، بەپێی پلەی جیاوازی پێچەوانەیی پەیوەندییان لەگەڵ یەکتر هـەیـە. پانتـایی واتایی خودی وشەی پێچەوانە، بەروڤاژ یان دژ یان بەرامبەر بـەرفراوانـەو دەکرێـت بە جۆرەها شێوە بێتە لێکدانەوە. دابـەشـکردنێکی سـەرەتاییانـە دەکـرێ بـاس لـە پلەی پێچەوانەیی antonymy و پێچەوانەی تـەواو complemntarly بکـرێ. هـەڵبـەت ئەم دەربڕینانە تاکو ڕادەیەکـی زۆر لـە لایـەن زمانبـەکارهێنـەران لێتێکـەیشتراون. درێژ و کورت پێچەوانەی پلەدارن، چونکە ئەم دوو وشەیـە پلـەی واتاییـان هـەیـەو دەکرێ درێژتر یان کورتتر بکرێنەوە: *درێژ — درێژتر — درێژترین* هـەروەهـا *کـورت — کورتتر — کورتترین*.

پێچەوانەی تەواو دەربارەی دوو وشەیە کە تەواو پێچـەوانـەی یـەکتـرن لـە ئـەو بوارەی کە ئەم دوو وشەیەی تێدا بەکاردەهێنرێت:، بۆ نموونە: مـردوو × زینـدوو، بینراو × نەبینراو، یاسایی × نایاسایی، ڕاست × چەپ.

## وشەی کۆتایی

ئێمە لە ئەم بەشە زۆر بە کورتی باسی واتاسـازیی یـان سـێمانتیک-مـان کـرد. لە ڕاستیدا وشەکانی فەرهەنگی بە گەلێک جۆر پەیوەندییان لەگەڵ یـەکتـر هـەیـەو بە گەلێک جۆر لەگەڵ یەکتر پـەیـوەسـتدەکرێن، لـە هـەردوو ڕوانگـەی دەربـڕین و واتا-وە. هۆکاری ئەوەی کە ئێمـە زۆر بـە کـورتی و زۆر بـە سـادەیی باسـی ئـەم

بابەتەمان کردەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئارمانجی کتێبەکە. من باسم لە ئەو بەشانەی بابەتی سیمانتیک کردووە کە پێویستە بۆ ئەم کتێبە.

## سێهەم: وشە لە ڕوانگەی ڕێزمان

بە گشتی وشەکانی زمان بەپێی گەردانکردن (ڕۆنان)، ئەرکی ڕێزمانی لە گرێ و ڕستە و واتا دابەش دەکرێن. ئەم سێ خاڵە مەرجی بنەڕەتین بۆ دابەشکردنی وشەکانی زمان بۆ پۆلە وشە. هۆکارێکی سەرەکی دابەشکردنی پۆلەوشە توانای گەردانکردن یان گەردانەکردنی وشەکانە. وشە گەردانکراوەکان بریتیین لە: ناو، جێناو، ئاوەڵناو، ژمارە، کردارو ئاوەڵکردار. وشە گەردان نەکراوەکان بریتیین لە: **ئامرازی یەکگرتن، ئامرازی گەیەنەر،ئامرازی پێشبەند و ئامرازی جارِدان** [11].

وشەکانی زمان یەکلاکەرەوانە دابەش ناکرێنە سەر چەند پۆلە وشەیەکی جوداجودا. وشە هەیە کە لە هەندێک ڕەوش یان ڕستە سەر بە یەک جۆر پۆلە وشەیە بەڵام لە هەندێک ڕەوش یان ڕستەی تر دەبن بە جۆرێکی تر لە پۆلە وشە، بۆ نموونە وشەی "هێمن" لە ئەم سێ ڕستەیە سەر بە سێ پۆلە وشەی جیاوازە:

هێمن کوڕێکی زیرەکە. ناو

ئازاد منداڵێکی هێمنە. ئاوەڵناو

ئازاد بە هێمنی دەڕۆیشت. ئاوەڵکردار

بێجگە لە ئەوەی کە زۆرێک لە وشەکانی زمان لە یەک جۆر پۆلە وشە بۆ یەکێکی تر، بەپێی کۆنتێکست، ئاڵوگۆڕ دەکەن ئەوا هەر پۆلە وشەیەکیش

---

[11] بۆ بەراوردکردن بڕوانە د. ئەوڕحمانی حاجی مارف (١٩٧٩:١٢) بەرگی یەکەمی کتێبی ڕێزمانی کوردی.

بەسەر چەند لق و چڵ-دا دابەش دەبن (دواتر لە باسی هەر پۆلە وشەیەک باسی ئەم لق و چڵ-انە دەکرێت).

گەردانکردن ئەو گۆڕانکارییە سیستەماتیکیانەیە کە بەسەر زۆربەی وشەکانی زمان ئەنجام دەدرێت ئەویش بەپێی ئەرکی ڕێزمانی یان واتا. گۆڕانکاری بەپێی ئەرکی ڕێزمانی بۆ نموونە بڕوانە وشەی شار:

شار چۆڵ بوو.

من/ئێمە شارەکەم/شارەکەمان خۆش دەوێت.

شارەکەی تۆ ناوی چییە؟

مەندەلی شارێکی بچوکە.

بێجگە لە ئەو گۆڕانکارییانەی سەرەوە ئەوا وشەی شار لەگەڵ هەندێک وشەی تر یەکدەگرێت و وشەی لێکدراوی نوێ دروست دەکات کە دەبێت بە گۆڕینی واتای وشەکە:

شاربازێڕ، شارەزوور، شارەوشار، شارەوانی، شارەبان، شارۆچکە، شارەدێ هتد.

لە هەمبەر ئەمە هەندێک وشەی زمان هەن، کە ژمارەیان سنووردارەو گەردان ناکرێن، بۆ نموونە: لە، کە، بۆ، هەی، هەتاکو، هەروەکو، ل دوی، ژ بۆ، هەک، هەیها، دەک، وای، بابۆ، هۆ، ئێ.

ئاشکرا دیارە ئەو وشانەی گەردان دەکرێن واتادارن (شار، پشیلە، ئەسپ) بەڵام ئەو وشانەی کە گەردان ناکرێن واتایەکی ڕوونیان نییە (*لە، بۆ، هەتاکو*). بۆ دەستنیشانکردنی ئەم جیاوازییە ئەوا مرۆڤ باس لە وشەی واتادار (وشەی ناوەڕۆکی) Lexical words, Content words و وشەی فۆڕمی، وشەی ئەرکی یان وشەی ڕێزمانی Functional words, Form wrods or Grammatical words دەکات.

بۆ نموونە لە گرێی ئازاد لە کار ئەوا هەردوو وشەی (ئازاد و کار) کە واتایان

هەیە بەهۆی وشەی (لە) کە بێ واتایە گرێ دەدرێت، هەروەها لە گرێی کچ و کوڕ ئەوا ئامرازی یەکگرتنی (و) ڕۆڵی گرێدانی ئەو دوو وشە واتادارە دەگرێتەخۆ. بە ئەم جۆرە ئامرازی پێشبەند (لە) و ئامرازی یەکگرتنی (و) ڕۆڵی ڕێزمان دەبینن لە زمان.

جیاوازییەکی تری گرێدراو لە نێوان وشەی ئەرکی و وشەی واتایی جیاوازییەکانی نێوان پۆلە-وشەی کراوە و پۆلە-وشەی داخراوە. پۆلە-وشەی کراوە ئەو جۆرە وشانەن کە بەردەوام لە زماندا زیاد دەبن ئەویش لە ڕێگەی دیاردەی نوێ، نمازە بەهۆی ڕۆنان، پێشگر و پاشگر، لێکدان و قەرزکردن. ئاساییترین پۆلەوشەی کراوە ئەمانەن: ناو، ئاوەڵناو و کردار. پۆلەوشەی داخراو بە ئەو جۆرە پۆلە وشانە دەگوترێت کە تێکڕای ژمارەی وشەکانیان لە لیستێک کۆدەکرێتەوە، واتە وشەکان سنووردارە. پۆلەوشەی داخراو بە دەگمەن یان هەرگیز وشەی نوێ وەرناگرن. ئاساییترین پۆلەوشەی داخراو ئەمانەن: ئامرازی پێشبەند، ئامرازی یەکگرتن و هەروەها هەندێک جۆر لە ئاوەڵفرمان.

| وشەی واتادار/فەرهەنگی یان وشەی ناوەڕۆکی<br>Lexical words or Content words | | وشەی ئەرکی، وشەی فۆڕمی یان وشەی ڕێزمانی<br>Functional words, Form wrods or Grammatical words | |
|---|---|---|---|
| ١. ناو | ئازاد، شار، مهاباد ... | ١. ئامرازی یەکگرتن | و، لەگەڵ، بەڵام... |
| ٢. کردار | کرد، نووست، هەستا | ٢. ئامرازی گەیەنەر | چونکە، کە، لەبەر ئەوەی |
| ٣. ئاوەڵناو | تاڵ، فێڵباز، دلۆڤان... | ٣. ئامرازی پێشبەند | ژ، لە، بۆ ... |
| ٤. ئاوەڵکردار | بێگومان، ب لەز، هێدی هێدی ... | ٤. ئامرازی سەرسوڕمان! | ئاخ، حەیف، هەی هەی |
| ٥. جێناو | ئەز، ئێوە، ئەو ... | | |
| ٦. ژمارە | یەک، شێست، سەد ... | | |

وێنەی ١٥ . وشەی ناوەڕۆکی و وشەی ئەرکی/ڕێزمانی.

## یەکەم: وشەی ناوەڕۆکی

### ١. ناو/ناڤ Nouns

ناو لە ڕوانگەی واتا بە ئەو وشەیەیە دەگوتریت کە ئاماژە بە، بۆ نمونە زیندەوەر، شمەک، دیاردە دەدات. بە شێوەیەکی سەرەکی ناو دابەش دەکرێت بەسەر ناوی بەرجەستە concret، ناوی نابەرجەستە abstract و ناوی تایبەت:

— **ناوی بەرجەستە**: بە ئەو جۆرە ئاماژانە دەگوترێت کە دەربڕین لە بوونی فیزیکی تشتێک دەکەن و لە ڕێگەی هەست پەی پێ دەبرێت، وەکو *ئاگر، مێز، ئاو، منداڵ، دەنگ، با*. ناوی بەرجەستە بەسەر ناوی چەشن، ناوی مادی و ناوی کۆمەڵ دابەشدەکرێت:

- **ناوی چەشن** ئاماژەدان بە زیندەوەر یان شمەک، وەکو *سەگ، کتێب، مێز، کورسی* هتد.
- **ناوی مادی** ئاماژە بە ژمارەیەکی نادیاریکراوی مادەیەک دەدات، وەکو: *زێڕ، ئاو، هەوا*، پەنیر، هتد.
- **ناوی کۆمەڵ** ئاماژە بە کۆمەڵێک لە شمەک یان زیندەوەر دەدات کە وەکو یەکەیەک لە لایەن زمان هەڵدەسەنگێنرێت، وەکو: *خێزان، دانیشتوان، مێروولە* هتد.

— **ناوی نابەرجەستە**: بە ئەو جۆرە ئاماژانە دەگوترێت کە دەربڕین لە هەندێک دیاردە دەکەن کە بوونی سەربەخۆی نییە وەکو:

- **خەسڵەت**: وەکو *هێز، باوەڕ، خەم، شەرم، هۆش*.
- **کردار**: وەکو *دزی، یاری*، جەنگ.
- **ڕەوش**: وەکو *شەڕ، ئاشتی، هێمنی، پەرێشانی، نەخۆشی*.

— ناوی تایبەت: بە ئەو جۆرە ئاماژانە دەگوترێت کە وەکو نیشانە دەلکێندرین بە زیندەوەر و دیاردەی تاک تاک. ناوی مرۆڤ (ئازاد، پەروین)، ناوی شار (دەرسیم، کرماشان)، هەروەها ناوی شەقام، گەڕەک، کۆمپانیا، دەریا، تاڤگە، ڕووبار، ڕووداوی مێژوویی و کەلتووری هتد.

ناو زۆرترین وشەکانی زمان پێکدەهێنێت. ڕێژەی وشەی ناو لە تێکست (دەقی نووسراو یان قسە) لە نێوان ١٠ تاکو ٣٠% دەبێت [١٢]. ڕێژەی زۆری ناو لە ئەو تێکستانە هەن کە سیماو خەسڵەتی زمانی نووسیان هەیە بەڵام لە ئەو تێسکتانەی کە نافەرمی و ڕەنگدانەوەی زمانی قسەن ئەوا ناو کەمتر دێتە بەکارهێنان. دیسان ناو بەشی دیارو بەرچاوی تێکست پێکدەهێنێت.

## ٢. کردار verbs

کردار، وەکو ناو و ئاوەڵناو و ئاوەڵکردار، یەکێکە لە پۆلە وشە کراوەکان. لە زمانی کوردی دروستکردنی کرداری نوێ ئاسانە، بۆ نمونە بە یارمەتی ناو وەکو، *دەستبڕین، شەرکردن، پێگرتن*، بە یارمەتی ئاوەڵناو وەکو، *سووربوون، بڵندکردن، شیرینکردن*، و بە یارمەتی ئاوەڵکردار وەکو، *کێم بوون، دەرکردن، کەم بوون*. کردار لە تێکست لە نێوان ١٥% تاکو ٢٠% ی وشەکان پێک دەهێنێت. ڕێژەی بەرزی ژمارەی کردار، لە سەرووی ٢٠%، نیشانەی زمانی قسەکردن دەدات، بەڵام ڕێژەی کەمی کردار، لە ١٥% تاکو ١٦%، واتای زمانی نووسین دەدات [١٣].

[12] لە زمانی سویدی، بڕوانە (Hultman. Torg G. 2003:44).

[13] لە زمانی سویدی، بڕوانە (Hultman. Torg G. 2003:40).

### کرداری سەرەکی

کردار لە چوارچێوەی واتاکەی بە ناوکی ئەو دەربڕینە دادەنرێت کە بەیانی:

- کردارێک دەکات کە یەکێک/کەسانێک دەیکات/دەیکەن:

*ئازاد نان دەخوات*.

- ڕوودانی تشتێک دەکات: *یارییەکە دەستپێکرد*.
- دۆخی یان باری تشتێک دەکات: *تابلۆکە جوانە*.

ئەو سیما تایبەتمەندەی کە تەنها پەیوەستە بە کردار، کە دەستنیشانکردنی دۆخی دەمی کردار دەکات، پێی دەگوترێت گەردانکردنی دەمەکان/کاتەکان. دیسان کردار بەپێی هەندێک سیمای تر وەکو، کەسی یەکەم، دووهەم و سێهەم لە هەردوو دۆخی تاک و کۆ، گەردان دەکرێ. لە زمانی کوردی چاوگی کردار بەپێی دەستنیشانکردنی دەمی کردار، بۆ نمونە ئێستا، ڕابردوو و داهاتوو، بەپێی کەسی یەکەم، دووهەم و سێهەم لە هەردوو دۆخی تاک و کۆ گەردان دەکرێت. لە ڕووی دارشتن دەکرێت بکەری کردار دیار بێت یان نادیار بە ئەمەش دەگوترێت شێوەی کارا یان شێوەی ناکارا active form or passive form.

لە شێوەی ناکارا:

| چاوگ | ڕابردوو (بۆری) | داهاتوو/دێتە+چاوگ |
|---|---|---|
| ڕژان | ڕژا | دەڕژێت/دێتە ڕژان |
| پسان | پسا | دەپسێت/دێتە پسان |
| سووتان | سووتا | دەسووتێت/دێتە سووتان |

لە شێوەی کارا:

| چاوگ | دەمی ڕابردوو کەسی ۱، ۲، ۳ (تاک/کۆ) | دەمی داهاتوو کەسی ۱، ۲، ۳ (تاک/کۆ) |
|---|---|---|
| ڕژان | ڕژاندم، ڕژاندت، ڕژاندی | دەڕژێنم، دەڕژێنیت، دەڕژێنێت |
| | ڕژاندمان، ڕژاندتان، ڕژاندیان | دەیڕژێنین، دەیڕژێنن، دەیڕژێنن |
| چوون | چۆم، چۆی، چۆ | بچم، بچی، بچیت |
| | چۆن، چۆن، چۆن | بچن، بچن، بچن |

**کرداری یاریدەدەر auxilary verbs**

هەندێک جۆر کردار هەیە کە بە تەنها یان سەربەخۆ ناتوانێت بەیانی کردەوە، ڕووداو یان دۆخ بکات لە دەربڕین. ئەم کردارانە یارمەتی کرداری تر دەدەن کە لەگەڵیان بەشێک لە ڕستە پێکدەهێنن. بە ئەم کردارانە دەگوترێت کرداری یارمەتیدەر، بۆ نموونە ئەم کردارانە (لەگەڵ بەرامبەرەکەی بە ئینگلیزی):

- تۆ دەبێت نان بخۆیت. تۆ دەبا نانت خواردبا. must
- تۆ دەتوانیت نان بخۆیت. تۆ دەتتوانی نان بخۆیت. can
- تۆ دەتەوێت نان بخۆیت. تۆ دەتویست نان بخۆیت. want
- تۆ دەخوازیت نان بخۆیت. تۆ دەتخواست نان بخۆیت. will
- ئەم گرفتە دەکرێ چارەسەر بکرێ. ئەم گرفتە دەکرا چارەسەر کرابا. can
- ئەم گرفتە دەتوانرێ چارەسەر بکرێ. ئەم گرفتە دەتوانرا چارەسەر کرابا. can
- ئەم گرفتە پێدەچێت/دەشێت چارەسەر بکرێ. ئەم گرفتە پێدەچوو چارەسەر کرابا. may

کرداری یاریدەدەر، هەرچەندە کەمن/کێمن لە ژمارە، بەڵام ڕۆڵی گرنگیان هەیە بۆ ئەوەی قسەکەر لە ساتی ئاخافتن دەربڕینی وەکو، ویست، حەز، ئەگەر، ڕێگەپێدان، ناچارکردن و پێویستی بۆ ڕەوشی کرداری سەرەکی دابنێت. هەروەها ئەم کردارانە ڕۆڵی زۆر دەبینن بۆ فێربوونی زمانی دووهەم، چونکە زۆر بەکاردەهێنرێن و ڕۆڵی گرنگ دەبینن لە ئاخافتنی ڕۆژانەو بابەتی نووسین.

هەڵبەت هەموو کردارەکانی یارمەتیدەر بەپێی دەمەکانی کردارو کەسی یەکەم، دووهەم و سێهەم و هەروەها بەپێی تاک و کۆ بە شێوەی جیاواز گەردان دەکرێن! ئەم باسە لە ئەم کورتە ڕوونکردنەوەیە بەرفراوانترە بەڵام بۆ مەبەستی کتێبەکە بەسە.

سەبارەت بە کردار دەتوانرێ زۆر بنووسرێ، بەڵام ئێمە لە ئێرە کۆتایی/دوماهی بە باسەکە دەهێنین. ئەم کتێبە ئاماژە بە کردار دەدات وەک جۆرێک لە پۆلە-وشە، کە زۆر گرنگە لە ڕوانگەی واتاسازی و دارشتنی ڕێزمانی و تێگەیشتن بۆ ئەو دەربڕینانەی کە دێنە بەرهەمهێنان و بیستن.

## ٣. ئاوەڵناو/ئاوەڵناڤ Adjective

ئاوەڵناو بە ئەو وشانە دەگوترێت کە بەیانی چۆنیەتی، خەسڵەت و نیشان و وابەستەیی کەسێک یان تشتێک دەکەن. لە ڕوانگەی دەربڕین ئاوەڵناو خەسڵەتەکانی ناو یان جێناو لە ڕستە دیاردەخات.

- ئاوەڵناوی چۆنیەتی: خەسڵەتی کەسێک یان تشتێک دیاردەخات وەکو، سەوز، هشک، ترش، پاکژ، ڕەزیل، بەرین، ئازا، نەبەرد، زراڤ، چالاک، تەمبەڵ، خوڕت هتد.
- ئاوەڵناوی وابەستەیی بۆ کۆمەڵێک یان توخمێک، وەکو؛ کوردی، فەرەنسی، کرمانجی، ئەفریقی، دهۆکی، زستانی، گوندی، پۆلایی، دەشتەکی، پیاوانە، منداڵانە هتد. ئەم جۆرە ئاوەڵناوانە لە ڕێگەی پاشگرەوە دروست دەبن.

ڕێژەی ئاوەڵناو لە تێکست نزیکە ٥% تاکو ١٠% وشەکان دەبێت[١٤]. لە زمانی کوردی، وەکو زۆربەی زمانەکانی تر، دەکرێت هەردەم ئاوەڵناوی نوێ

---

[14] لە زمانی سویدی، بڕوانە (Hultman. Torg G. 2003:76).

پلە: زۆر، کەم/کێم، فرە، هێجگار.

پەیوەندی لۆجیکی: چونکە، لەبەرئەوەی، ژ بەرکو، بە ئەنقەست.

هەڵوێست نیشاندان: بەخۆشییەوە، بەزەردەخەنەوە، بەگریانەوە.

دڵنیایی: هەڵبەت، بێگومان، بێ سێ و دوو، بێ چەند و چوون.

دووبارەکردنەوە: دووبارە، دیسان، هەروەها.

نەفی: هەرگیز، تووجار، بە هیچ جۆرێک، بە هیچ شێوەیەک.

بە شێوەیەکی سەرەکی ئاوەڵکردار ئاماژە دەدات بە:

١. کردار: ئازاد زۆر دەخوات.

٢. ئاوەڵناو: ئازاد زۆر جوان دەخوات.

٣. ئاوەڵکردار: ئازاد زۆر بەخێرایی دەخوات.

٤. ڕستە: ئازاد هەردەم دەنووسێت. (دەکرێت بگوترێت ئاوەڵکرداری ڕستەیی).

ئاوەڵکردار لە ڕوانگەی واتاوە دەکرێت بە دوو دەستە:

دەستەی یەکەم: وشەکان دەربڕینێکن بۆ واتای کات، شوێن، شێوە، هۆکار، چەندایەتی و چۆنیەتی. ئەم دەستە ئاوەڵکردارە وەڵامی پرسیارەکانی کەی، کوێ، لە کوێ، لە کوێوە، بۆ کوێ، چۆن، بۆچی، چەند، تاکو چی ڕادەیەک دەداتەوە.

کات: ئەودەم، ئێستا، هەنووکە، دواتر، هەرئێستا، دوێنێ، ئەمساڵ، هەمیشە/هەردەم، هەرگیز/تووجار، هتد.

شوێن: ئێرە، ئەوێ، لە ماڵ، دەرەوە، ژوورەوە.

شێوە: خێرا، هێدی، باش، بەژیری، لەسەرخۆ، یەکسەر، هەرڕۆژ، دەستبەجێ، بە یەکجاری هتد.

**هۆکار:** بۆیه/لەوما/لەوڕا، چونکە، لەبەرئەوە، بە ئەنقەست، ئەگینا هتد.

**چەندایەتی:** زۆر، فرە، گەلێک، یەکجار، پڕ، پیچەک، نەختێک، تۆزێک هتد.

**چۆنیەتی:** پێکڤە، بە دووقۆڵی، مەردانە، منداڵانە، دەبەنگانـە، ژیرانـە، جـەسـورانە هتد.

دەستەی دووهەم: ئەو جۆرە وشانەن کە وابەستەی هەموو ئەو ڕستەیـە دەبـن کـە تێی کەوتوون، وەکو:

**ئاوەڵکرداری نەفی:** بە دەگمەن، هەرگیز، بە هیچ جۆرێک.

**ئـاوەڵکـرداری هـەڵوێـست هـەڵگـر:** بێگومـان، بـەدڵنیاییـەوە، نـەخاسـمە، نمـازە، هەڵبەت، لەوانەیە، ئاساییانە، بەداخەوە، مخابن هتد.

**ئاوەڵکرداری گرێدانی تێکستی:** هـەروەهـا، بـە ئـەم شـێوەیـە، بـە پێچـەوانـەوە، هەرچۆنێک بێت، هەر چەوا بیـت، بێجگـە لـە ئـەوە، لـە ڕاسـتیدا، لـە بـەرامبـەردا، هەرچەندە، ئینجا، تەنانەت، بە لایەنی کەمەوە هتد.

## ٥. جێناو/جێناڤ Pronoun

جێنـاو دەچێتـە خانـەی پۆلـەوشـە داخـراوەکـان. دەستنیـشانکردنی سـنووری جێناو لەگەڵ پۆلەوشەکانی تر، ناو، ئاوەڵناو، ئـاوەڵفرمـان و وشـەژمـارە، کـارێکی پڕ گرانە. هەر لەبـەرئـەمـەشـە ناکرێـت دەستنیـشانی ژمارەی جێنـاوەکـانی زمـان بکرێت. هەرچۆنێک بێت ئەم ژمارەیە سـنووردارە[١٥]. جێنـاو بـەسـەر دوو کۆمـەڵـەدا دابەشدەکرێت:

١. جێناوی ناویی:

[15] بۆ نمونە لە تێکڕای وشەکانی زمـانی سـویدی ژمـارەی جێنـاوەکـان لـە ٢٠٠ وشـە کـەمتـرن (Hultman. Torg G. 2003:44).

گەردانکردن: لە شێوەی کارا subject و بەرکاردا object (لـە ک.ژ.) (ئـەز-مـن، تۆ-تە)، لە شێوەی ژمارە (من-ئێمە، ئەو-ئەوان).

واتا: واتایەکی کەمی هەیە و ئاساییانە جێگەی ناو دەگرێت.

٢. جێناوی ئاوەڵناویی:

گەردانکردن: شێوەی ژمارە وەکو (ئەمە-ئەمانە/ئەڤە-ئەڤانە).

واتا: واتای کەمی هەیە، واتاکەی لە چوارچێوەی ئـەو کۆنتێکستەی کـە تێیـدا هاتۆتە بەکارهێنان، دیارە، زیاتر جێگەی ئاوەڵناو دەگرێتەوە، بۆ نموونە:

ئەفسەرە سەرسپییەکە پرسیاری کرد. هەمان ئەفسەر پرسیاری کرد.

لە تێکست ژمارەی بەکارهاتووی جێنـاو ڕۆڵـی گرنـگ دەبینێـت. زۆر بـەکارهێنـانی جێنـاو واتـای زمـانی قـسەکـردن یـان زمـانی نافـەرمـی دەگرێتـەوە بـەڵام کـەم بـەکارهێنـانی جێنـاو واتـای بـەکارهێنـانی زمـانی زمـانی نووسـین یـان زمـانی فـەرمـی دەگرێتەوە[١٦].

گەردانکردنی جێناو، لکاندنی بە وشـەی تـر، لـە زمـان کـارێکی پـڕ کێـشەیـەو ناتوانرێ بە شێوەیەکی سیـستەماتیکییانـە بـەدیمـەن بکرێـت[١٧]. هـەرچۆنێـک بێـت ئێمە لە ئەم پەرتووکە جێناو بـەپێـی واتاکـەی بـۆ سـێ کۆمـەڵ دابـەشدەکـەین: جێنـاوی دیـار Difinite pronoun، جێنـاوی پرسـیاری Interrogative pronoun و جێناوی چەندایەتی Quantitve pronoun .

## یەکەم: جێناوی دیار

جێناوی دیار دەستنیشانی دیاردەیەک دەکات کە دەتـوانرێ تایبـەتمـەندانـە لـە دۆخی قسەکردنێـک یـان لـە چوارچێـوەی نووسـینێک دیـاری بکرێـت. ئـەم جـۆرە

---

[16] لە زمانی سویدی ڕێژەکە لە نێوان ١٥ تاکو ٢٥% دایە (Hultman. Torg G. 2003:90).

[17] لە ئێرە ئەم بابەتە نایەتە باسکردن.

جێناوه له ڕێگەی ئامارژه به دۆخی قسەکردنێک (جێناوی ئامارژەدان/دەستنیشانکردن deictisicts pronoun) یان ئامارژه به تشتێک له نووسیندا (جێناوی ئامارژەبەدوا anaforisic pronoun) دیاریدەکرێت.

جێناوی ئامارژەدان زیاتر جێناوی کەسی یەکەم (من/خۆم، ئێمە/خۆمان) و جێناوی کەسی دووهەم (تۆ/خۆت، ئێوە/خۆتان) دەگرێتەوە کە مەبەست قسەکەر خۆ-یەتی یان ئەو کەسەی کە قسەکەی ڕووبەڕوو دەکرێت. هەڵبەت لە دەمی قسەکردن من و تۆ زانراوە. تەنانەت جێناوی دیار ئاراستەی "کەسی سێهەم"یش دەکرێت، واتە ئاراستەی کەسێکی یان تشتێکی تر بێجگە لە قسەکەر یان ئەو کەسەی کە قسەی ئاراستە دەکرێت، بۆ نموونە ئەو، ئەوان، ئەڤ، ئەوە، ئەوی.

یەکەم: جێناو لە دیالێکتی کرمانجی خواروو:

| ژمارە | کەس | جێناوی کەسی .personal pron | جێناوی خۆیی .reflexive pron |
|---|---|---|---|
| تاک | یەکەم | ئەز، من، ئەمن | خۆم |
| | دووهەم | تۆ، توو، ئەتۆ، ئەتوو | خۆت |
| | سێهەم | ئەو | خۆی |
| کۆ | یەکەم | ئێمە، ئەمە، مە | خۆمان |
| | دووهەم | ئێوە، ئەنگۆ | خۆتان |
| | سێهەم | ئەوان، وان | خۆیان |

وێنەی ١٦. جێناو لە ک.خ.

دووهەم: لە دیالێکتی کرمانجی ژووروو. جێناوەکانی کەسی لە هـەردوو دۆخـی کاراو بەرکار.

| ژمارە | کەس | جێناوی کەسی | | جێنـــــاوی خۆیی |
|---|---|---|---|---|
| | | دۆخی کارا Nominative case | دۆخی بەرکار Accusative case | |
| تاک | یەکەم | ئەز | من | خۆ |
| | دووهەم | تو، تۆ، ئەتو، توو | تە | خو |
| | سێهەم | ئەو | ئـــەوی/وی (نێـــر)، ئـــەوێ/وێ (مێ) | خو |
| کۆ | یەکەم | ئەم | مە | خو |
| | دووهەم | هـــوین، هنـــگ، هـــین، هوون، هونک | وە، هەوە، هونگە | خو |
| | سێهەم | ئەو، ئەوان، وە | ئەوان، وان | خو |

وێنەی ١٧ . جێناڤ لە ک.ژ.

### جێناوی نیشانە Demonstrative pronoun

چەمکی نیشانە بە واتای ئاماژەی ڕاستەوخۆ دێت. ئەم نیشانەی ڕاسـتەوخۆیـە بە ئاشکرا لە دەمی قسەکردن و ئاماژە بەدواوە دیارە.

یەکەم: لە دیالێکتی کرمانجی خواروو:

| پانتایی | تاک | کۆ |
|---|---|---|
| نزیک | ئەم، ئەمە | ئەمان، ئەمانە |
| دوور | ئەو، ئەوە | ئەوان، ئەوانە |

وێنەی ١٨ . جێناوی نیشانە لە ک.خ.

دووهەم: لە دیالێکتی کرمانجی ژووروو:

| پانتایی | تاک | کۆ |
|---|---|---|
| نزیک | ئەڤ، ئەڤە | ئەڤان، ئەڤانە |
| دوور | ئەو، ئەوە | ئەوان، ئەوانە |

وێنەی ١٩. جێناڤی نیشانە لە ک.ژ.

لە کرمانجی ژووروو جێناوی نیشانە هەندێک فۆڕمی تری هەیە وەکو: ئـەوی، وی، ئەڤێ، ڤێ، ئەوێ، وێ، ئەڤی و ڤی[١٨].

جێناوی هەیی possessive pronoun

جێناوی هەیی بە واتای خاوەنداریەتی دێت.

لە کرمانجی خواروو بەپێی ناوچەکانی جوگرافی، واتە دەڤۆکـەکـانی، ئـەم جۆرانـە بەرچاو دەکـەون: هـی، ئـێ، هـین. ئـەم جێنـاوە بـەپێـی ڕەگـەز، تـاک و کۆ لـە کرمانجی ژووروو دەگۆڕێت: یێ/ئێ بۆ نێر ئا بۆ مێ، یێ، یا بـۆ تـاک، یێـد، یێـت، یێن (یان ێد، ێت، ێن) بـۆ کـۆ دێتـە بـەکارهێنـان. جێنـاوی هـەیـی لـە کرمـانجی ژووروو بەپێی ناوچەی جوگرافی دەڤۆکەکان دێتە گۆڕین.

دووهەم: جێناوی چەندایەتی Quantative pronoun

جێنـاوی چـەندایـەتـی کۆمـەڵێکـی زۆر لـە جێنـاو دەگرێتـەوە. ئـەم وشـانەی خوارەوە ئاماژە بە ڕێژە یان چەندییەتی دەکەن. من لە ئێرە ئەم چەنـد کۆمـەڵـەم نووسیوە بەڵام دەکرێت لە ئەمانە زیاتر بن:

---

[18] بڕوانە (قەناتی کوردۆ (١٩٩٠:١٠٠).

**جێناوی ئاماژەداری فرەیی:**

(ک.خ) هەموو، هەمووی، هەموویان، گشت، گشتیان، هەردووکیان، هەردووکمان هتد.

(ک.ژ) هەموو، هەمی، تەڤ، گشت، گش، گشک، هەردوو

**جێناوی گشتی:**

(ک.خ) کەس، کەسان، فڵان، فیسار، یارۆ.

(ک.ژ) کەس، کەسان، فلان، بێڤان

**جێناوی دابەشکراو distributional pronoun:**

(ک.خ) یەکێک، هەریەکێک، هەریەکە

(ک.ژ) کەسەک، هەریەک

**جێناوی چەندیەتی:**

(ک.خ) چەند/چەندە/چەندی، ئەوەند/ئەوەندە/ئەوەندەی، ئەمەندە، هێند/هێندە، هەند/هەندە

(ک.ژ) چەند، هنەک/هندەک، هێندێ/هێندێک، چقاس/چەندێک، ئەڤقاس/ئەمەندە، ئەوقاس/ئەوەندە

**جێناوی ڕێژەیی**

(ک.خ) زۆربە (زۆربەیان، زۆربەمان).

(ک.ژ) پرانی (پرانی مە، پرانی وە).

**جێناوی نادیار indifinitive pronoun:**

جێناوی نادیار ئاماژە بە ژمارەیەکی یان ڕێژەیەکی نادیار لە کەس و شمەک دەدات.

(ک.خ) یەکێک، کەسێک، شتێک، ژمارەیەک، گەلێک، زۆرێک هتد.

(ک.ژ) ئێک، یەک، کەسەک، تشتەک، گەلەک، پڕ، کێم.

**جێناوی نەبوو:** ئەم جێناوانە ئاماژە بە نەبوونی کەس، کەسێک، شت، شتێک هتد. دەدەن.

(ک.خ) هیچ، هیچ کەس، هیچ شت، هیچ کەسێک، هیچ شتێک هتد.

(ک.ژ) هیچ، هیچ کەس، هیچ تشت، هیچ تشتەک، هیچ کەسەک هتد.

**جێناوی هاوبەش:**

(ک.خ) یەکتر، یەکترمان، هەریەک، هەردوو، پێکەوە.

(ک.ژ) هەڤڕا، تەڤایی، هەڤدوو، ئێکدو، پێکڤە.

## سێیەم: جێناوی پرس Interrogative pronouns

جێناوی پرس بۆ پرسیاری ڕاستەوخۆ بەکاردەهێنرێت کە مەبەستی بەدەستهێنانی زانیارییە لەسەر کەسێک، تشتێک، هۆکارێک، ژمارەیەک هتد.[١٩]

| پرسیار | کرمانجی خواروو | کرمانجی ژووروو |
|---|---|---|
| کەس و شت | کێ، کام، کامە، کامیان (کام لە ئەمان) | کی، کێ، کیژان، کێ ژ وان، کیشک |
| شت و ئەنجامی ڕوودان | چی، چ | چی، چ |
| شت و چۆنیەتی ڕوودان | چۆن، چلۆن، کوو | کو، چەوا، چتوڤ، چما |
| ژمارە | چەند، چەن | چەند، چەن |
| شوێن و جێگە | (لە) کوێ، کوێندەرێ،کێندەر | ل کیرێ، ل کۆ |
| کات و دەم | کەی، کەنگێ، کەینێ | کەنگێ |
| هۆ | بۆچی، بۆ، لەبەرچی، لە پێناوی چی | بۆ، بۆچی، ژ بەر چی |
| کەس و شت | کوا، کوانێ، کانێ | کا، کانێ |

*وێنەی ٢٠. جێناڤی پرس لە ک.خ. و ک.ژ.*

---

[19] وشەی پرسیاری "ئایا" لە زمانی کوردی هەیە بەڵام ئەم وشەیە جێناو نییە.

## ٦. ژمارە Numerals

وشە ژمارە دەستنیشانی سێ جۆر چەندایەتی دەکات:

یەکەم: ژمارەی بنجی: وەکو هەشت سێو، سێ هەرمێ.

دووهەم: ژمارەی پلەیی: وەکو هەشتەمین سێو، سێهەمین هەرمێ.

سێهەم: ژمارەی کەرتی: وەکو هەشت یەکی سێوەکە، سێ یەکی هەرمێکە.

### یەکەم: ژمارەی بنجی

| کرمانجی خواروو | | کرمانجی ژووروو | |
|---|---|---|---|
| یەک | یازدە، یانزە، یانزدە | یەک، ئێک | یازدە (یانزدە) |
| دوو | دوانزە، دوانزدە | دوو | دازدە (دانزدە) |
| سێ | سیانزە، سێزدە | سێ | سێزدە (سێزدە) |
| چوار، چار | چواردە، چاردە | چار | چاردە (چاردە) |
| پێنج | پازدە، پانزدە | پێنج | پازدە (پازدە) |
| شەش | شازدە، شانزە | شەش | شازدە (شانزدە) |
| حەوت، حەفت | حەڤدە | حەفت، هەفت | هەڤدە (هەڤدە) |
| هەشت | هەژدە | هەشت، حەیشت | هەژدە (هژدە) |
| نۆ | نۆزدە | نەھ، نە | نازدە (نۆزدە) |
| دە | | د، دە | |
| بیست | | بیست | |
| سی | | سی، سیھ | |
| چل | | چل | |
| پەنجا | | پێنجەھ، پێنجی | |
| شەست، شێست | | شێست | |
| حەفتا | | هەفتی | |
| هەشتا | | هەشتی | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| نەوەد | | نوت، نود | |
| سەد | | سەد | |
| هەزار | | هزار | |

وێنەی ۲۱ . ژمارەی بنجی لە ک.ژ. و ک.خ..

## دووهەم: ژمارەی پلەیی

| کرمانجی خواروو (+ ەم، + ەمین) | کرمانجی ژووروو (+ ێ، + ئا-ێ) |
|---|---|
| یەکەم- یەکەمین | یەکێ، ئێکێ- ئایەکێ |
| دووهەم- دووهەمین | دووێ- ئادوێ |
| سێهەم- سێهەمین | سێیێ- ئاسێیێ |
| چارهەم/چوارهەم- چوارهەمین/چارهەمین | چارێ- ئاچارێ |
| پێنجەم- پێنجەمین | پێنجێ- ئاپێنجێ |
| دەهەم- دەهەمین | دەهێ- ئادەهێ |
| سەدەم- سەدەمین | سەدێ- ئاسەدێ |
| هەزارەم- هەزارهەمین | هزار- ئاهزارێ |

وێنەی ۲۲ . ژمارەی پلەیی لە ک.خ. و ک.ژ..

## سێهەم: ژمارەی کەرتی

| کرمانجی خواروو | کرمانجی ژووروو |
|---|---|
| سێ یەک | سێ یەک |
| چوار یەک/چار یەک | چار یەک |
| پێنج یەک | پێنج یەک |
| هەشت یەک | هەشت یەک |
| لە دەیا پێنج | ژ دەهان پێنج |
| لە سەدا دە | ژ سەدان دەه |
| لە هەزارا دوو | ژ هزاران دوو |

وێنەی ۲۳ . ژمارەی کەرتی لە ک.ژ. و ک.خ.

## دووهەم: وشەی ڕێزمانی

### ١. ئامرازی یەکگرتن Conjunctions

ئامرازی یەکگرتن بە ئەو ئامرازانە دەگوترێت کە دوو وشـە، دوو گـرێ یـان دو ڕستە بـەیـەکـەوە گرێـدەدات. ئـامرازی یـەکگـرتن بـەپێـی ولتاکـەی دەکرێـت لـە چوارچێوەی ئەم وشانە دیاریبکرێن

| کرمانجی خواروو | کرمانجی ژووروو |
|---|---|
| ئازاد نان دەخوات و قسەدەکات. | ئەز و تو چۆین. |
| ئازاد هەم نان دەخوات (و) هەم چای. | ئازاد هەم پسمامێ منە و هەم زاڤایێ منە. |
| ئازاد نە دێت و نە دەڕوات/دەچێت. | ئازاد نە تێت و نە دچیت. |
| ئازاد نان دەخوات بەڵام قسەناکات. | هاڤینێ بەغدا گەرمە لێ (بەلێ/لـێ بـەلـێ) |
| ئازاد نان ناخوات بەڵکو قسەدەکات. | ئەز ڤەگەڕیام. |
| | |
| تۆ مامۆستایت یان قوتابی. | ئەم سەیداین یان شاگردین. |
| ئازاد یان وەرە یان بڕۆ. | یان تو یان ژی ئەز گزیر بی. |
| ئازاد لەگەڵ ئاراس قسەدەکات. | ئازاد د گەل ئاراس قسەدەکات. |
| لـە سلێمانی تـا/تـاکو/هـەتـا/هـەتـاکو هەولێر | |
| شەو تا/تاکو/هەتاکو بەیانی | |

وێنەی ٢٤ . ئامرازی یەکگرتن لە ک.ژ. و ک.خ.

## ٢. ئامرازی گەیەنەر Subconjunctions

ئامرازی گەیەنەر بە ئەو ئامرازانە دەگوترێت کە لە ڕستەی تێکەڵ (ئاڵۆز) بەکاردەهێنرێن. ئەرکی ئەم جۆرە ئامرازە گرێدانی لاڕستەیە (یان پاڕستە) بە شاڕستە (ڕستەی سەرەکی). ئەم ئامرازانە دەکرێت بکەونە پێش یان ناوەڕاستی ڕستەی تێکەڵ. بە شێوەیەکی گشتی ئەم ئامرازانە بریتین لە[20]:

**کرمانجی خواروو**

ئەم شارە، کە شەقامی زۆرە، جوانە. (ئامرازی گەیەنەری دیارخەر)

هەر کە نامەکەی خوێندەوە، هەستی بە دڵنیایی کرد. (ئامرازی گەیەنەری کاتی)

هەرکە/کەی هاتیت منیش دێم. (ئامرازی گەیەنەری کاتی)

هەتاکو/تاکو/تا خاوەن ماڵ دزی گرت، دز خاوەن ماڵی گرت. (ئامرازی گەیەنەری کاتی)

لە کوێ بیت، من دێم. (ئامرازی گەیەنەری شوێنی)

لە هەر شوێنێک بیت، من دێم. (ئامرازی گەیەنەری شوێنی)

ئەو، لەبەرئەوەی بێکار بوو، هەمیشە پەست بوو. (ئامرازی گەیەنەری هۆیی)

ئەو، چونکە بێکار بوو، هەمیشە پەست بوو. (ئامرازی گەیەنەری هۆیی)

ئەگەر بەرە بە تۆز نەبێت، ساحێبی دایناوەشێنێت. (ئامرازی گەیەنەری مەرجی)

هەرچەندە بارانیش بێت، سەیرانەکەمان دەکەین. (ئامرازی گەیەنەری پێچەوانەیی)

خەریک بوو قسەبکەم، بەڵام قسەکەی پێ بڕیم. (ئامرازی گەیەنەری پێچەوانەیی)

---

[20] پرانی نمونەکان لە کتێبی د. کوردستان موکریانی ٢٠٠٤ و سادق بهاء الدین ئامێدی ١٩٨٧ وەرگیراوە.

هەرچەندە پانتۆڵەکەی لە ڕەنگی چاکەتەکەی بوو بەڵام هیچ نەشازییەکی نەنواندبوو. (ئامرازی گەیەنەری پێچەوانەیی)

ئەگەرچی خانوویەکی تازە و گەورە بوو بەڵام زۆر دوور بوو. (ئامرازی گەیەنەری پێچەوانەیی)

هەر هێندەی چاوی پێم کەوت، باوەشی بۆ کردمەوە. (ئامرازی گەیەنەری پێوانەیی)

چاو و برۆکانی، ئەوەندە ڕەش بوون، بریقەیان لە دوورەوە کاری خۆی دەکرد. (ئامرازی گەیەنەری پێوانەیی)

دایکم، هێندەی بڵێی یەک و دوو، خۆی پێچایەوە. (ئامرازی گەیەنەری پێوانەیی)

بێدەنگی ژوورەکە، هێندە کپ بوو، ئەم دوو وشەیە وەکو تۆپ دەنگی دایەوە. (ئامرازی گەیەنەری پێوانەیی)

(ئەو)، بەڕادەیەک دڵخۆش بوو، ناشیرینی لەلا جوان بوو. (ئامرازی گەیەنەری پێوانەیی)

<u>کرمانجی ژووروو</u>

ئەڤ کتێبا، کو لسەر مێزێ یە، یا منە. (ئامرازی گەیەنەری دیارخەر)

ئەگەر بارام نەیێ مالا مە ناچم مالا وی. (ئامرازی گەیەنەری مەرجی)

گەر زانیت ئەزم، گەر نەت زانی دزم. (ئامرازی گەیەنەری مەرجی)

ئەگەر پێ نەحەسا، ئەو بخو دێ کەڤیت. (ئامرازی گەیەنەری مەرجی)

هەتا مرنێ چاڤ ل کرنێ. (ئامرازی گەیەنەری کاتی)

هەتا عەقل ناس کر مال خەلاس کر. (ئامرازی گەیەنەری کاتی)

کەنگێ بهار بێت گول دبشکفن. (ئامرازی گەیەنەری کاتی)

گاڤا توهاتی ئەزێ نڤستبوم. (ئامرازی گەیەنەری کاتی)

ئەو چ بکەت ئەز نا ئێشینم چکو/چونکە پسمامی منە. (ئامرازی گەیەنەری هۆیی)

هەرچەند شاگردێ یەکەمێ هەر ساڵ ئەز بووم، لێ وەسا ژی ژ بەر نەبونا کتێب و قەلەم و دەفتەران، نەشیام خوندنا سەرەتایی هەوکەم. (ئامرازی گەیەنەری پێچەوانەیی)

هەرچەند حەیرانۆک ب پاقژترین زمان هاتیە ڤەهاندن، لێ ژ پەیڤێت بیانی رزگار نەبویە. (ئامرازی گەیەنەری پێچەوانەیی)

هێند زێڕ پەیداکرن، کچا حاکمی بو خوە ئینا. (ئامرازی گەیەنەری پێوانەیی)

ئامرازی گەیەنەر لە زمانی کوردیدا دەکرێت تاکو رادەیەک لە ئەم چوارچێوەیە کۆبکرێتەوە:

کە/کو، هەرکە، هەرکە/کەی، هەتاکو (تاکو، هەتا، تا)، لەهەر شوێنێ/ لە هەر کوێ، ئەگەرچی/ئەگەر (گەر)، لەبەرئەوەی/ژ بەرکو، بۆ ئەوەی، چونکە (چونکی، چونکو، چمکی)، هەرچەندە/هەرچەند، هێندە/ئەوەندە (هێندی، هێند)، بەرادەیەک، بێجگە/جگە، بۆیە/لەما، (چقاس/ئەوقاس — ئەمەندە/ئەوەندە)،

### 3. ئامرازی پێشبەند Prepositions

چەمکی pre-position بە واتای "پێش شتێک" دێت. ئاساییانە ئامرازی پێشبەند پەیوەندییەک رێکدەخات و ئەم پەیوەندییەش دەکرێت لە ئەم چەند خاڵانەی خوارەوە دیاریبکرێت:

پەیوەندی شوێن: من لە ماڵ دەژیم. د ڤێ بازێریدا دوو خوندنگە هەنە. سێڤ ژ دارێ وەریان/سێو لە دارەکە وەری. من (ل/لە) لە لای/ لە کن/ ل جەم/ لە

تەنیشت/ لە دوای/ لە پێش/ لە پاڵ ئەو دانیشتم. من لە نێوان هەردووکیان دانیشتم.

پەیوەندی کات: لە هاوین سەرتان لێدەدەم/ ل زستانێ بەفر دباریت. من پێش/دوای ئەو هاتم،

پەیوەندی کەرەستە: من بە پاسکیل هاتم. سەردار ب دەستێ خو نامە نڤیسی. ئەو بێ دایک و باوک ماوە/ ئەو بێ دای و باب مایە.

پەیوەندی ئاراستە: من بۆ/بەرەو ئەوێ دەچم. من بەنێو کۆڵانەکە دەچم/ ئەز د ناڤ تۆبیدا گەڕیام. ئەز ژبو/لەبۆ تە چ بکەم زیان نینە. من بەدوای ئەو چووم. ئەز ب لایێ وە ڤە دەربازبووم/ من بەلای ئێوە چووم.

لە کرمانجی ژووروودا تێکەڵاوکردن لە نێوان سێ ئامرازی پێشبەند "د، ژ، ل" دەکرێت، کە بەرامبەرەرەکەی لە کرمانجی خوارووا ئامرازی پێشبەندی "لە" ە، بۆ نموونە: (قەناتی کوردۆ ١٩٩٠:٢٦٨)

| <u>ک.ژ</u> | <u>ک.خ</u> |
|---|---|
| د گەل/ل گەل | لەگەڵ |
| ژ بەر/ل بەر | لە بەر |
| ژ ناڤ/ل ناڤ | لە ناو |
| ژ ژێر/ل ژێر | لە ژێر |
| ژ پاش/ ل پاش | لە پاش |
| ژ من/ل من | لە من |

## 4. ئامرازی سەرسوڕمان Interjections

ئاسایییانە ئامرازی سەرسوڕمان یان هەستدەربڕین لە زمانی قسەکردن بەکاردەهێنرێت، بەکارهێنانی ئەم ئامرازە لە نووسیندا بە واتای ڕەنگدانەوەی زمانی قسەکردن دێت. وشەکانی هەستدەربڕین دەکرێت دابەش بکرێن بەسەر:

### هەستی خۆشی و گاڵتەجاڕی:

دەک بەخێر بێن!

هاها ئەڤ پسمامێ منە!

هەی هەی نازەنین تۆراوە! خۆ دوێنێ بردیان بە بوکی!

ئۆخەی کە چاوم پێت کەوت!

### هەستی سەرسوڕمان و ناڕازیبوون:

وای لە شاسوار چەند نەزانە!

ئیو/عیو گدیانێ تو چەند ترسنۆکی!

هەک کوڕۆ تو ل ڤر چ دکی!

پەک/پەکو ئەڤە چ ئەژدیهایەکە!

دەک/ئەک نەمری بۆ خۆت و کردەوەت!

هەی بۆت بمرم!

هەیهۆ ئیتر نەبڕایەوە!

هەیها ڤێرە کیرێیە ئەز لێ دگەڕم!

پەح چەند پیاوێکی چەنەبازە!

### هەستی پەژارەیی و دڵتەنگی:

داد بێ داد لە چەرخی گەردوون.

ئای/ئۆی/ئاخ و داخ لە ئەم ئازارە.

حەیف و مخابن ئەو مرۆڤێ هندێ بەرکەفتی دنیا ڕۆهن لێ تاری بو.

وای لە ئەم زوڵم و زۆرە.

ئۆف لە دەست جەوری زەمانە.

**بانگکردن**

هۆ هۆ!

کچێ! کچینە!

کورە! کوڕینە!

ئازاد!

فلان! فیسار! بیڤار!

وشەکانی سەرەوە تاکو ڕادەیەکی زۆر لە هەردوو دیالێکتەکە دێنە بەکارهێنان.

# بەشی چوارەم

## دیسکۆرس- زمانی بەکارهێنراوی نووسین و قسەکردن

### پێشەکی

زمان لە هەموو چالاکییەکانی مرۆڤایەتی دێتە بەکارهێنان. مرۆڤ بە هۆی گرێدانی یەکەکانی زمان وەکو فۆنێم، مۆرفێم، وشە، گرێ و ڕستە دەربڕینەکانی دەهێنێتە بەرهەمهێنان. ئەم یەکانە واتا هەڵگرن بەڵام بێلایەنن neutral ئەگەر نەخرێنە ناو جۆرە ڕەوشێکەوە reality. یەکەکان هیچ لایەنێکی دەربڕین-یان نییە. ئەمانە بێ بەهان ئەگەر نەهێنە دەربڕین. دەربڕین (واتە تێکستی نووسراو و قسەپێکراو — لە ئێرە بەدوا چەمکی تێکست بۆ دەربڕین بەکاردەهێنرێت) ئاراستەپێکراوە و دەکەوێتە نێو دیالۆگ و بەندە بە کۆنتێکست. ئەمە گرفت بۆ ئەو ڕوانگە نەریتە لینگویستیکییە دروستدەکات کە دەبێژێت تێکست لە لایەن تاک دێتە خولقاندن. بەڵام لە ڕوانگەی سۆسیۆلینگویستێک تێکست بەرهەم هێنراوی جڤاکە/کۆمەڵە، نەک تاکە کەس. بەڵام ئەم ڕوانگەیەش ڕەخنەی لێدەگیرێت چونکە کاریگەریی زمان لەسەر پێکهاتەی دەزگاکانی کۆمەڵایەتی، دوبارە بەرهەمهێنانیان و گۆڕانکاری پێ کردنیان بە دوور دەگرێت. ئەوان جیاوازی لە بەکارهێنانی زمان وەکو شتێکی لابەلاو سادەی ڕەوشی کۆمەڵایەتی/جڤاکی، مەبەست، ئینتەرئەکشون هتد. تەماشادەکەن. ئەوان خەسڵەتەکانی بەکارهێنانی

زمان وەكو كاردانەوەیەک بۆ بونیـادی كۆمـەڵایـەتـی لـە ئاسـتی قـووڵترەوە وەكـو چین، ڕەگەز، تەمەن، پیشە هتد. نابینن. تێكستەكان ڕەنگدانـەوەی بیركردنـەوە و هەڵسوكەوتەكانی مرۆڤە، لە هەمان دەمدا دەچنە نێـو پـەیوەنـدی و تێگـەیشتنی هاوبـەش. تێكسـت وەكـو فـۆڕمێكی زمـانی، تـەنهـا بـەنـد نییـە بـە فـۆڕمێكی كۆمـەڵایـەتـی، بـەڵكـو خـۆی فـۆڕمێكی كۆمـەڵایـەتییـە. مرۆڤـەكـان بـە پێـی ئـەو سیستەمـە لینگویـستیک و كۆمـەڵایـەتییـەی كـە هـەیـە زمـان بـەكـاردەهێـنن، بـە جۆرێكی تر بە پێی ئـەو ڕۆڵ و پـەیوەنـدی و ڕەوشـەی كـە مـرۆڤ هـەیـەتـی لـە كۆمەڵگا زمان دێتە بەكارهێنان. ئێمە ئێستا هێدی هێدی بەرفراوانتـر دەچینـە نێـو قوڵایی ئەم باسەوە.

## تێكست– دەقی نووسراو یان گوتراو Text

ئێمە دەتوانین نەخشەیەكی گشتی بۆ خـەسڵەتـە بنـەڕەتییـەكانی تێكسـت و چۆن هەر تێكستێک لەگەڵ یەكتر گرێدراوە بكێشین. هـەمـوو تێكستێک دەچێتـە نێو یان گرێدراوی ڕەوشێكی دیاریكراوە، كە لە ئەوێدا ئەرک و مەبەستی هەیە. لـە ئێرەدا مرۆڤ باس لـە ئـەو كۆنتێكست-ە دەكـات كـە تێكسـت لـە نێویـدا گـەشـە دەكات و كاریگەری لەسەر دادەنێت. بێجگە لە ئەمە تێكست بوونیادی هەیە، واتـە پێكهاتـەكانی تێكسـت لـەگـەڵ یـەكتـردا ڕێسایانە و بـەپێـی مـەرجـی زمانـەوانـی گرێدراون، نەک بە هەڕەمەكی. دەنگەكان وشە دروست دەكەن، وشـەكـان ڕسـتە و ڕسـتەكـانیش دەربـڕین. پێكهاتـەی دەربڕینـەكـان لـە سـاتی بـەكارهێنانـدا بـە شێوەیەكی ڕێزمانی بە دوای یەكتردا دێن. كورتەی باس: ئـەو بیركردنـەوانـەی كـە مرۆڤ هەیـەتـی لـە ڕێگـای وشـە دەكرێـت بـە تێكسـت و ئاراسـتەی خوێنـەر یـان بیسەر دەكرێت. لەبەر ئەمە لە هەر ڕووبەڕووبوونەوەیـەكی زمانـەوانیـدا سـێ جـۆر

سەرنج لە تێکست دەدرێت: تێکست وەکو شێوە، تێکست وەکو ناوەڕۆک، هەروەها تێکست وەکو پەیوەندگری جڤاکی/کۆمەڵایەتی.

بۆ شێوەی دەرەکی هەر تێکستێک سەرنج دەدرێتە سەر دارشتنەکەی کە ئایا ڕۆشنە یان ناڕۆشن، بازارییە یان ئەکادیمی، ئاڵۆزە یان ئاسانە هتد. بە ئەمەش دەگوترێت بوونیادی تێکست Textual Structure. دیسان هەر تێکستێک ناوەڕۆکی هەیە. تێکست بیرۆکەیەکی سەرەکیی هەیە کە نووسەر یان قسەکەر لەگەڵ هەندێک بیرۆکەی دی تێکەڵی دەکات لە ساتی دەربڕیندا. بە ئەمەش دەگوترێت Ideational Structure. دواتر تێکست لە خۆڕا بەرهەم نایەت، بەڵکو ئاراستەی خوێنەر یان بیسەر دەکرێت. شێوە و ناوەڕۆکی تێکست بەپێی ئەو پەیوەندییە دێتە بەرهەمهێنان کە لە نێوان زمانبەکارهێنەراندا هەیە. بە ئەمەش دەگوترێت Interpersonal structure.

بەپێی ئەو باسە کورتەی سەرەوە بۆ تێکست ئەوا هەر سێ جۆر بونیادەکەی تێکست لەگەڵ یەکتردا لێکدانەبڕاون. شێوەی دارشتن و ناوەڕۆکی تێکست و ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەی کە هەیە بەندن لەگەڵ یەکترداو کاریگەرییان بەسەر یەکترەوە هەیە، بۆ نمونە ئەو تێکستەی کە ئاراستەی منداڵێک دەکرێ جیاوازە لە ئەوەی کە ئاراستەی گەورەیەک دەکرێ. مەبەست لە ئەم دابەشکردنە تەنها تێگەیشتنی زیاترە لەسەر تێکست. کۆنتێکست و ئەو سێ بەشەی بونیادی تێکست بناغەی ئەو نەخشەیەن کە ئێمە باسی دەکەین. ئێمە لە ئێرە بە جیاو بەرەبەرە زیاتر ڕۆشنایی دەخەینە سەر ئەم چەمکانە.

### کۆنتێکست Context

کۆنتێکست واتە "لەگەڵ تێکست". واتە هەموو ئەو ڕەوشە زمانەوانی و کەلتوورییەی کە تێکستێکی لێ بەرهەم دێت یان کاریگەریی لەسەر دادەنێت؛

ئینجا ئەم تێکستە دەکرێت گوتراو بێت یان نووسراو. لە شیکردنەوەی تێکست کۆنتێکست ڕۆڵی ناوەندی دەبینێت چونکە ئەوەی کە دەگوترێت یان دەنووسرێت دەبێت لە ڕوانگەی ئەو دۆزەوە بێتە تەماشاکردن کە ئەم نوسینە یان گوتنە دەکەوێتە نێوی. ئەگەر ئێمە بخوازین ئەوە ڕوون بکەینەوە کە بۆچی تێکست پەیدا دەبێت و بۆچی بە ئەو شێوە دەبینرێت دەبێت لە کۆنتێکستەکەی بڕوانین.
لە ئێرەدا سێ بەشی کۆنتێکست کە گرێدراوی تێکستە لە یەکتر جودا دەکرێنەوە: ڕەوشی هەنووکەیی کۆنتێکست The situational context، کۆنتێکستی تێکستی تێکەڵ The intertextuell context و کەلتووری کۆنتێکست The cultural context کە گرێدراوی ئەو تێکستی بەکارهاتووەیە کە لە کۆمەڵگادا دێتە بەکارهێنان. بڕوانە ئەم تێکستە کورتە کە دواتر تاکو ڕادەیەک ئەم سێ چەمکەی پێ شیکار دەکەین:

*بێگومانە کو گوتنێ بێگانە د هەمو زمانا دە پەیدا ببن و هەمو زمان ب گوتنێ بێگانە دەولەمەندبونە، لێ ژبەرکو زمانێ کوردی ب دو شیوا پەرچە بویە مرۆڤ دترسی کۆبەرەبەرە ژهەڤ دور کەڤن و ببن دو زمان.*[21]

## دۆخی هەنووکەیی کۆنتێکست The situational context

دۆخی تێکست بەندە بە ئەو چالاکی و شێوازی پەیوەندیکردنە کە بەشداربوان لەگەڵ یەکدی هەیانە، بە ئەم شێوەیە:

**یەکەم: چالاکی Field**

تێکستێکی لە ئەم چەشنەی سەرەوە، هەروەکو تێکستەکانی نێو کتێبی فێرکاری، تێکستەهەواڵی نێو ڕۆژنامەکان، سەرگوتاری ڕۆژنامەکان بۆ

[21] اواو دەستورا زمانی کوردی (جگەر خوین ١٩٦١:ع).

دروستکردنی بۆچوون و هەڵوێست، هەمیشە لە چوارچێوەی چالاکییەکی گەلێک بەرفراوانتردا ئەرکێک رادەپەڕێنێت. ئێمە لە ئێرەدا دەتوانین باس لە ئەو ***چالاکییە*** بکەین کە تێکستکە دەچێتە نێوی و پەرەی پێدەدات. تێکستەکە کەم تاکو زۆر مەبەستی ئاشکرای هەیە و داواکاریشی هەیە. مەترسیی نەبوونی زمانێکی یەکگرتوو یان مەترسیی پارچەبوونی زمانی کوردی بۆ دوو زمان. داواکاری کارکردنە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم مەترسییە.

دیسان هەموو تێکستێک گرێدراوی ***کات*** و ***شوێنێکن***. هەڵبەت هەتاکو ئێستا مەبەست و داواکاری ئەم تێکستە تێنەپەڕیوە، بەڵکو هەنووکەییە. شوێنەکەش هەرکوێیەک کە کوردی لێبێت و بتوانێت لە مەبەست و داواکاری ئەم تێکستە تێبگات. ئەم کات و شوێنە کە تاکو ڕادەیەک بەردەوامە بەندە بە ڕەوشی کوردستان، ئەگەر نا کات و شوێنی هەندێک تێکستی تر دیاریکراوە، بۆ نمونە پرۆتۆکۆڵی کۆبوونەوەیەک/جڤینێک کە بە ئاشکرا، بەڵکو دەبێت، کات و شوێن دیاری دەکرێت.

زمان و بیرکردنەوە و کردار ئاساییانە لە ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتردا هاریکاری دەکەن. ئەم تێکستە کورتە بەندە بە گشت ئەو جۆرەها بیرکردنەوانەو کردەوانە کە گرێدراوی ئەو مرۆڤانەن کە تێکستەکەی ئاراستە دەکرێن. لە ئێرەدا ئێمە بە ئەم هاریکاریکردنە کە بەندە بە- و لە نێو گشت ئەو بیرکردنەوانەو کردەوانەدا هەیەو ڕووناکی دەخاتە سەر جۆرەها چالاکی جوداجوداوە، دەبێژین ***دیسکۆرس*** Discourse. بۆ نمونە دیسکۆرسی زانستی زمان شێوازێکی بنەڕەتییە بۆ هەڵسەنگاندن و مامڵەکردنی ئەو پرسانەی زمان کە دەکەونە نێو تێکستەکانی زانستی زمانییەوە، واتە ئەم تێکستە پەرەپێدەرو درێژەپێدەری ئەو گشت تێکستانەی پێشووترە کە لە ئەم بوارە هاتۆتە بەرهەم.

له ڕێگەی ئەم تێکستانەوە دیسکۆرس پەرە بە بـەردەوامیـی ئـەم چالاکییـە دەدات و بۆ بەکارهێنەرەکانی واتاداری دەکات. هەڵبەت لە ئێرە وا چاوەڕوان دەکرێـت کـە ئەو کـەسـانەی چـالاکن لـە نێـو ئـەم چالاکییـەدا پـسپۆڕو شـارەزاو تـوێژەرەوەری زمانەوانی بن. بە ئەم شێوەیە دیسکۆرسی زانستی ئابووری، یاسایی، تـەندروسـتی هتد. هەیە.

دووهەم: بەشداربووان Participants

ئاساییانە ئەو کەسانەی کە بەشدار دەبن لە ئەو پـەیـوەندییـەی کـە گرێـدراوی تێکستێکە بەندە بە ئەو چالاکییە هەنووکەییەوە، بەڵام نەک هـەمـوو دەمێـک. بـۆ نمونە کاتێک ڕێکخراوێکی ڕامیاری بانگشەی هەڵبـژاردن دەکـات ئـەوا چالاکییـەکـە بۆ کات و شوێنێکی دیاریکراوە، بەڵام دەکرێت بانگەشەی ئەم ڕێکخـراوە ڕامیارییـە بکەوێتە بەر جۆرەها هەڵسەنگاندن، بۆ نمونە هەڵسەنگاندنی زمانـەوانی لـە لایـەن خویندکارانی زمان لە زانکۆکان. ئەم جۆرە هەڵـسەنگاندنـە دەتوانێـت خـەسـڵەتـی بەردەوامی بە کـات و شـوێنی تێکستەکـانی بانگـەشـە ڕامیارییـەکـە بـدات؛ ئـەمـە بێجگە لە پترکردنی ژمارەی بەشداربووانی پەیـوەنـدگرانی ئـەم بانگـەشـەیـە. هێـژا جگەر خوێن ئـەو چـاوەڕوانییـەی هـەبـوو کـە کتێبـەکـەی لـە لایـەن خوێنـدکارانی کوردەوە بخوێنرێ. بەڵام بڕوا ناکرێت ئەو ئەو چاوەڕوانیەی هەبووبێـت کـە پارچـە تێکستێکی بچوک لە پێشەکیی کتێبەکەی بـۆ توێژینـەوەی زمـانی بـەکـاربهێنرێ و دواتـر لـە ڕێگـەی ئـەم کتێبـەوە چوارچێـوەی چـالاکیی ئـەو تێکـستە بچوکـە بەرفراوانتر بکرێت و بەشداربووی نوێی تری بۆ پەیـدا ببێـت. ئـەم تێکـستە کورتـە کە دەکەوێتە نێو کتێبی "اواو دەستورا زمانی کوردی"یەوە، بەرهەمهێنـەرەکـەی بـە تـەنهـا جگـەر خـوێن نییـە، بـەڵکـو شـارەزایـانی تـری زمـانی کـوردی هاریکـاری

مامۆستای هێژایان کردوە ئینجا ئەمە ڕاستەوخۆ لە لایەن کەسانی ترەوە، بۆ نمونە وەکو تێبینی و پێداچوونەوەی کتێبەکە، یان ناڕاستەوخۆ لە ڕێگەی سەرچاوەی کتێبی ترەوە. ئەم گۆتنەمان زیاتر پشتدەبەستێت بە ئەو ڕاستییەی کە زانکۆی بەغداد ئەرکی لە چاپدانی کتێبەکەی گرتۆتە ئەستۆ. ئەمە ئەوە نیشان دەدات کە کەسانی تر بەشداربوون لە بەرهەمهێنانی کتێبەکە، هەروەها لە بڵاوکردنیشی.

هەموو جۆرە تێکستێک ئاراستەی وەرگر (خوێنەر یان بیسەر) دەکرێت. واتە وەرگریش بەشداربووی ئەم چالاکییە هەیە. ڕۆڵی ئەو بەشداربووانەی کە تێکستێک بەکاردەهێنن بەندە بە پەیوەندییە کۆمەڵایەتی-یەکانەوە. لە ئێرە باس لە پێگەی دەستەڵاتی بەشداربووان دەکرێت. جیاوازییەکان لەوانەیە سەبارەت بە ئەو مافانە و ئەرکانە و لێپرسراوەتییانە بێت کە بەشداربووان بەرامبەر بە یەکتر هەیانە. لە ئێرەدا باس لە پەیوەندی هاوتایی و ناهاوتایی دەکرێت Symmetrical- and asymmetrical relationship. پەیوەندی هاوتایی دەربارەی ئەو جۆرە پەیوەندییانەیە کە بەشداربووان پلەوپایەیان وەکو یەکترە، بەڵام لە پەیوەندی ناهاوتایی یەکێک لە بەشداربووان زاڵترە لە ئەوانی تر: دەستەڵاتی زیاتر، شارەزایی و زانیاری زیاتر، پەیوەندی زیاتر هتد. نمونەی پەیوەندی ناهاوتایی دەکرێ لە نێوان دکتۆر و نەخۆش بێت، لە نێوان مامۆستا و خوێندکار بێت یان لە نێوان ئەفسەر و سەرباز بێت.

دەستەڵات ئەو توانایەیە کە مرۆڤ دەتوانێت کاریگەری لەسەر ڕەوشی خۆی و ئەوانی تر دابنێت. ئاساییانە دەستەڵات گرێدراوی دابەشبوونی نادادپەروەرانەی سەرچاوەکانە؛ وەکو سەرچاوەی ئابووری، کۆمەڵایەتی، کەلتووری یان زمانەوانی. ئاساییانە ئەو کەسەی کە پارەی زیاتری هەیە، پێگەی بەرزتری هەیە، زانیاری

زیاتری هەیە، پەیوەندی فراوانتری هەیە یان توانای دەربڕینی زیاتری هەیە دەسەڵاتی زیاتر بەسەر ئەو کەسانەی کە لە ئاستی ئەو نزم ترن هەیە. بە ئەم شێوەیە ئەو کەسە دەتوانێت کەم تاکو زۆر بەپێی ئەم پەیوەندییە، لە دەمی ڕوودانی هەر کێشەیەک، مەرجەکانی خۆی بسەپێنێت بەسەر ئەوانی تر.

تێکستی ڕۆژنامەیەک کە دەربارەی کەم و کورتییەکانی دەزگایەکی فەرمی بێت، دەکرێت تەرازووی دەستەڵاتی نێوان نووسەری/نێنەری ئەو تێکستەو وەرگرانی/خوێنەرانی بهێنێتە گۆڕین. لێپرسراوانی ئەو دەزگا فەرمییە لە ڕەوشی پارێزگاری خۆیان دەبیننەوە و ناچارن وەڵامی ئەو کەموکورتیانە بدەن کە لە تێکستی ڕۆژنامەکەدا هاتووە. لە ئەم دۆخەدا نوێنەرانی دەزگا فەرمییەکە دەستەڵاتیان کەمترە بەڵام خوێنەرێکی ئاسایی دەتوانێت لە خوێندنەوەی تێکستەکە بەردەوام نەبێت، ئەمە چونکە تێکستەکە ئاراستەی ئەو نەکراوەو جێگەی بایەخی زۆری ئەو نییە. تێکستەکە وەکو کەرەستەیەک بۆ پەیداکردنی بۆچوون و هەڵوێست بەپێی ویستی نێنەرەکەی، هەردوو نووسەر و ڕۆژنامەکە، دێتە بەکارهێنان. هەر تێکستێک بەپێی ئەو چالاکییەی کە بەشداربووان هەیانە تیایدا دێتە بەرهەمهێنان و گەشەپێکردن، هەروەها بەپێی شێوازی ئەو پەیوەندییە کە دۆخەکە داوای دەکات. بۆ نمونە شێوازی پەیوەندی قسەکردنی نێوان نەخۆشێک و دکتۆرێک جودایە بە بەراورد لە ئەو شێوازی پەیوەندییەی کە لە نێوان بەڕێوەبەرێک و کرێکارێک هەیە لە کۆمپانیایەک. شێوازی پەیوەندیی یەکەم دەربارەی ڕێنماییە لەسەر بنەمای زانیاریی زیاتری دکتۆر بەرامبەر بە نەخۆش، بەڵام ئەوەی دووهەم دەربارەی فەرمانێکی ڕێڤەبەرییە کە بەڕێوبەر پایەی بەرزتری هەیە تاکو کرێکار. تێبینی بکە کە هەردوو پەیوەندییەکە ناهاوتایە بەڵام شێوازی پەیوەندییەکە جودایە.

ئەم تێکستە کورتەی هێژا جگەر خوێن ئەگەر لە لایەن مامۆستایەک ئاراستەی خوێندکاران کرابێت ئەوا خوێندکاران ناچارن تێکستەکە بخوێننەوە. پەیوەندییەکە ناهاوتایە، مامۆستا دەستەڵاتی هەیە و خوێندکاران بێ دەستەڵات، هەروەها جگەر خوێنیش بە دەستەڵاتە چونکە ئاستی زانیاری زمانەوانیی کتێبەکە زیاترە لە هی خوێندکاران.

### سێهەم: شێوازی پەیوەندیکردن Mode

لە نێو هەر چالاکییەک و بەپێی بەشداربووانی چالاکییەکە شێوازی ئەو تێکستە پەیدادەبێت کە ڕەوشەکە داوای دەکات، ئێمە بە ئەمە دەڵێین شێوازی پەیوەندیکردن. لە ئێرەدا مەبەستی تێکست گەلێک گرنگە. بۆ نمونە بانگەوازی دەزگایەکی فەرمی دیاریکراو، ڕیکلامێکی کۆمپانیایەک یان بانگەشەی کۆمەڵەیەکی مەدەنی تایبەتمەندی خۆی هەیە. هەموو جۆرە پەیوەندیگرتنێک جۆرە چاوەڕوانییەکی لێدەکرێت کە ئەمیش کاریگەریی بەسەر شێوازی بینراوی/بیستراوی تێکست هەیە، هەروەها بۆ دەستڕەسبوونیشی بۆ خوێندەواران/بیسەران. بە واتایەکی تر، شێوازی پەیوەندیکردن کاریگەری بەسەر دارشتنی تێکست هەیە. تێکستەکەی جگەر خوێن بە کورتی و پوختەیی دارێژراوە. تێسکتەکە زانیاری بەخشە و بەتاڵە لە وشەو گرێی بەهادارو ڕەوانبێژی Rhetorical and valuable word. تێکستەکە دەتوانرێت بە ئەو جۆرە بێتە هەڵسەنگاندن کە مەبەستی بەگرخستنی گەنگەشە و پەیداکردن و پترکردنی بۆچوون و هەڵوێست و کارکردن و زیادکردنی ژمارەی بەشداربووان بێت.

زمانی بەکارهێنراو لە کۆمەڵگادا دەگۆڕێت، بەگوێرەی ئەوەی کە ئێمە کێ-ین خاوەن کام پیشە-ین. بە شێوازی بەکارهێنانی زمان لە نێو پیشەیەکی یان

کۆمەڵێک خەڵکی دیاریکراو دبێژین کۆد code. کۆد واتە "زمان لە زماندا" — "کوردی" چەترە هێمایەکە کە ژمارەیەکی زۆر کۆد لەخۆ دەگرێت، بە جۆرێک کە هیچ تاکە کوردێک ئاشنای هەمووی نییە. کۆد دەربارەی ئەو ستراتیجییە بەرفراوانەیە کە لە دارشتن و ناوەڕۆکی تێکست بەکاردەهێنرێت. کۆد گرێدراوی چالاکییەکی دیاریکراوە یان کۆمەڵێک لە بەشداربوو. شێوازی زمانی بەکارهێنراوی جووتیاران جودایە لە دادوەران. شێوازی زمانی بەکارهێنراوی گەنجان جودایە لە بەساڵاچووان. هەر یەکە و کۆدی خۆی هەیە. کۆد دەکرێت بڵاو بێت، هەروەها تەسک. کۆدی بڵاو ئاراستەی گشتی دەکرێت یان گرێدراوی بەرژەوەندی زۆرینەیە. ئەم تێکستە کورتەی جگەر خوێن ئاراستەی گشت کۆمەڵانی کورد کراوە، چونکە گرێدراوی بەرژەوەندی گشتە. کۆدی تەسک ئاراستەی یان گرێدراوی ژمارەیەکی دیاریکراوی بەشداربووە کە جیاوازن لە زۆرینە. ئەمە وا دەکات ئەم بەشداربووانە تایبەتمەند بن. شێوازی دارشتنی تێکستێکی یان کۆدێکی زانستی، بۆ نمونە زانستی ناوکی، هەمیشە تەسکترە لە کۆدێکی میلیی (کە لە لایەن زۆرینە حەزپێکراوە).

تێکستەکەی جگەر خوێن لە ڕوانگەی کەسیەتی خۆیەوە دانەڕێژراوە، بەڵکو لە ڕوانگەی گشتەوە. تێکستەکە جێناوی "ئەز، من، ئێمە"ی تێدا نییە، بەڵکو وشەی "مرۆڤ"ی بەکارهێناوە کە نوێنەرایەتیی گشتی دەکات. هەموو تێکستێک چوارچێوەیەکی فیزیکی هەیە. تێکست لەسەر کاغەز، لە کۆمپیوتەر، لە نێو کتێبێک، ڕۆژنامەیەک، گۆڤارێک چاپدەکرێت، یان تەنانەت لەسەر کراسێک، پارچە قوماشێک دەنووسرێ. مرۆڤ لە ئێرەدا باس لە مێدیۆمی تێکست medium of the text دەکات. مێدیۆم ئەو کەرەستە دیارخەرەیە کە دەستڕەسی خوێندەوارانیەتی. هەڵبەت هەموو جۆرە تێکستێک بەپێی مێدیۆمەکەی دێتە

گونجاندن. میدیۆم ئەو ڕێکخراوە تەکنیکی و کۆمەڵایەتییە دەگرێتەخۆ کە تێکست بڵاو دەکاتــەوە و بــە بــەشـداربووانی پێشکەش دەکـات. بـۆ نمونـە هـەواڵێـک کـە دەربارەی چالاکییەکی چەتە دەریاییەکانی سۆماڵە لە ماڵپـەڕێکی ئـەلکترۆنـی کـە تایبەتمەندە بە زانـستی دەم و ددان بـڵاو ناکرێتــەوە. لـە ئـەم میدیۆمـە، ماڵپـەڕی ئـەلکترۆنیـی زانـستی دەم و ددان، تـەنها ئـەو تێکستانە دێتـە بڵاوکـردن کـە لـە چوارچێوەی ئەرک و مەبەستی ماڵپەڕەکەیە، هەروەها بەشداربووانیشی.

## کۆنتێکستی تێکستی تێکەڵ The intertextuell context

هیچ تێکستێک بێ ڕیشە نییەو لە نەبوونەوە پـەیـدا نـەبـووە. تێکست لـەگـەڵ تێکستی تر دەچێتە دیالۆگ و دووبارە بەرهەمی دەهێنێتەوە، دایدەڕێژێتــەوە، خـۆی پــێ گـرێ دەدات، لێـی قـەرزدەکـات و ئامـاژەی پێـدەدات. بـە ئـەم چوونیـەکـە دەگوترێت کۆنتێکستی *تێکستی تێکەڵ*.

ئەو زانیاری و مەبەست و داواکارییەی کە لـە تێکستە کورتـەکـەی جگـەر خـوێن هاتووە نوێ نییە، بەڵکو گرێدراوی تێکستی کۆنترە کـە لـە لایـەن زمانناسـانی تـری کوردەوە باسی لێکراوە. واتە تێکستەکە گرێدراوی تێکستی کـۆنترە. بـە ئـەم جـۆرە گرێدانەوەیە دەگوترێت تێکستە تێکەڵی ئەستوونی Vertical Intertextuality.

هەندێک تێکست گرێدراوی هەندێک تێکستی ترن کە لە چـەشـنی genre تـرن و لە چالاکیی ترن. بە ئەم جـۆرە گرێدانـە دەگوترێـت تێکـستە تێکـەڵـی ئاسـۆیی Horizaontal intertextuality. ئـەم جـۆرە گرێدانــە دەکرێـت دیـارو نادیـار بێـت. تێهـەڵکێـشین projection بــە ئاشــکرا تێکــست بــە تێکــستی تــر گرێــدەدات. تێهەڵکێشین واتە هێنانی دەنگی یان بیرکردنەوەی کەسێکی تر بۆ ئەو دەربڕینـەی کە قسەکەرێک یان نووسەرێک بەرهەمی دەهێنێت، بۆ نمونە؛

ئێمە دەبێت ئەم کارە بکەین، بەپێی قسەکەی ئازاد.

ئانکو دبێژن هێشتا دەم هەیە یان بلا بۆ سوبەهی بیت.

بەڵام تێکستە تێکەڵی تر نادیارە و بە ئاشکرا نابینرێت، بۆ نمونە ئەو پارچە تێکستەی جگەر خوێن. هەموو ئەو هەوڵ و تێکۆشانەی دڵسۆزانی کورد بۆ خزمەتکردن و پێشخستن و کارکردن بە ئومێدی یەکخستنی زمانی کوردی لە ئەم تێکستە کورتە نابینرێ. بۆ نمونە کارەکانی تری (ڕێزمانی و وێژەیی) خودی جگەر خوێن کە لە پێناوی گەشەکردنی زمانی کوردی کردوویەتی لە ئەم تێکستە نابینرێت.

## کەلتووری کۆنتێکست The Cultural Context

هەموو دۆخی کۆنتێکستێک هەردەم بەپێی ڕەنگەکانی ئەو کەلتووری کۆنتێکستە دێتە نەخشاندن کە دەوروبەری ئەو دۆخی کۆنتێکستە دەدەن. مەبەست لە کەلتووری کۆنتێکست ئەو ڕێسا و نەریەت و هەڵسوکەوتانەیە کە بەندە بە بژێویی کۆمەڵێک خەڵک لە پانتایی ماوەیەک. هەموو تێکستێک هەڵقوڵاوی ئەو کەلتوورەیە کە پێی بەندە: تێکست ئاوێنەی کەلتوورە، پارێزەری کەلتوورە و بگۆڕی کەلتوورە. تێکست دەتوانرێت وەکو دۆکۆمێنتێکی کەلتووری بخوێنرێت. لە ئێرەدا مەبەست هەموو جۆرە تێکستێکە: تێکستەکانی سەر ماڵپەڕەکانی ئینتەرنێت، ڕێنماییەکانی کەتەلۆگەکانی ئامێرەکانی پزیشکی و ئەلکترۆنی هتد. بڵاوکراوەکانی وێژەیی، زانستی، یاسایی هتد. و چۆنیەتی چاپکردنیان و بڵاوپێکردنیان، هەروەها مێدیا و ڕیکلام و نامەکانی پۆستی ئەلکترۆنی و پەیامەکانی مۆبایل و زۆری تریش. کەلتووری کۆنتێکست لە ڕێگەی

دۆخی کۆنتێکست بۆ تێکست دێتە گواستن. بۆ کارئاسانی ئەوا کەلتووری کۆنتێکست بەسەر سێ بەش دابەشدەکرێ:

**کەلتووری مادی Material Culture**

زیاتر مەبەست لە ئەو سەرچاوە تەکنیکی و فیزیکانەیە کە مرۆڤەکان لە ژیانی خۆیان بەکاری دەهێنن. لە ڕێگەی ئاستی ئەو تەکنیک و کەرەستە فیزیکانە مرۆڤەکان دەتوانن گەشە بە کەرەستەکانی ئەلکترۆنی و میکانیکی و پرۆسەو بەرهەمی تری تەکنیکی بدەن. ئەمانە لە بەرامبەردا چاوەڕوانی بە ناوەڕۆک و چۆنیەتی دارشتنی ئەو تێکستانە دەبەخشن کە ئێمە بەرهەمی دەهێنین، چاپی دەکەین و بڵاوی دەکەین.

**ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی Social organisation**

ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی دەکرێت بە دیمەنی ئەو کردەوانە بگوترێت کە لە دێرۆکی نەتەوەیەک گەشەی کردەوە و لە ژیانی مرۆڤەکانی کۆمەڵگادا ڕەنگدەداتەوە. بە شێوەیەکی تر، ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی بە ئەو شێوازی هاریکاری و کردەوانە دەگوترێت کە مرۆڤەکان بەرامبەر بە یەکتر دەیکەن. بۆ نموونە بیستنی مۆسیقا لە ماڵان نەریتێکە کە داخوازی بۆ کەرەستەی مادی دەکات. خوێندنەوەی ڕۆژنامە ئەو چاوەڕوانییە دەبەخشێت کە تاکەکانی کۆمەڵ لە کاتی ڤاڵا دەخوازن لە پرسەکانی گشتی ئاگادار بکرێن. کتێبەکانی فێرکاری ئەو چاوەڕوانییە دەبەخشێت کە لە کۆمەڵگا دەزگا هەیە کە ئەرکی فەرمی بۆ پەروەردەکردن پێ سپێردراوە.

## کەلتووری هزری Spiritual culture

کەلتووری هزری بریتییە لە شێوازی ئەو بیرکردنەوانە، بۆچوونانە و بەهایانە کە لە ژیانی مرۆڤەکانی کۆمەڵگادا خۆیان دەنوێنن. لە ئەم چوارچێوەیەدا نوێنەرایەتی گەلێک دیمەن بەر چاو دەکەوێت، لە پەیدابوونی دنیا بۆ باوەڕی خەڵکی بۆ پەیامەکانی ئاینی و تیۆرییەکانی زانستی. چونکە کەلتووری هزری پەیوەندیی بە زۆرینەی خەڵکی هەیە، ئەوا دیمەنی ئایدیاڵی مرۆڤەکان بۆ دنیا دەبێت بە شتێکی هاوبەش. نەخاسمە ئەو تێگەیشتنە قووڵە لەسەر سروشتی ڕاستەقینەی ژیان و پێگەی ئێمەی مرۆڤ لێی کە زۆرجار بێ ئاگاین لێی یان هێندە دڵنیاین لێی کە هەرگیز نایخەینە ژێر پرسیارەوە.

بە گشتی کەلتووری کۆنتێکست ئەو ئاسۆ دەرەکییە دروست دەکات کە تێکست فیزیکانە، کۆمەڵایەتییانە و هزریانە بەرەو ڕووی بەرجەستە دەبێت. هەڵبەت گرنگە بزانرێ کە ئەم یەکانە کۆنکرێت نین بەڵکو دەکرێ درزیان تێبکەوێت و بشکێنرێن. هەر یەکەیەک دژایەتی ناوخۆیی هەیە، بۆ نموونە "تۆ" دەستخۆشی لە گەشەسەندنی تەکنەلۆجی بکەیت بەڵام گومانیشت هەبێت لێی. هەروەها یەکەکان بۆ گروپی جیاجیای دانیشتوانی کۆمەڵگایەک جیاواز دێتە هەڵسەنگاندن. بەپێی ئەم پاشینە، پڕ بایەخە کە مرۆڤ بزانێت بە چی شێوەیەک تێکست ئاراستەی دەکرێت، بە یەک ئاراستە یان بە ئاراستەی بەربڵاو بۆ جۆرەها کێڵگە لە پانتایی کەلتووری کۆمەڵگادا. ئێمە پێشتر گوتمان کە تێکستەکەی جگەر خوێن دەکەوێتە نێو دیسکۆرسی زمانەوانی و مەبەستی تێکستەکە نیشاندانی مەترسی پارچەبوونی زمانی کوردییە. نیشاندانی ئەم مەترسییە، کە خۆی لە خۆیدا واتای داواکارییە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی مەترسییەکە، وەکو داواکارییەکی کۆنکرێتی و بێگۆرانکاری نایەتە تەماشاکردن.

ئێستا نووسەر هەیە کە لە مێدیاکانی بینراو و بیستراو و چاپکراوی کوردیدا بانگەشەی سەپاندنی دیالێکتێک بەسەر دیالێکتەکانی تری کوردیدا دەکات یان باس لە جووت ستاندارد، بەڵکو تەنانەت پێنج ستاندارد، دەکات!

## بونیادی تێکست The Textual Structure

تێکست دەربڕینە- ئەو کاتەی کە ئێمە دەخوازین بیربکەینەوە و ئەرکێک بهێنینە کردن تێکست پەیدا دەبێت. ئێمە بەهۆی وشە گرێ، ڕستەو واتا دروست دەکەین. لەبەر ئەوەی ئەم بەشانە (وشە، گرێ و ڕستە) شێوەی تێکست دروست دەکەن، تاکو ناوەڕۆک و ئەرک، ئەوا ئێمە باسی شێوەی تێکست دەکەین. لە نێوان ئەم بەشانە گەلێک پەیوەندی هەیە کە وەکو تۆڕ دەچن بە نێو یەکدیـدا. بڕوانە ئەم تێکستە کە لە ڕۆژنامەی <u>هاوڵاتی</u> وەرگیراوە لە بەرواری ٢٠١٠-٥-١٨:

وەزارەتی نەوتی عێراق ئاشکرایکرد کە داهاتی نەوتی شاری کەرکوک لە مانگی نیساندا گەیشتۆتە ٨٣٦ ملیۆن دۆلار، بە بڕی دە ملیۆن لە ئەو مانگەدا.
عاسم جیهاد وتەبێژ بە ناوی وەزارەتی نەوتەوە ڕایگەیاند "کۆی گشتیی نەوتی فرۆشراوی عێراق لە مانگی نیساندا، بریتیبووە لە چوار ملیار و ٢٢٢ ملیۆن دۆلار، کە ٥٣ ملیۆن بەرمیل نەوت فرۆشراوە."

سەبارەت بە نەوتی فرۆشراوی کەرکوک، عاسم جیهاد وتی "هەناردەی نەوتی کەرکوک لە مانگی ڕابردوودا دە ملیۆن و سێسەد هەزار بەرمیل بووە، کە فرۆشەکەی بایی ٨٣٦ ملیۆن دولار بووە."

سەبارەت بە نرخی بەرمیلێک نەوت، وتەبێژەکەی وەزارەتی نەوت ئاشکرایکرد کە تێکڕای نرخ، ٧٩.٦٦ دۆلار بووە و نەوتەکەش لە ڕێی بەندەری جیهانی تورکی و بەندەرەکانی بەسرەو تەنکەرەکانی ڕێگای ئەردەنەوە فرۆشراون.

ئێمە بەرە بەرەو وشە دوای وشە بە دوای تێکستەکە دەکەوین، دواتر لە وشەکان بۆ ڕستەکان و بۆ تێکڕای تێکستەکە. بە ئەم جۆرە پانتایی دیتنی ئێمە بۆ تێکستەکە بەرفراوانتر دەکەین، لە یەکە بچوکەکان تاکو یەکە زۆرەکان کە دارشتنەکانیان کەم تاکو زۆر ئالۆزترە. ئێمە لە وشەکانی تێکستەکە دەست پێدەکەین:

وشە Lexicon

ئەم تێکستە لە ١٠٩ وشە پێکدێت کە بە پێی ئەم خشتەیەی خوارەوە دابەش دەکرێتە سەر پۆلە وشەکان:

| | |
|---|---|
| ناو (٥٦) | وەزارەتی ٣، نەوتی٥ ،عێراق ٢، داهاتی، شاری، کەرکوک ٣، مانگی ٣، نیساندا ٢، دۆلار ٤، مانگەدا، عاسم ٢، جیهاد ٢، وتەبێژ، ناوی، نەوتەوە، گشتیی، فرۆشراوی٢، بەرمیل ٢، نەوت٣، هەناردەی، فرۆشەکەی، نرخی، بەرمیلێک، وتەبێژەکەی، نرخ، نەوتەکەش، ڕێی، بەندەری، جیهانی، تورکی، بەندەرەکانی، بەسرە، تەنکەرەکانی، ڕێگای ئەردەنەوە |
| کردار ١١ | ئاشکرایکرد ٢، گەیشتۆتە، ڕایگەیاند، بریتیبووە، فرۆشراوە، وتی، بووە ٣، فرۆشراون |
| ئاوەڵکردار ٥ | بڕی، کۆی، تێکڕای، بایی، ڕابردوودا |
| جێناو ١ | ئەو |
| ژمارە ١٧ | ٨٣٦، ملیۆن ٦، دە ٢، چوار، ملیار، ٢٢٢، سێسەد، هەزار، ٥٣، ٨٣٦، ٧٩.٦٦ |
| ئامرازی یەکگرتن ٥ | و ٥، |
| ئامرازی گەیەنەر ٢ | سەبارەت بە ٢ |
| ئامرازی پێشبەند ١٢ | کە ٤، لە ٦، بە٢ |

*وێنەی ٢٥*. ژمارەی وشە لە تێکستە هەواڵێک.

هەڵبژاردنی جۆری پۆلە وشە دەگەڕێتەوە بۆ جۆری تێکست. ئەم تێکستەی سەرەوە زیاتر ناوی گرتۆتەخۆ بەڕێژەی ٥٠% پتر. هۆکاری زۆری پۆلە وشەی ناویی دەگەڕێتەوە بۆ چۆنیەتی دارشتنی ڕستەکان: بکەری کردارەکانی "گەیشتۆتە، بریتیبووە، فرۆشراوە، بووە و فرۆشراون" کە حەوت کردارن نادیارە (بڕوانە بەشی کردار). لە ئەم تێکستە ژمارەی وشەی ڕێزمانی، واتە ئامرازی یەکگرتن، گەیەنەر و پێشبەند، بریتییە لە ١٩ وشە، کە ئەمیش دەکاتە ١٧.٥% وشەکان. دیسان ڕێژەی ژمارەوشە بریتییە لە ١٥.٥%، هەروەها جێناوێک کە گۆڕانکاری ڕێزمانی بەسەر نایەت، ئەمە بێجگە لە ژمارەیەک ناو وەکو "عێراق، دۆلار، عاسم، جیهاد، نەوت، بەسرە". بە ئەم جۆرە ژمارەی ئەو وشانەی کە لە ئەم تێکستە گۆڕانکاری ڕێزمانیان بەسەر نایەت لە دەوروبەری ٤٠% وشەکانی تێکستەکە دەبێت.

## سینتاکس Syntax

سینتاکس بە واتای چۆنیەتی گرێدانی وشەکان دێت بۆ گرێ و ڕستە. گرێی ناوی **noun phrase** ئەو گرێیەیە کە بە ئاسانی گەشە دەکات و درێژ دەبێت. لە گرێی ناوی یەک وشە ڕۆڵی سەرەکی دەبینێت و وشەکانی تر بە دوای دەکەون، بۆ نمونە: "*وەزارەتی نەوتی عێراق، داهاتی نەوتی شاری کەرکوک لە مانگی نیساندا، وتەبێژەکەی وەزارەتی نەوت*". زۆر بەکارهێنانی گرێی ناویی، لە ڕێگەی پەیوەستەبوونی وشەی تر بە وشەی سەرەکییەوە، بە واتای زمانی نووسین دێت. بە پێچەوانەوە کەمی گرێی ناوی بە واتای زمانی قسە دێت.

ڕستەیەک دەکرێ لە دوو یان پتر ڕستەی سەرەکی پێک بێت، یان لە ڕستەیەکی سەرەکی و پتر لە یەک ڕستەی یارمەتیدەر پێکبێت. ئەم تێکستە لە

چوار ڕسته پێکدێت. ڕستەی یەکەم لە ڕستەیەکی سەرەکی و دوو ڕستەی یارمەتیدەر پێکدێت. ڕستەی چوارەم لە دوو ڕستەی سەرەکی پێکدێت کە بەهۆی ئامرازی یەکگرتنی "و" پێکەوە گرێدراون، ڕستەی سەرەکی یەکەم ڕستەیەکی یارمەتیدەر لەخۆدەگرێت. ژمارەی وشەکانی ڕستەکان زۆرن، بچوکترین ڕسته لە ٢٤ وشه پێک دێت. درێژی ڕستە، واتە زۆری ژمارەی بەکارهێنراوی وشە لە ڕستەدا، بە واتای زمانی نووسین دێت، بە پێچەوانەش.

## هاوهامەنگی cohesion

بۆ ئەوەی تێکست بێتە تێگەیشتن دەبێت تێکستەکە بەرە بەرە زانیاری بە خوێنەر پێشکەش بکات. بە ئەم خەسڵەتەش دەگوترێ هاوهامەنگی یان پەیوەستەیی ڕستەکان لەگەڵ یەکتر. ئێمە لە ئێرە باس لە سێ جۆر پەیوەندی دەکەین: پەیوەندی یەکەیی، پەیوەندی تێمایی و پەیوەندی واتایی.

### - پەیوەندی یەکەیی Reference relation

لە ڕێگەی گرێدانی یەکەکانی بابەتێکی باسکراو تێکست توانای باسکردنی بابەتەکەی هەیە. بڕوانە ئەم پارچە تێکستە هەواڵە کە لە ماڵپەڕی ڕۆژنامەی "هاوڵاتی" لە بەرواری ٢٠١٠-٥-١٨ وەرگیراوە:

**حکومەتی هەرێمی کوردستان، داوای بیست کرێکاری کوردی کارگەی نەسیجی حلله لە نەقڵکردن بۆ دامودەزگاکانی هەرێم ڕەتدەکاتەوە. لە کاتێکدا ئەو کرێکارانە ژیانیان لە مەترسیدایەو هەفتەی ڕابردوو بەهۆی تەقینەوەوە یەکێکیان کوژراوە.**

گرنگترین یەکەی ئەم تێکستە "کرێکار"ە کە سێ جار دوبارە دەبێتەوە. لە ڕستەی یەکەم زانیاری زۆر دەربارەی ئەم کرێکارانە پێشکەش کراوە. لە ڕستەی دووهەم دوو جار ئاماژەی پێکراوە "ئەو کرێکارانە، یەکێکیان"، بێجگە لە زانیاری زیاتریش. گرێدانی ئەم یەکانە "بیست کرێکاری کورد- ئەو کرێکارانە- یەکێکیان" پەیوەندی نییە بە واتا، بەڵکو پەیوەندی ئاماژەدانی بە ئەو وشەیەی کە پێشتر باسکراوە هەیە. بڕوانە ئەم نمونەی خوارەوە کە هەمووی ئاماژە بە هەمان مرۆڤ دەکات:

سەرۆکی کۆماری کوردستان، پێشەوا قازی محەمەد لە گۆڕەپانی چوارچرا لە مهاباد لە سێدارە درا. سەرۆک لە پێناوی نەتەوەکەی خۆی کردە قوربانی ... پێشەوا نەترسانە ڕووبەڕووی مەرگ بووەوە و ... قازی محەمەد ... ئەو...

- پەیوەندی تێمایی Theme relation

بە تەنها تیشک خستنەسەر یەکەکانی تێکستک و گرێدانیان لەگەڵ یەکتر بەس نییە بۆ ئەوەی تێکستەکە هاوهامەنگی هەبێت، بەڵکو هاوهامەنگییەکە دەبێت بەپێی ڕێکخستن بێت. مەرجێکی زۆر گرنگ ئەوەیە کە زانیاری نوێ لەسەر زانیاری کۆن بێتە دارشتن، واتە ئەوەی خوێنەر نایزانێت دەبێت لەسەر ئەوە دابڕێژرێت کە هەر ئێستا لە لای خوێنەر زانراوە.

هێنانەکایەی هاوهامەنگی لە ڕێگەی گرێدانەوە بە پاشتر و ئاماژەدان بە پێشتر دەکرێت بەهۆی دوو چەمک باسبکرێت: تێما و ڕێما Theme & Rhyme. تێما خاڵی دەستپێکە، ئەوەی کە مرۆڤ لە ڕستەیەکدا باسی دەکات. "*حکومەتی هەرێمی کوردستان، داوای بیست کرێکاری کوردی کارگەی نەسیجی حلە لە نەقڵکردن بۆ دامودەزگاکانی هەرێم ڕەتدەکاتەوە.*" تێما "حکومەتی هەرێمی

کوردستان"ە کە دەکرێت بگوترێت لەلای زۆربەی خوێنەران زانراوە، بەڵام هەواڵی نوێ، واتە ڕێما، ***دلوای بیست کرێکاری کوردی کارگەی نەسیجی حللە لە نەقڵکردن بۆ دامودەزگاکانی هەرێم ڕەتدەکاتەوە***، یە. سەرنج بدە لە ڕستەی دووهەمی ئەم هەواڵەتێکستە کە لەسەر ئەم ڕێمایە سەرچاوە دەگرێت و دوبارەی دەکاتەوە. تێکست بە ئەم جۆرە سەرنجی خوێنەران بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت. واتە زانیاری نوێ، ڕێما، لە ڕستەی یەکەم دەگۆڕرێت بە زانیاری زانراو، تێما، لە ڕستەی دووهەم.

ئاساییانە ئێمە لە کاتی پەیوەندیکردن لە ئەو تشتە دەستپێدەکەین کە زانراوە و بۆ ئەوە دەڕۆین کە نەزانراوە، لە ئەوە دەستپێدەکەین کە ئێمە دڵنیاین لێی بۆ ئەوە دەڕوین کە دەیخەملێنین، لە ئەوەی کە پێشتر ئامـاژەی پێکراوە بۆ ئەوەی کە پاشتر باسی دەکەین. بە ئەمەش دەگوترێت پرینسیپی تێما-ڕێما.

**پەیوەندی واتایی Semantic relation**

لە بەرامبەردا پەیوەندی واتایی-ش هەیە: **حکومەتی هەرێمی کوردستان — کرێکاری کوردی**. کرێکارەکان کوردن بۆیە لەگەڵ حکومەتی کوردستان پەیوەست دەکرێن، هەروەها **کرێکار — کارگە** چونکە شوێنی کارکردنی کرێکار کارگەیە. بڕوانە ئەم نمونەیە:

گەندەڵی لە زیادبووندایە بۆیە من باوەڕم بە حکومەت نەماوە.

هیچ جۆرە پەیوەندییەکی یەکەیی یان تێمایی نییە. لەگەڵ ئەمەش هاوهامەنگییەکی توند لە نێوان هەردوو بەشەکانی ڕستەکە هەیە کە هەر یەکێکیان باس لە دوو دیاردەی یان ڕەوشی جیاواز دەکەن. لە ڕاستیدا پەیوەندییەکی "هۆکاری" لە نێوان هەردوو بەشی ڕستەکە هەیە. "گەندەڵی"

کاریگەری لەسەر متمانەو باوەڕهێنان بۆ حکومەت دادەنێت. ئەم پەیوەندییە لە ڕێگەی وشەی "بۆیە" پتر دەردەکەوێت. بە ئەم جۆرە نیشانانە کە لۆجیکانە دوو ڕستە پێکەوە دەبەستێتە دەگوترێ نیشانەکانی پەیوەندی، خودی پەیوەندییەکەش پەیوەستەبوونە. وەکو زمانبەکارهێنەر مرۆڤ بە ئاسانی دەتوانێت ئەم وشانە لەگەڵ یەکتر پەیوەست بکات: گەندەڵی- دەستەڵات- دامودەزگا- حکومەت، یان، بازاڕ- گرانی- پارە- دراو- هتد.

بە کورتی پێنج کۆمەڵ پەیوەندی واتایی هەیە: خستنەسەر، کاتی، مەرجی، پێچەوانەیی و هۆکاری. بڕوانە وێنەی خوارەوە:

| کۆمەڵەکان و بن کۆمەڵەکان | نموونەکانی بەستنەوەیی |
|---|---|
| خستنەسەر Additive | و، دیسان، هەروەها |
| بەدوا هاتن | یەکەمین، دووهەمین |
| ئەڵتەرناتیڤ | یا، یان، یاخود |
| نموونەکردن | بۆ نموونە، لە ئەوانە |
| داڕشتنەوە | بە ولتایەکی تر، بە جۆرێکی تر، بە شێوەیەکی تر |
| شوێن | لە ئەوێ، لە ئێرە، ئەوێ، ئێرە |
| کات Temporal | ئەو کات، ئەو ڕۆژانە-، ئەو ساڵانە، ئەو دەمانە |
| پێچەوانەیی Contrastive/concessive | بەڵام، لێ، بەڵکو، بە پێچەوانەوە |
| مەرجی Conditional | ئەگەر |
| هۆکاری Causal | لەبەرئەوەی، بۆیە، چونکە، لەوما، لەوڕا |
| هۆیی reason | بە ئەم شێوەیە، بە ڤی ئاوایی، هوسا |
| بوونەهۆ consequence | بۆ ئەوەی |
| مەبەست purpose | |

وێنەی ٢٦ . هەندێک لە وشەکانی چوار کۆمەڵی سەرەکی پەیوەندی واتایی.

## پێکهاتەی تێکست Text Structure "architecture of texts"

تێکست تشتێکی پێکەوە بەستراوە. تێکست لە چەند بەشێکی قەبارە جیاواز پێکدێت، کە بەپێی ڕێکخستنێک بە دوای یەکتر گرێدراون. بە ئەمەش دەگوترێت پێکهاتەی تێکست. ئێمە لە ئێرە سەرنج دەدەینە ئاستە بەرزەکانی تێکست، کە پەیوەندە بە چوارچێوەی گشتی تێکست. ئێمە پێشتر لە ئەم بەشەدا باسی ئاستەکانی وشە و ڕستە-مان کرد بەڵام ئێستا کاتی باسکردنی پێکهاتەی تێکست دێت لە سێ ڕوانگەوە: دیمەنی تێکست؛ یان چۆن تێکستەکە لە ڕوانگەی ئەرکییەوە دامەزرێندراوە، ڕێکخستن؛ یان چۆن تێکستەکە لۆجیکانە بە یەکتر گرێدراوە، هەروەها میتاتێکست؛ یان چۆن تێکستەکە لەگەڵ خۆی دێتە گفتوگۆ.

- دیمەنی تێکست Text monster

سەرنجی ئەم "پەیامە" تێکستە بدە!

**پەیڤا سەرۆکێ زانکۆیێ**

زانکۆیا دهۆک ب خێرهاتنا قوتابی و خویندکارێن خۆ دکەت، ئەڤرۆ زانکۆیا دهۆک یا بویە بنگەهەکێ زانستی یێ پێشکەفتی ل دەڤەرێ و باوەر پێکەر ل ناڤ زانکۆیێن جیهانی، هەموو پێدڤیێن باوەرنامان یێن تێدا پەیدابوین.

سەرویەرێ ناڤ زانکۆیێ ژ ئاڤاهی و گورەپان و هولێن وەرزشی و سەنتەرێن رەوشەنبیری، زەمینەک پەیداکریە ب تایبەت بۆ قوتابییان کو دەمێن خوش ببورینن.

دیسان ل زانکۆیا دهۆک پتر ژ سەنتەرەکێ ڤەکۆلینان هاتیە دانان و لابورێن پێشکەفتی و باش یێن لێ هەین و ئەڤە دەلیڤا ڤەکولینان بەرفرەهـ تر لێ دکەت. هەروەسا بنگەهێن جودا جودا شیرەتکاری بۆ چارەسەرییا کێشان.

هەر قوتابیەک بهێتە زانکۆیا دهۆک، دێ مفایەکێ باش بینیت.. پێش بهێنە زانکۆیێ دشێن لێگەریانەکێ ل ناڤ سایتێ مە بکەن دا هایداری هەموو کارو خزمەتێن زانکۆیێ ببن.

دکتور عسمەت محەمەد خالد

سەرۆکێ زانکۆیێ

وەکو چەشنێکی نووسین ئەم تێکستە، بێجگە لە بەشێکی تەرخانکراو بۆ بەخێرهاتن، هەوڵ دەدات زانیاری دەربارەی زانکۆی دهۆک و گرنگی ئەم زانکۆیە لە بەدەستهێنانی بڕوانامە بۆ خوێنەران بخاتەڕوو. مەبەست کاریگەری لەسەر پێکهاتەی تێکست دادەنێت، بە جۆرێک بەشە جوداکانی تێکست ئەرکی جیاوازیان دەبێت – بەشێکی تێکستەکە بۆ بەخێرهاتن تەرخاندەکرێت، بەشێکی تر بۆ ناساندنی زانکۆ، بەشێکی تر بۆ گرنگی زانکۆ هتد. دابەشکردنی ئەرکەکانی تێکست بەپێی دیمەنی "پەیامی سەرۆکی زانکۆ" دەبێت. دیمەنی تێکست بەپێی چەشنی تێکستەکە دەگۆڕێ.

بەپێی ئەو ئەرکانەی کە تێکستێک لە کۆنتێکستەکەی هەیەتی ئەوا دەکرێت ئەرکە جوداکانی هەر بەشێک لە تێکڕای دیمەنی تێکستەکە بخرێتەڕوو. هەر بەشێکی سنوردارکراوی تێکست لەگەڵ ئەرکێکی ئاشکرا پێی دەگوترێت ***هەنگاو/پێنگاڤ***. خوێنەر دەتوانێت دیمەنی یاری شەترەنج بهێنێتە یادی کە هەنگاو دوای هەنگاو لە مەبەست نزیک دەبێتەوە. بەپێی ئەم دیمەنە تێکست لە ژمارەیەک هەنگاو پێکدێت کە یەک لە دوای یەک بەرەو مەبەستی گشتی و سەرەکی ئاراستە دەگرێت. ئێستاش بفەرموون لەگەڵ بوونیادنانەوەی The reconstruction of the text ئەم تێکستە:

هەنگاوی یەکەم: بەخێرهاتن (ڕستەی یەکەم لە پارچەی یەکەم)

هەنگاوی دووهەم: زانیاری و پڕوپاگەندە (ڕستەی دووهەم لە پاش کۆما لە پارچەی یەکەم)

هەنگاوی سێهەم: زانیاری لەسەر بەشەکانی خزمەتگوزاری زانکۆ لە دەمی ڤالآو بایەخی جودا جودای خوێندکاران (پارچەی دووهەم).

هەنگاوی چوارهەم: زانیاری لەسەر بەشەکانی لێکۆڵینەوە و جڤاکی (پارچەی سێهەم)

هەنگاوی پێنجەم: دڵنیاکردنەوە و داخوازیکردن (پارچەی چوارهەم)

مەبەستی گشتی ئەم پەیامەتێکستە پێشکەشکردنی زانیاری و ڕاکێشانی خوێندکارانە بۆئەوەی لە ئەم زانکۆیە ناوی خۆیان تۆمار بکەن و لە ئەوێ بخوێنن.

- ڕێکخستن Disposition

ئەو پرینسیپانە چین کە بەشەکانی سەرەکیی تێکستێک پێکەوە دەبەستێتەوە؟ لە ئێرەدا باس لە ڕێکخستنی تێکست دەکرێت text disposition.

ئاسانترین و گرنگترین شێوە بۆئەوەی پەرە بە تێکستێک بدرێ باسکردنە. ئەمەش باس لە بەدواچوونی کات دەکات، یان ڕێکخستنی کاتی time disposition. ئەگەر کاتی ئاماژەپێکراوی نێو بەسەرهاتەکە لەگەڵ بەرەوپێشچوونی تێکستەکە بگونجێت، ئەوا مرۆڤ باس لە کرۆنۆلۆجی chronology دەکات بەلآم دەکرێ کرۆنۆلۆجییەکە هەڵگەڕاوە بێت، بڕوانە پارچەی یەکەمی هەواڵە تێکستی پێشوو:

حکومەتی هەرێمی کوردستان، داوای بیست کرێکاری کوردی کارگەی نەسیجی حلله لە نەقڵکردن بۆ دامودەزگاکانی هەرێم ڕەتدەکاتەوە، لە کاتێکدا

ئەو كرێكارانە ژيانيان لە مەترسيدايەو هەفتەی ڕابردوو بەهۆی تەقينەوە يەكێكيان كوژراوە.

كاتێک شوێنی جياواز لە تێكستێكدا بێتە ديتن ئەوا مرۆڤ باس لە ڕێكخستنی شوێنی دەكات place disposition. بڕوانە "حكومەتی هەرێمی كوردستان، كارگەی نەسيجی حلله و دامودەزگاكانی هەرێم".

لە زۆربەی ئەو تێكستانە كە ئێمە دەيانخوێنينەوە ئەوا شتێک دەبێتە هۆكاری هێنانەدیی شتێكی تر، ئێمە بە ئەمە دەبێژين ڕێكخستنی بوونەهۆيی. بڕوانە تێكستی سەرەوە كە وشەی "مەترسی" بووە بە هۆكاری پەيدابوونی وشەكانی "داوای، حكومەتی هەرێمی كوردستان" و تێكڕای تێكستەهەواڵەكە.

لە بەرهەمهێنانی تێكست دەكرێ تشت و ديارده لەگەڵ هيتر بەراورد بكرێت، ڕێكخستنی بەراوردكاری comparison disposition. لە ئێرە باس لە هاوتەريبی و پێچەوانەيی parallel & contrastive دەكرێ و بە جۆرێک كە تيشک دەخرێتە سەر لێكچوون و لێكنەچوون similarity & dissimilarity.

شێوازێكی فرە ئاساييتر بۆ پەرەپێدانی تێكستی لێكۆڵەرەوەيی يان تێكستی باسكەر ڕوانينی بابەتەكەيە لە چەند ڕوانگەيەكەوەو دواتر ڕێكخستنی تێكستەكە بەپێی ئەم ڕوانگانە كە تێكستكەی لێ بەرهەمهاتووە. ئەگەر ئێمە باس لە دامەزراندنی مامۆستايان بكەين ئەوا دەكرێ باس لە شوێنی دامەزراندن، كاتی كاركردن، مووچە هی تر بكەين. لە ئێرەدا تێمايەكی سەرەكی دەبينرێ بەجۆرێک چەند تێمايەكی بچوک بەدوای خۆی دەهێنێت، ئەمەش پێی دەگوترێت ڕێكخستنی تێمايی theme disposition. بە سادەيی ڕێكخستنی تێمايی واتای پتركردن additive دەبەخشێت، بۆ نمونە لە دە گۆشەنيگاوە/ڕوانگەوە دەڕوانينە بابەتێک.

### -میتاتێکست Metatext

نائاسایی نییە ئەگەر تێکست لەسەر خۆی بدوێت، بۆ نمونە لە تێکستێک ئەمە ببینرێت؛ "ئەم بەشە دەربارەی ...". ئەم جۆرە بەشەی تێکست پێی دەگوترێت میتاتێکست؛ واتە تێکست لەسەر تێکست. بە دەستەواژەی وەکو "وەکو پێشتر ئاماژەی پێدرا، بەپێی ئەم باسکردنە، بەپێی ڕوونکردنەوەی سەرەوە، لایەرەکانی داهاتوو و هی تر" تێکست ئاماژە بەخۆی دەدات. ئێستاش لەگەڵ چەند نمونەیەکی تر:

ئەم راپۆرتە دەخوازێت ... ئەم باسکردنە لە ئەو لێکۆڵینەوە سەرچاوە دەگرێت کە ... بەپێی هەواڵەکە ئەوا ... بە گوێرەی ڕوونکردنەوەکانی سەرەوە ئەوا ... ئەم بەشە لەسەر ئەوە دەدوێت کە ... ئەم کتێبە لە ...

### ناوەڕۆک یان بونیادی کەسایەتیی تێکست The ideational structure

ئاساییانە مەبەستی مرۆڤ لە خوێندنەوەی تێکستێک بەدەستهێنانی زانیارییە، زانینی بۆچوونی جیاوازو تێگەیشتنی گشتی سەبارەت بە جۆرەها پرس و بابەت. هەربۆیە خوێندنەوەی چالاک واتای تێگەیشتنی ناوەڕۆکی تێکست، یان بونیادی کەسایەتیی تێکست، دەدات. تێکستەکە دەربارەی چییە؟ ئەو کەسەی لە پاش تێکستەکەوەیە بە کام چاو دەڕوانێتە ئەوەی کە هاتۆتە دەربڕین؟

هەڵبەت ناوەڕۆکی تێکست هەمیشەو بۆ هەموو کەسێک ڕۆشن نییە. ناوەڕۆک تشتێکی دامەزراو نییە کە خوێنەر هەڵی بگرێت لە تێکست. مرۆڤ دەتوانێت بڵێت کە ناوەڕۆکی تێکست خاوەن "توانای گۆڕانکارییە"- ڕیزێک لە ئەگەری واتای پەرتەوازەیە، کە بەپێی دۆخێکی گونجاو دەبن بە ڕاستیی. ئەمەش واتای

ئەوە دەبەخشێت کە بەشێک لە ئەم واتایانە دەبن بە ناوەڕۆکی هەنووکەیی و بایەخدار بۆ هەندێک خوێنەر لە هەندێک ڕەوش.

هەروەکو پێشتر، ئێمە تێکست دەخەینە نێو ئەو ڕەوشەی کە تیایدایە. لە ئێرەدا بە تایبەتی بایەخ بە دۆخی کۆنتێکست و ئەو چالاکییەی کە تێکست دەکەوێتە نێوی دەدرێ. دیسان باس لە بوونیادی تێکست دەکرێ، چونکە ناوەڕۆکی تێکست لە ئاستێکی بڵند پەیوەندی بە شێوازی دارشتنی تێکست هەیە، بەجۆرێک هەمان بیرۆکە لە دوو لایەن تەماشادەکرێت، واتە لە شێوەی تێکست و کەسایەتی. لە ئەم چوارچێوەی بونیادی کەسایەتیدا ئێمە باس لە سێ بیرۆکەی سەرەکی دەکەین: **تێما** یان ئەوەی کە تێکستەکە دەربارەیەتی، **پێشنیار** یان ئەوەی کە تێکستەکە ئاراستەیەتی، هەروەها **ڕوانگە** یان ئەو گۆشەنیگایانەی کە کاریگەریان بەسەر تێما/کان و پێشنیار/ەکان هەیە.

**تێما Theme**

تێکست هەمیشە بیرکردنەوەکانی خوێنەر بەرەو ئاراستەیەک ڕادەکێشێت. ئێمە بە ئەو تشتە ئاراستەکراوە دەبێژین تێما. تێما ئەو تشتەیە کە تێکڕای تێکستەکە یان پارچەیەکی یان بەشێکی تێکستەکە دەربارەیەتی. بە جۆرێکی تر، بە گشتی تێکستەکە یان بەشێکی دیاریکراوی تێکستەکە دەربارەی چییە؟ لە گۆشەنیگای زمانەوانییەوە وەڵامەکە گرێی ناوی-یە. ئەوەی کە ئێمە باسی دەکەین تشت-ێکە. ئەم تشتەش بە وشە دێتە دەربڕین. تێگەیشتنی ئێمە بۆ ئەو تێکستەی خوارەوە بەرەو ئاراستەی "نڤیسین" دەچێت، کە هەڵبەتە تێکستەکە باس لە ئەمە دەکات. بەڵام ئەگەر خوێنەر پتر سەرنج بداتە تێکستەکە دەبینێت کە تێکستەکە دەربارەی بابلی و میسرییەکانیشە. بە گشتی وشەکانی تێکستەکە دەستنیشانی تێما سەرەکییەکانی تێکست دەدەن. ئەم وشانەش ئاساییانە ناو-ن.

ئێمه پێشتر له بونیادی تێکست باسمان له تێما کرد. ئەوە ئاشکرا بووە کە نزیکایەتییەکی زۆر لە نێوان بونیادی تێکستی و بونیادی کەسایەتیی تێکست هەیە. ئێمه له بونیادی تێکست ئاماژەمان بە خەسڵەتەکانی ڕێزمانی تێماو گرنگیی تێما بۆ گرێدانی ڕستەکان کرد. لە بونیادی کەسایەتیی تێکست، ناوەڕۆکی تێماو بابەتی گشتیی تێکستەکە دەبێت بە جێگای بایەخ. بڕوانە ئەم تێکستە:

نڤیسین

ئەم د پشت راستین ئەگەر نهۆ ئێک بێژیته تە: (بێ زەحمەت وێ کتێبێ بکە د وێ تەنویرێ دا بلا هشک ببیت و سۆر ببیت). دێ ب مەندە هۆشی ڤەلێ نێڕی، لێ نە کاکە گیان مەندە هۆش نەبە، ژ بەرکو بەری هزاران سالا نڤیسین ب تیرۆژکێن رۆژێ و ئاگری هشک و سۆر دکرن.

بابلیا و میسرییا نڤیسینێن خۆ یێن تایبەت هەبوون، بۆ هەر پەیڤەکێ یان ناڤەکی یان مەرەمەکێ یان پیتەکێ نیشانەیەک دانابوو، کۆ نڤیسینا وان ژ نڤیسینا مە یا نهۆ زۆر گرانتر بوو ژ بلی نەبوونا پێنڤیس و کاغەزا.

بابلیا هەڕی دئینا وەکی قالبەکێ ڕێکوپێک د بڕی و پاشی ب تشتەکێ سەر تیژ چ قیابا دا ل سەر وی قالبی دنڤیسن، پاشی ئەگەر تیرۆژکێن رۆژێ زۆر د گەرم بانە دا داننە بەر تاڤێ هەتا ئەو بخۆ هشک و سۆر دبوو یان د تەنویرێ دا جوان سۆر دکر، مێژوونڤیسان زۆر ژ وان قالبان ڤە دیتینە کۆ هندەک ژ وان پێشی دوو هەزارو پێنجسەد سالا ل سەر هاتینە نڤیسین.

**ماکرۆتێما و میکرۆتێما Macro-theme and micro-theme**

له ڕێگەی وشەی ناونیشانەکەوە ئەوا خوێنـەر دەزانێـت ئـەم تێکسـتە بـاس لـە چی دەکات: نڤیسین. چونکە هەموو تێکستەکە باس لە ئـەم "وشـە" دەکـات ئـەوا نووسـەر بـاس لـە بابـەتـی سـەرەکـی دەکـات یـان ماکرۆتێمـا. بێجگـە لـە ئـەمـە، پارچەکانی ئەم تێکستەکە ماکرۆتێمای خۆیان هەیـە. کتێـب ماکرۆتێمـای پارچـەی یـەکـەمـی تێکـستەکـەیـە بـەڵام دەبێـت بـە بابـەتێکـی لابـەلا یـان میکرۆتێمـا بـۆ تێکستەکە. کە تێما بە شێوەی سەرەکی و لابەلا هەیە دەبێت وەکو مـەرجێـک بـۆ پتەو کردنی پارچە و بەشەکانی هەر تێکستێک بێتە خەملاندن. کە بـاس لـە تێمـا دەکرێت وەکو تێمای سەرەکی و لابەلا پەیـوەنـدیی بـە هێرارکـی Hierarchy گـشت ئاستە بەرزو نزمەکـانی تێکـست هـەیـە. بابـەتێکـی لابـەلا یـان میکرۆتێمایـەک کـە پەیوەندی نەبێت بە بابەتێکی سەرەکییەوە یان ماکرۆتێمـاوە ئـەوا وەکـو تـشتێکی نامۆ و دوور لە هێڵی ئاراستەکراوی تێکست دێتە تەماشاکردن.

ماکرۆتێماو میکرۆتێما دوو وشەن کە واتای ڕێژەییـان هـەیـە. هـەردوو وشـەکـە دەکرێ گرێدراوی جۆرەها ئاستی هەمان تێکست بن. ئـەوەی کـە میکرۆتێمایـە بـۆ تێکڕای تێکستەکە (کتێب، بابلی و میسرییا هتد.) دەتوانێـت ببێـت بـە ماکرۆتێمـا بۆ پارچەیەکی تێکستەکە. لە وشەکانی تێکستەکـە دەتوانرێـت سیـستەماتیکییانـە تێما بەسەر سێ ئاستدا دابەش بکرێت:

**نڤیسین** (ماکرۆتێما بۆ تێکڕای تێکست)

**کتێب** (ماکرۆتێما بۆ پارچەی یەکەم؛ میکرۆتێما بۆ تێکڕای تێکست)

**بـابلی و میـسرییا** (ماکرۆتێمـا بـۆ پارچـەی دووهـەم؛ میکرۆتێمـا بـۆ تێکـڕای تێکست)

**پەیڤ، ناڤ، مەرەم و پیت** (میکرۆتێما بۆ پارچەی دووهەم)

- تێمای دیار و تێمای نادیار Explict theme and implicit theme

ئاساییانە لە ئاخافتنێکی خۆبەخۆ تێما دیارە- ئێستا چی گوتراوە و ئێستا چی ڕوودەدات. بەڵام لە تێکستی نووسراو نووسەر نازانێت کەی و لە کوێ تێکستەکە ڕووبەڕووی خوێنەرانی دەبێتەوە. لەوما/بۆیە زۆر گرنگە کە تێکست بە زوویی ڕۆشنایی بخاتە سەر بابەتەکەی، هەروەکو ناونیشانی تێکستەکەی سەرەوە "نڤیسین". لە ئەوێ ماکرۆتێما ئاشکرا دیارە. ئاساییانە تێما لە سەرەتای هەر کەپیتاڵێک، هەر بەشێکی بابەتێک ئاشکرا دیارە. لە بەرامبەردا، تێما لە پارچەیەکی، بەشێکی پارچەیەکی تێکست دەکرێت نادیار بێت، یان هزری یانە لێتێگەیشتراو بێت. لە تێکستەکەی سەرەوە، بۆ نمونە لە پارچەی یەکەم، بەدەر دەکەوێت کە تێما زۆر ڕوون نییە بەڵکو نادیارە. هەروەها لە پارچەی دووهەم مرۆڤ دوودڵ دەبێت کە ئایا "بابلی و میسرییا" یان "نڤیسین" تێمای دیاری ئەم پارچەیە بێت. نموونەیەکی تر ئەم هۆنراوەیە کە لە سەر کەڤالی/تابلۆی دۆکانێک یان کۆگایەک نووسراوە: .

بە دەستی بەتاڵ بڕۆی نادیاری ..... دیاری پێویستە بۆ یادگاری

مەبەستی نادیار لە نووسینی هۆنراوەکە لە لایەن دوکاندارەکە کڕینی شمەکە لە دوکانەکەی ئەو. هەڵبەت مەبەستەکە هزریانە ئاشکرایە.

شێوازێک بۆ بەدیاریخستنی تێما دانانی سەردێرە topic. شێوازێکی تر بەکارهێنانی شوێنە position. شوێنی ستراتێجی تێما سەرەتایە، بۆ نموونە لە سەرەتای داڕشتنی ڕستە. شێوازێکی تری بەدەرخستنی تێما جەختخستنەسەرە focusing. لە داڕشتنی پێشکەشکردندا تیشک دەخرێتە سەر و دواتر بەهۆی میتاتێکستەوە دووبارە دەکرێتەوە؛ لە ئەم کتێبەدا، ئەمە، ئەمانە هتد.

### پێشنیار Propositions

تەنها باسکردنی تێما هیچ دەربارەی ناوەڕۆک نالێت. ئێمە دەبێت وەڵامی ئەم پرسیارەش بدەینەوە: "تێکستەکە چی دەبێژێت دەربارەی تێماکانی — ئەو پێشنیارانە چین کە دەربارەی ئەم تێمایانە هەیە؟ پێشنیار چەمکێکە کە لە بنەڕەتدا لە لۆجیک هاتووە. ئەمەش واتای تشتێک دێت کە دەخرێتە بەرچاو یان دەخرێتە بەردەم. بە دەستەواژەیەکی تر پێشنیار گوتەیەکە لەسەر تێما. بڕوانە هەردوو پارچەی یەکەم و دووهەمی "نڤیسین" کە دەربارەی هەمان تشتە، هەمان تێما "نڤیسین" بەڵام بە پێشنیاری جودا تێماکە دەخەنە بەردەمی خوێنەر. ئاساییانە پێشنیار لە ڕێگەی ڕستە دێتە دەربڕین، بە پێچەوانەی تێما کە لە ڕێگەی گرێی ناوی دێتە دەربڕین. گرێی ناوی دەکرێت لە تەنها وشەیەک/ناوێک پێکهاتبێت.

هەروەکو تێما، ماکرۆ- و میکرۆپێشنیار-یش هەیە (پێشنیاری سەرەکی و پێشنیاری ورد). بڕوانە ئەم تێکستەی خوارەوە کە لە لایەن د. حەمید باقی لە زانکۆی دهۆک نووسراوە. پێشنیاری سەرەکی پارچەی یەکەمی تێکستەکە "زانکۆ جهێ زانست و زانیاریانە"یە. هەر لە هەمان پارچەدا، کە لە ڕستەیەکی درێژ پێکدێت، وردە پێشنیار خراوەتە بەردەم "<u>ئارمانجێن هەرە سەرەکی یێن زانکۆیێ ڤەکۆلین و دووڤچوونێن زانستی نە</u>، کو <u>بزاڤ تێدا دهێتەکرن بۆ گەهشتنا راستییێ و پێزانینێن راست و دروست</u>، <u>پاراستنا کەلتوریێ مرۆڤایەتییێ یێ زانستی و شارستانی و ڤەگوهاستنا وێ ژ دەستەکێ بۆ دەستەکێ دی</u>". لە ڕاستیدا ئەم وردە پێشنیارانەش دەکرێت وردتر بکرێت.

زانكۆ (مالا مللەتی)یە

زانكۆ جهێ زانست و زانیاریانە، ئێک ژ ئارمانجێن هەرە سەرەكی یێن زانكۆیێ ڤەكۆلین و دووڤچوونێن زانستینە، كو بزاڤ تێدا دهێتە كرن بۆ گەهشتنا راستیێ و پێزانینێن راست و دروست، پاراستنا كەلتوورێ مرۆڤایەتیێ یێ زانستی و شارستانی و ڤەگوهاستنا وی ژ دەستەكێ بۆ دەستەكێ دی.

زانكۆ وەک مەلبەندەكێ ڤەكۆلینێن زانستی، بەردەوام كاری دكەت كو جڤاكێ بەرڤ پێشڤەچوونێ بگوهوریت و گەشێ د ناڤ كۆمەلیدا پەیدا بكەت د هەموو بواراندا (هزری، رەوشەنبیری، جڤاكی، ئابوری و سیاسی ... هتد). دەمێ زانكۆ دەرچوویێن خوە ئامادە دكەت و ب زانست و زانیاریێن تازە د هەمی بواراندا چەكدار دكەت، ئەوێ دڤێت لەشكرەكێ زۆر ژ دەرچوویان ئامادە بكەت بۆ گوهورینا جڤاكی بەرەڤ پێش؛

چونكو ئەڤ كەسە دێ بزاڤی كەن ئابۆری پێش بێخن ل دوڤ نەخشێن نو و پێشكەفتی، كارگێریێ رێكوپێک بكەن، داهاتی ب رەنگەكێ دادپەروەرانە ل سەر هاولاتیان بەلاڤبكەن، ئاستی رەوشەنبیری بلند بكەن، سیاسەتێ و پەیوەندیێن جۆراوجۆر ب هێز بێخن و خورت بكەن ژ بۆ بەرژەوەندیا گەل و وەلاتی، ئانكو زانكۆ هەموو كارتێكرنێن و كاریگەریێن رەوشەنبیری و ئابۆری و سیاسی و جڤاكی پێكڤە گرێ ددەت ژ بۆ خزمەتا وەلاتی و گەشەكرنا گشتی یا كۆمەلێ.

تێما جەخت لەسەر هەندێک ڕوانگە بۆ بابەت دەكات بەڵام پێشنیار ڕوانگەكانی تێكستەكە ڕۆشنتر دەكات و مەبەستی تێكستەكە ئاشكراتر دەكات.
لە ڕستەی یەكەمی پارچەی دووهەمی تێكستەكەی سەرەوە تێمای سەرەكی "گۆڕانكاری و گەشەسەندن"ە. تێمای ورد "گۆڕانكاری و گەشەسەندن لە

ئێمە لە ئێرەدا باس لە ئەو پرۆسانە دەکەین کە بە پێشنیارێک دەتوانرێت باسیان بکرێت، هەروەها کام بەشداربوو دەتوانێت لە ئەم پرۆسانە بێتە تێگلاندن، مەبەستی دوای ئەم شیکارکردنە ئەوەیە کە هەمیشە دارشتنێکی زمانەوانی لە پاش باسکردنی هەر تشتێک هەیەو ئەم باسکردنەش هەردەم ڕوون و ئاشکرا نییە. وا بخەملێنە کە تۆ ڕووداوێکی هاتوچۆ دەبینیت. بۆ نیشاندانی هۆکاری ڕووداوەکە، تۆ وەکو گەواهیدەر، دەتوانیت بڵێیت "شۆفێرەکە ئۆتۆمبیلەکەی خێرا دەهاژوت". دیسان تۆ دەتوانیت بڵێیت "ئۆتۆمبیلەکە کۆنترۆڵی نەمابوو".

لە باری یەکەمدا پێشنیارەکە دەربارەی کردەوەیەکە "ئۆتۆمبیلەکەی خێرا دەهاژوت" کە مرۆڤێک "شۆفێرەکە" لێپرسراوە لێی. لە باری دووهەم پێشنیارەکە دۆخێک نیشان دەدات "نەمابوو" کە لە ئەوێدا تشتێک "ئۆتۆمبیل" خەسڵەتی "کۆنترۆڵی نەمابوو"ی پێدەدرێ. هەردوو پێشنیارەکە دەتوانێت زۆر باش باس لە ئەوە بکات کە بە ڕاستی ڕوویداوە، بەڵام گێڕانەوەکەی تۆ وەکو گەواهیدەر زۆر گرنگە بۆ ئەو لێکۆڵینەوەی کە دواتر بەڕێوبەرایەتی پۆلیسی هاتوچۆ دەیکات سەبارەت بە ڕووداوەکە. سەرنجدان لە ئەو پرۆسانەی کە تێکستێک باسی دەکات دەتوانێت زۆر تشت بڵێت سەبارەت بە ئەوەی کە ئێمە چۆن دیمەنی ژیان دادەڕێژین.

بە گشتی مرۆڤ باس لە چوار پرۆسە دەکات کە دەکرێ لە پێشنیارێکدا هەبێت. سێ لە ئەمانە پەیوەندیی دەرەکی هەیە: کردەوە (کەسێک تشتێک دەکات)، ڕووداو (تشتێک ڕوودەدات)، دۆخ (تشتێک وەهایە یان بە ئەو جۆرەیە). بەڵام چوارهەم پەیوەندی هوندری/ناوەکی هەیە: پرۆسەی هزری (کەسێک هەست دەکات، بیردەکات، دەبینێت، دەبیستێت). کردار verb دەستنیشانی هەر کام لە ئەم پرۆسانە دەکات. ئەرکی ئەم کردارەش دەستنیشانکردنی پرۆسەیەکە.

بوارەکانی هـزری، ڕۆشـنبیری، جڤـاکی، ئـابووری و سیاسـی هتـد.). پێـشنیاری سەرەکی هەمان ڕستەو پارچـە "زانکۆ وەک مـەلبـەنـدەکێ ڤـەکۆلینێن زانـستی بەردەوام کاری دکەت کو جڤاکێ بەرڤ پێشڤەچوونێ بگوهوریت و گەشێ د ناڤ کۆمەلیدا پەیدا بکەت د هەموو بواراندا"یە. پێشنیاری ورد دەکرێت بگوترێـت ئـەم "گۆڕانکاری و گەشەسەندنانە" لە هەموو بوارەکاندا (هزری، ڕۆشـنبیری، جڤـاکی، ئابووری و سیاسی هتد.) بۆ هەر یەک لە ئەم بوارانە بە جیا.

## پڕۆسە process

تێگەیشتنی ئێمە لە ڕوانینمان بۆ ژیـان و جیهـان لـەسـەر پێگـەی- وەسـتاو و جوڵاو- سەرچاوە دەگرێت. ئایا تشتێک وەک ئـەوەی کـە هـەبووە ئێـستا هـەیـە، یان ئەم تشتە دێتە گۆڕین بەهۆی ڕوودانی تشتێکی نوێ بەجۆرێک لەوانەیـە ئێمـە کاردانەوەمان هەبێت بۆی. ئەمەش دەبێت بەهۆی کە ئەم تـشتەی کـە هـەیـە یـان دەبێتە هۆی دانانی کاریگەری خۆی بەسەر ئەو تشتانەو کەسانەی کـە لـە ئـەوێدا هـەن (ئۆتۆمبێلێـک، شـۆفێرێک) یـان/و چـۆن ئـەم دوانـە پێکـەوە گرێـدەدەدات (شۆفێرەکە لە ئۆتۆمبیلەکە دانیـشتووە و ئۆتۆمبیلـەکە دەهاژوێـت). ئـەم جـۆرە پەیوەندییە گرێدراوە بـە پێـشنیارێک دێتـە دەربـڕین. هـەمانـشێوە ئێمـە دەتـوانین بڵێین کە هەر پێشنیارێک پڕۆسەیەک دەخاتـە بـەردەم یـان بـاس لـە پڕۆسـەیـەک دەکات، تشتێک کە بە ڕاستی لە ژیان یان لە بیرکردنـەوەکانمـان ڕوودەدات. ئێمـە دەکرێت لە ئێرەدا باس لە ڕوانگەی داینـامیکی بکـەیـن. هـەر بۆیـە ئێمـە بـاس لـە "ئۆتۆمبیلەکە لەسـەر جـادە وەسـتاوە" وەکـو پڕۆسـە دەکـەیـن، چونکـە بـە دوای چەند قۆناغ تێپەڕیوە. ئەو تشتانەی یان مرۆڤانەی کـە بـەشـدارن لـە پڕۆسـەیـەک وەکو بەشداربووی ئەو پڕۆسەیە دێنە ئەژماردن.

هەردوو "کردەوە"و "کردار" تشتێک لە دنیای دەرەوە دەهێننە گۆڕین، هەر بۆیە بە کرداری بزوێنەر dynamic verbs دەهێنرێنە دەربڕین. کردارەکانی "خست" و "کەوت" بزوێنەرن بەڵام لە یەکتر جیاوازن چونکە "خست" کردارێکە کە بە مەبەست لە لایەن کەسێک دەکرێت بەڵام "کەوت" کردارێکە کە ڕوودەدات. پێشنیاری "شیرین نانەکەی فڕێ دا" کردەوەیە، بەڵام "شیرین نانەکەی لێ کەوت" ڕووداوێکە کە لە دەرەوەی دەستەڵاتی شیرین بووە. هەڵبەت دوو گەواهیدەر لەوانەیە دوو تێگەیشتنی جیاوازیان دەربارەی لێپرسراویەتیی شیرین هەبێت.

ئەوە کردەوەیەک بووە کە شیرین سزا بدرێ لەسەری، یان ڕووداوێک بووە کە مرۆڤ دڵی بە شیرین بسووتێت؟ هەڵبژاردنی کردار بەندە بە جۆرێک لە دادگاییکردن. ئەگەر هیچ گۆڕانکارییەک ڕوونەدات ئەوا مرۆڤ باس لە دۆخ دەکات. لە ئێرەدا کرداری وەستاو static verbs وەکو "هەیە" و "ە" بەکاردەهێنرێت. خەسڵەتێک کە پێشنیارێک لە جۆری دۆخ دەخاتە بەردەم ئەوەیە کە دەستنیشانی بەشداربوویەک دەکات و خەسڵەتەکانیشی نیشان دەدات. ئەمەش دەکرێت مرۆڤ بێت "ئازاد مامۆستایە" یان تشت "مێز چوار قاچی هەیە" یان دەستەواژە و چەمک "بیردۆزە شێوازێ کارکردنی زانستییە بە مەبەستی گەران بە دوای ڕاستیدا".

سنووری نێوان دەرەوەو ناوەوە، لە نێوان ئەز و جیهان، بۆ بەدیمەنکردنی ڕاستییەکانی ژیان و دەربڕینە زمانەوەوانییەکان زۆر گرنگە. کاتێک دۆخێک، کردەوەیەک یان کردارێک لە ناوەوەی مرۆڤ ڕوودەدات ئەوا باس لە پرۆسەی هزری mental process دەکرێ. نمونەی پرۆسەی هزری بیرکردنەوە، هەست و سۆز، خەو دیتن و فەنتازییە. بۆ پرۆسەکانی هزری هەردوو کردارەکانی بزوێنەر و وەستاو dynamic and statistic verbs دێنە بەکارهێنان. کرداری داینامیکی وەکو پێشنیاری "ئەو بیردەکاتەوە، ئەو هەست بە نهێنییەکەی ئێمە دەکات، ئەو

گیرۆدەی ئەڤینداری بووە". کرداری ستاتستیکی وەکو " ئەو حەز لە ژیانی کوێستان دەکات، ئەم بۆچوونی خۆی دەربارەی بابەتەکە هەیە، ئازاد خولیای یاریی فوتبۆڵە، شیرین دڵنییایە". وەک دەبینرێ لە زۆرێک لە کردارەکانی ستاتستیکی بۆ پرۆسەی هزری کرداری "هەیە، ە" دێتە بەکارهێنان.

هەر جۆرە پرۆسەیەک جۆرەها بەشداربووی هەیە. کردەوە بکەری agent دەوێت، کەسێک کە بە مەبەستەوە دەبێت بەهۆی ڕوودانی تشتێک. شێوازێکی زمانەوانی بۆ شیکارکردنی بکەر بەکارهێنانی ئاوەڵکردارە وەکو "بە خێرایی، بە هێمنی، بە ئەنقەست، بە وریایی". ئەم وشانەش ئەو چاوەڕوانییە دەدەن کە مرۆڤ دەستەڵاتی تەواوی بەسەر ئەوە هەیە کە ڕوودەدات. شیرین بکەرە لە ڕستەی "شیرین بە ئەنقەست نانەکەی فڕێدا". لە بەرامبەردا "شیرین بە ئەنقسەت نانەکەی لێکەوت" گوتنێکی ناقۆڵایە و تەنها لە دەمێکدا بیری تێدەچێت کە شیرین فێڵ بکات، واتە شیرین وا نیشان دەدات کە نانەکەی لێکەوتووە لە کاتێکدا ئەو تەواوی کۆنترۆڵی بەسەر بارەکەدا هەبووە.

بەشداربوویەک کە لە گۆڕانکاریەک بەشداربێت بەبێ ئەوەی بتوانێت کاریگەری لەسەر دابنێت پێی دەگوترێت *لێکراو* object. لە ڕستەی "ئازاد لەسەر کەمپیوتەر دەنووسێت" و "ئازاد نەوزادی تێپەڕاند" کردارەکە دەربڕین لە دوو کردەوە دەکات؛ ئازاد وەکو بکەر بەڵام کەمپیوتەر و نەوازاد وەکو لێکراو. لێکراو دەکرێت هەم زیندەوەر، مرۆڤ و ئاژەڵ، بێت هەم شمەک. لێکراو ئەو بەشداربووەیە کە بە ویستی خۆی هیچ ڕۆڵی نییە لە ئەو پرۆسەیەی کە ئەو بەشدارە تیایدا.

ئاست یان status یەکەیەکی ترە لە جۆری بەشداربوو لە دۆخ، کە باسی پێگەی بەشداربوو دەکات لە دۆخێک. لە ڕستەی "*ئازاد دوو منداڵی هەیە*"دا ئازاد و دوو منداڵ ئاستن. پێشنیارەکە باس لە پەیوەندییەک دەکات کە لە نێوان

بەشداربووان هەیە. لە پرۆسەی هزریدا مرۆڤ باس لە بەسەربردە دەکات. لە ڕستەی "شیرین بۆ ئازاد خەم دەخوات" "شیرین" بەسەربردەیە بەڵام "ئازاد" لێکراو. هەڵبەت لە ئێرەدا "ئازاد" لێکراوە بۆ چالاکییەکانی "شیرین" کە پێدەچێت "ئازاد" تەواو بێئاگا بێت لێی. لە ڕستەی "شیرین ئازادی دوواند" "شیرین" بکەرە و "ئازاد" لێکراو بەڵام لە ئێرە پەیوەندییەکە دەرەکی-یە، واتە "ئازاد" ئاگادارە و بەرسڤی "شیرین" دەدات.

## ڕوانگە Perspective

ئەو دنیایەی کە تێکستێک باسی دەکات لە ڕوانگەیەکەوە هاتۆتە داڕشتن. تێکست لە ڕوانگەی نوسەر یان دەزگا بەپێی گۆشەنیگای، بیرکردنەوەی، بەهای، تێگەیشتنی جودا جودا ئەو دنیایەی کە باسی دەکات دێتە نەخشاندن. هەندێک جار دەستەواژەی "لە ڕوانگەی من-ەوە، لە ڕوانگەی زانستییەوە، بەپێی بۆچوونی ئێمە، تێگەیشتنی من بۆ بابەتەکە هتد." لە تێکستدا دەبینرێ. ئاراستەی زمانەوانی لە ئەم جۆرە کە دەستنیشانی ڕوانگە دەکات پێی دەگوترێت ئامارەی ڕوانگەیی. ڕوانگە بەرفراوانترین چەمکی شیکارکردنە لە بونیادی کەسایەتی تێکست. سەرنج بدە ئەو تێکستەی خوارەوە (ماڵپەڕی سبەی ٢٠١٠):

**منداڵ لە ناو سکی دایکیدا مێشکی دەکەوێتە کار.**

**توێژینەوەیەکی هۆڵەندی ئەوەی دەرخستووە، کە منداڵی ناو سکی دایک لە ماوەی تەمەنی ٣٠ هەفتەیی مێشکی دەکەوێتە کار.**

**ئەو توێژینەوەیە کە لە لایەن چەند پزیشکێکی وڵاتی هۆڵەندەوە ئەنجامدراوە و تێیدا ئەوە دەرکەوتووە، کە منداڵی ناو سکی دایک لەو کاتەی لە ناو سکی دایکیدایە و تەمەنی ٣٠ هەفتەیە مێشکی دەکەوێتە کارکردن.**

لای خۆیــەوە (یــان نیــویس) مامۆســتای نــەخۆشــییەکــانی ئــافرەتــان لــە نەخۆشخانەی فێرکاری لە ناوەندی (ماستەرێخت) ئامازەی بەوە داوە، کە منــداڵ لە ناو سکی دایکی بەر لــە دایکبــوون، هــەنــدێ جوڵــەی تایبــەت وەکو دەنــگ و هەست پێکردن بەر لە دایکبوون ئەنجام دەدات. جێی ئامازەیە توێژەران بەهــۆی ئامێری زۆر تایبەتەوە گوێبیستی دەنگی منداڵ لەناو سکی دایکیدا دەبن.

بنەمایەکی سەرەکی بۆ دەستنیشانکردنی ڕوانگە ئەوەیە کە لــە ئــەو کــەســەوە دەست پێبکەیت کە خاوەن ڕوانگەکەیە یان هەڵگری ڕوانگەکەیە- بۆ نمونــە وەکــو لە گۆشەنیگای منەوە، بەپێی بەندە، بەگوێرەی ئەوان، لە لایەنی کوردییــەوە هتــد. ڕوانگــە دەکرێــت دەربــارەی گۆشــەنیگــای کــەســێک، کۆمــەڵێــک، نــەتــەوەیــەک، ڕێکخراوێــک یــان دەزگایــەک بێــت، بــەڵکــو تــەنانــەت لــە لایــەن ئایدۆلۆجیایــەک، زانستێک، تەکنەلۆجیایەک یــان پــەیامێــک بێــت. بــە هــەمــوو ئــەم جــۆرە ڕوانگانــە دەگوترێت ڕوانگەی خودی Subjective perspective .

ئەم تێکستەی ســەرەوە دەکرێــت وەکــو تێکستێکی "زانــستی گــشتی" ســەیــر بکرێــت چونکــە بــە ســادەیــی و بــە کــورتی داڕێــژراوە و ئاراســتەی تێکــڕای خوێندەوارانی ڕۆژنامەی "سبەی" کراوەو دەتوانێت هەست و فــەنتــازی خوێنــەر بــۆ لای بابەتەکە ڕابکێشێت. شێوازێکی ڕوانگەی خودی بە نووســەرەوە یــان نێنــەرەوە گرێ دەدرێت و پێی دەگوترێت ڕوانگەی نووسەر. ئاساییانە لــە ئێــرەدا ئــاوەڵنــاوی "من، ئەز، ئێمە" بەکاردەهێنرێ. لە تێکستەکــەی ســەرەوە ڕوانگــەی نووســەر دیــار نییــە. ئــەمــەش لــە دنیــای ڕۆژنامــەوانیــدا بــە ئــەو جــۆرە دێتــە خــەملاندن کــە ڕۆژنامــەنووســان بێلایــەن و بابــەتییانــەو دوور لــە ڕوانگــەی خۆیــان تێکستەکــانی ڕۆژنامە دادەڕێژن. مەرج نییە تێکست لە ڕوانگەی نێنەرەکەیــەوە دابڕێــژرێ. بڕوانــە تێکستەکەی سەرەوە کە باس لە ڕوانگەی ئەکتــەری تــر دەکــات "توێژینــەوەیــەکــی

هۆڵەندی، ئەو توێژینەوەیە، لە لایەن چەند پزیشکێکی وڵاتی هۆڵەندەوە، "یان نیویس" مامۆستای نەخۆشییەکانی ئافرەتان، لە نەخۆشخانەی فێرکاری لە ناوەندی ماستەرێخت، توێژەران، ئامێری تایبەتەوە".

شێوازی تری ڕوانگە هەیە بەڵام ڕوانگەی گرنگی تر بەگوێرەی ئەم کتێبە ڕوانگەی "ڕابردوو، ئێستا و داهاتووە". ئایا ئەو دنیایەی کە تێکستێک دەیخاتە بەردەم خوێنەر یان گوێگر ڕاست و دروستە، بوونی بووە یان بوونی هەیە یان بوونی دەبێت؟ یان ئەفسانە و خەو و خەیاڵە؟

## پەیوەندی — بوونیادی نێوکەسایەتی تێکست The interpersonal structure

تێکست هەمیشە خۆی لە خوێنەر نزیک دەکات. تێکست لەوانەیە وەکو هاووڵاتی، هاوڕێ، ئەندام، کڕیار، باوکو دایک، خوێندکار هتد. ئێمەی خوێنەر بانگ بکات. زۆرجار ئەو ڕۆڵەی کە تێکست دەیبەخشێت بە خوێنەر لە لایەن خوێنەر پەسەند دەکرێت. لە ئەم دۆخەدا پەیوەندییەکە وەکو ئەوەی کە پلانی بۆ دانراوە کاردەکات. بەڵام هەندێک جار تێکست بەپێی چاوەڕوانییەکانی ئێمە نییە، هەربۆیە ئێمەی خوێنەر ئەو ڕۆڵەی کە تیکست دەیبەخشێت بە خوێنەر پەسەندی ناکەین. لەوانەیە ئێمە ئەو کڕیارە نەبین کە تێکستەکە چاوەڕوانی دەکات، یان لەوانەیە ئێمە ئەو دۆستایەتییەی کە ئەو کەسە یان دامەزراوە بانگەشەی بۆ دەکات لە تێکستەکەدا بە پەسەندی نەزانین و پێی قەڵس بین.

ئێمە لە ئەم بەشەدا باس لە سێ چەمک دەکەین: کردەوەی زمانەوانی، بۆچوون و چوارچێوە. ئەم سێ پێکهاتەیە بە هەردوو نێنەر و وەرگری تێکست گرێ دەدەین. دواتر ئێمە ئەوە نیشان دەدەین کە چۆن تێکست دەبێت بە ڕەنگدانەوەو خوڵقێنەری جۆرەها پێگەی کۆمەڵایەتی، هەروەها شێوەی

جوداجودای دەستەڵات و بەرگری. ئێمە لە ڕێگەی بە تایبەتی ئەم تێکستە، کە لە ماڵپەڕەکەی سەرۆکی حکومەتی کوردستان دکتۆر بەرهەم ساڵح ئەحمەد وەرگیراوە، هەوڵ دەدەین ئەم سێ چەمکە شیکار بکەین:

میوانانی بەڕێز

خۆشحاڵبووم لەم سەکۆیەوە بە خزمەتتان دەگەم و سوپاس بۆ ئێوەش کە ئەم ماڵپەرەتان هەڵبژارد تا لە نزیکەوە بە دیدو ڕوانین و هەروەها کارو چالاکییەکانی بەندە ئاشنابن، لە بەرانبەریشدا بەندەش دەیەوێ بە بیرو بۆچون و تێروانینەکانی ئێوە ئاشنا بێت، تا پێکەوە بەختەوەری و ژیانێکی شایستەتر بۆ گەلەکەمان دەستەبەرکەین. بەخێربێن.

لە ژیانی سیاسیی و کۆمەڵایەتیمدا ئەوەندەی بۆم کرابێ، هەوڵی بەردەوامی پەیوەندی و میانەی گەرموگوڕم لەگەڵ دۆست و هاوڕێیان، لەگەڵ چین و توێژە جیاجیاکانی وڵات داوە، ئەمەش لەو باوەڕەوەیە کە لە بنچینەدا کۆمەڵانی خەڵک سەرچاوەی هەموو بیرو باوەڕێکی چاک و خێرخوازن و بۆ سیاسەتمەدارێک کە کارەکەی خزمەتی گشتییەو سەرچاوەی ڕەوای تواناو دەسەڵاتیشی هەر لە خەڵکەوە بێت، زۆر گرنگە ڕاستەوخۆ ، بێ بەربەست و ڕێگری، لە پەیوەندیدا بێت لەگەڵ خەڵک و لەگەڵ دۆست و هاوڕێ و هاووڵاتییەکانی زیاد لە کەناڵێکی پەیوەندی هەبێت تا لە ئەندێشەو بیرکردنەوەو ئاواتەکانیان ئاگاداربێت و لە سیاسەت و کۆششی خۆی ئەو ماتریالە میللییە بەکار بێنێت و لەم ڕێگەیەشەوە سوود لە پێشنیازو دیدو بۆچونی جەماوەر وەربگرێت. هیوادارم ئەم ماڵپەڕە، لەپاڵ کەناڵەکانی تری پەیوەندی، دەرفەتێکی نوێ بێت بۆ بەردەوامی میانە و دۆستایەتیمان.

ئەم داوایەم گشتییە، بۆ هەموو هاوولاتیانە، بەلام بەتایبەتیش مەبەستم لە روناکبیران و خوێندکاران وگەنجەکانمانە، لە کچان و کورانی کوردستان کە لەم سەکۆ پێشکەوتووەی ئینترنێتەوە دەتوانن کەلکێکی گەورە لە زانست و تەکنەلۆژیا وەربگرن.

گەنجی ئێمە، لە دەیەکانی رابردوودا، لە هەموو دەرفەتێکی پێشکەوتن و خوێندەواری و چانسی گەشەکردن بێبەش بوو؛ هیوادارم تەکنەلۆژیاو تۆڕێکی فراوانی پەیوەندی، لە رێی ئینتەرنێتەوە، بتوانێت قەرەبوویەکی شایانی ئەو بێبەشییەیان بکاتەوە و ئەوانیش ژیرانە ئەم دەرفەتە تازانە بقۆزنەوە. لەم پێناوەدا حەزدەکەم ئەم ماڵپەڕە ببێتە سەکۆیەکی گەرموگوڕی گفتوگۆی دوو لایەنە، گەنجان و خوێندکاران و روناکبیران لێیەوە پەرە بە خولیاکانیان بدەن و منیش گەنجێتی خۆم لە بیروکرداردا پەرەپێبدەم و سوود لە پێشنیازەکانتان وەرگرم بۆ خزمەتی نیشتمان!

ڕاستە دۆستان لوتفیان کردو ماڵپەڕەکەیان بۆ کارو چالاکییەکانی هاوڕێی ئێوە، بەرهەم ئەحمەد ساڵح، داناوە، بەلام خواستی من لەوە گەورەترە. ئارەزوومە ئەم پەنجەرەیە بۆ تەماشاکردنی ئێوەی خوێنەریش بێت، ئەم سەکۆیە بۆ ئالوگۆڕی بیروڕاو بیرکردنەوەی هاوبەش بێت، بیرکردنەوەی هاوبەش مەوداکانی تێڕوانین و ئەزموونی ژیانمان دەوڵەمەند دەکات، بۆیە، جارێکی تر، بەخێرهاتنتان دەکەم و بە هیوای پەیوەندییەکی تۆکمەو بەردەوام.

لەگەڵ رێزی

بەرهەم ئەحمەد ساڵح

به ئەو چالاکییەی کە ئـەم تێکستە دەچێتـە نێـوی دەکرێ بگـوترێ ڕیکلامـی کەسایەتی سیاسی. ئەم تێکستە لە ماڵپەڕی خودی دکتۆر بەرهەم ئەحمـەد سـاڵح وەرگیـراوە. ئـەم مێدیۆمـە ئـەلکترۆنییـە تێکستی، یـان ڕاسـتتر دەنگـی، نووسـەر دەگەیەنێت بە وەرگرانی یان خوێنەرانی. تێکستەکـە ئاراسـتەی گشتی خوێنـەران کراوە بە تایبەتی ڕووناکبیران، خوێندکاران و گەنجان. تێکستەکە ئەو چاوەڕوانییـە دەدات بە خوێنەر کە دەتوانێت ڕۆڵێکی چالاکی هەبێـت. بـەرهـەم ئـەحمـەد سـاڵح خوێنـەر بـە دۆسـت نـاو دەبـات و خۆشـحاڵی خـۆی نیـشاندەدات کـە کـەنـاڵێکی پەیوەندیکردنی بـەردەوامـی لـەگـەڵ خوێنـەرانـی هـەیـە. هـەروەهـا لـە خواسـت و ئارەزووی ئەوە کە ئەم کەناڵە بەرفراوانتر بێت.

نووسەر وا نیشان دەدات کە کەسێکی سادە بێـت بـۆ نموونـە ئـەو دەنووسـێت "بەندە، بەرهەم ئەحمەد ساڵح" لە دەمێکدا خوێنەر دەزانێت کە ئـەم نووسـەرە بـە <u>د. بەرهەم ئەحمـەد سـاڵح</u> ناسـراوەو سـەرۆکـی حکومـەتـی هـەرێمـی کوردسـتانە، جێگـری یـەکێتـی نیـشتمانی کوردسـتانەو پێـشتر جێگـری سـەرۆکـی وەزیرانـی حکومەتی ناوەندی عێراق بووە. زمانی کوردی، عەرەبی و ئینگلیزی لە قسەکـردن زۆر بە باشی دەزانێـت. ئـەمـە ئـەوە نیـشان دەدات کـە بـەرهـەم ئـەحمـەد سـاڵح کەسایەتییەکی بەهێزی ڕامیاری، ڕێڤەبەری و زمانەوانی دەستەڵاتدارە.

ئەو پەیوەندییەی کـە لـە نێـوان نێنـەر و وەرگرانـی تێکستەکـە هـەیـە چۆنـەو چییە؟ پـێش هـەمـوو تـشتێک گرنگـە کـە ئێمـە بـزانین <u>بـەرهـەم ئـەحمـەد سـاڵح</u> کەسێکی ئاسایی نییە، بەڵکو کەسێکی ڕامیاری باڵادەستی ناودارە. لە بـەرامبـەردا خوێنـەران کـەسـانی ئاسـایین. بـە واتایـەکـی تـر پـەیـوەندییـەکـە ناهاوتایـە. ئـەو مێدیۆمەی کە هـەیـە، واتـە ماڵپـەڕەکـە، کارمـەنـدانی تـر ئـەرکـی بـەڕێـوەبـردن و

سەرپەرشتیکردنی دەگرنە ئەستۆ کە بەپێی داوای بەرهەم ئەحمەد ساڵح کاردەکەن.

ئەمیش واتای ئەوە دەبەخشێت کە پەیوەندی نێوان نێنەرو وەرگر ناڕاستەوخۆیەو لایەنی بەرهەم ئەحمەد ساڵح کۆنترۆڵی میدیۆمەکە دەکات و ئاراستەی لایەنەکەی تر کە خوێنەرە دەکات. ئێمە بە ئەم پێشەکییە کورتە پتر و پتر ئەم تێکستەی بەرهەم ئەحمەد ساڵح شیتەڵ دەکەین و لەهەمان دەمدا لە ڕێگەی نمونەی دی تیشک دەخەینە سەر هەندێک لایەنی تر لە پەیوەندی نێوکەسایەتی. ئێمە بە ئەم شێوەیە باسکردن و شیکارکردنی ئەم بەشە دەوڵەمەندتر دەکەین.

## کردەوەی زمانەوانی Speech act

زمان ئامرازێکی کردەوەییە. ئێمە لە بەکارهێنانی وشە هەمیشە تشتێک دەکەین کە لەوانەیە دۆخەکە بگۆڕێت و کاریگەری لەسەر کەسانی تر دابنێت. ئەمە واتای ئەوە دەگەیەنێت کە ئێمە کردەوەیەکی زمانەوانی رادەپەڕێنین. ئاساییانە زمان ئاماژە بە چالاکیی خۆی دەدات، ئینجا ئەم چالاکییە دەکرێ لە شێوەی پرسیار، وەڵام، پەیمان، دڵنیاکردن، جەختکردن، بەباڵا هەڵدان، سازشکردن، فەرماندان، گلەییکردن، ئاگاداریکردن، هاودەنگی، پەسەندکردن، پەسەندنەکردن، دادگاییکردن، ناوپزڕاندن، ڕوونکردنەوە، قەدەغەکردن، باسکردن، گێڕانەوە یان هیتر بێت.

وەکو دیارە کە چەندین جۆر کردەوەی زمانەوانی هەیەو بە گەلێک شێوەش دەکرێت بێنە دابەشکردن. ئاسانترین دابەشکردن بەپێی داڕشتنی ڕێزمانی دەبێت.

ڕستە بەپێی دارشتنی ڕێزمانی چوار جۆرە: گوزارشت، پرسیار، داخوازی و "سەرسوڕمان و بانگکردن".

**گوزارشت** declarative sentences ئاساییترین کردەوەی زمانەوانییە. بە شێوەیەکی بنەڕەتی گوزارشت واتە گوتنی تشتێک لەسەر ژیان، ئینجا ئەم تشتە ڕاست بێت، بوونی هەبێت، ویستراو بێت یان لە خەو خەیاڵ بێت.

**پرسیار** interrogative sentences دەکرێ بە دوو شێوە بێت: ئەوەی کە وەڵامەکەی بەڵێ یان نەخێر-ە، *ئایا دەزانیت ئازاد برامە؟ بەڵێ/نەخێر*، یان وەڵامێک کە وشەی تری بەدوا بێت، *کەی ئازاد دەرمانەکەی خوارد؟ پێش دوو کاتژمێر*. ئامانج لە پرسیار بەدەستهێنانی زانیارییە دەربارەی ئەو تشتەی یان کەسەی کە پرسیارەکەی لەسەر کراوە، یان پرسیارکەر دەخوازێت ڕاستی و دروستیی ئەو زانیارییەی کە هەیەتی دەربارەی تشتەکە یان کەسەکە پتەو بکات، واتە چیتر دوودڵی نەبێت.

مەبەست لە ڕستەیەکی **داخوازی** imperative sentences وەکو "*پشتیوانی ئاوارەکان بکە!*" نە جەختکردنە لە دیاردەیەک نە بەدەستهێنانی زانیارییە، بەڵکو مەبەست گۆڕاندنی دۆخێکە لە ڕێگەی کردەوەی کەسێکەوە/کەسانێکەوە.

ئاساییانە **سەرسوڕمان** interjection sentences دارشتنی ڕستەی نییە. ئاساییترین وشە ئەمانەن: ئم، بەڵێ، ئا، نا. ئەمیش وەکو کاردانەوەیەک بۆ ئەوەی کە دەگوترێ. بەڵام وشەی تریش وەکو: ئۆخەی، سوپاس، بەدۆزەخ، قیروسیا هتد دێتە بەکارهێنان.

**بانگکردن** وەکو *ئازاد!* هەستێکە کە مرۆڤ بەرامبەر بە تشتێک/کەسێک دەری دەبڕێت یان بۆ ئاگادارکردنەوەی یان وریاکردنەوەی کەسەکەیە یان کەسانی ترە.

هەڵبەت بانگکردن لە گۆشەنیگای ڕێزمانییەوە ڕستەی تەواو نین و لە نووسین بە نیشانەی سەرسوڕمان کۆتایی پێدێت.

بەپێی ئەو دابەشکردنەی سەرەوە ئەرک و شێوەی (دارشتنی ڕێزمانی) کردەوە گشتییەکانی زمان پەیوەندییەکی سادە و ڕاستەوخۆی لەگەڵ یەکتردا هەیە: بە گوزارشت تشتێک دەبێژین لەسەر ژیان، بە پرسیارێک سوراخی زانینی تشتێک دەکەین هتد. لە ڕاستیدا لە زۆربەی دۆزەکاندا کردەوەی زمانەوانی ناڕاستەوخۆیە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە شێوەی دارشتنی ڕستە ئەرکی ڕستە دەرناخات، بەڵکو لەڕێگەی دۆزەکەیەوە دێتە تێگەیشتن، بە تایبەتیش لەڕێگەی پەیوەندی نێوان بەشداربووان. "*خواردنەکە ئامادەیە*". تەنها ڕستەیەکی گوزارشتی نییە، بەڵکو ئەمە واتای ئەوە دەگەیەنێت: "وەرن خواردن بخۆن!" بە واتایەکی تر ڕستەکە داخوازی‌یە.

بڕوانە ئەم پرسیارە "دەتوانیت پەنجەرەکە دابخەیت؟". لە ئێرەدا بوار بۆ هەردوو وەڵامی بەڵێ/نەخێر هەیە. ئەگەر ئەم پرسیارە لەلایەن کەسێکەوە گوترابێت کە دەستەڵاتی پترە تاکو ئەوەی کە پرسیارەکەی ئاراستەکراوە، بۆ نمونە لە مامۆستا بۆ خوێندکار، باوک بۆ منداڵ، ئەفسەر بۆ سەرباز، ئەوا پرسیارەکە خەسڵەتی کردەوەی زمانەوانی لە گەڕان بەدوای زانیاریدا دەگۆڕێت بۆ داخوازیکردن کە کردارێک بەدوای خۆی دەهێنێت.

بەشداربوو، کە جۆرەها سەرچاوەی دەستەڵاتی هەیە، توانای کەڵکورگرتنی بۆ جۆرەها کردەوەی زمانەوانی هەیە. لە پۆلەکانی قوتابخانە ئاساییانە ئەمە مامۆستایە کە پرسیارو داخوازی دەکات. بەڵام لە ئێرەشدا پەیوەندییەکە هێندە سادە نییە. هەندێکجار ئێمە زمان بە ئەو شێوەیە بەکاردەهێنین کە دەمانەوێت ئەو کەسەی کە خاوەن بڕیارە، قسەکەی بێتە گۆڕین، بۆ نمونە قوتابییەکی

ناگوێڕایەڵ. وشە دەکرێت کەرەستەیەکی ئامادەباشی بێت بۆ ڕاپەڕین. گشت ئەم پرۆسانە دوو لایەنی هەیە: هەروەکو چۆن دەستەڵات کاریگەریی بەسەر زمان هەیە، هەر ئاواش زمان کاریگەری بەسەر دەستەڵات هەیە. دەستەڵات بە گەلێک شێوەی جیاواز هەیە کە لە هەمان کاتدا دەکرێت هاوتەریبانە یان هەڤدژانە بێتە بەکارهێنان. بۆیە هەندێکجار دیار نییە کە کێ لە بەشداربووان بۆی هەیە ئەوەی کە دەگوترێت بیڵێت.

نمونەیەکی باش کاری پێکەوەیی گرووپێک خوێندکارە لە زانکۆدا. بە گشتی لە زانکۆدا ڕۆڵی هەموو خوێندکاران لە هەمان ئاستدایە. لەگەڵ ئەوەشدا پێگەو هەلە فەراهەمکراوەکان بەرەو لای باڵادەستی کردەوەکانی زمانەوانی ئاراستە دەگرێ، وەکو داواکاری و کورتکردنەوە. ئەو کەسەی کە لە ئەم گروپەدا سەرهەڵدێنێ ئەوەیە کە، بۆ نمونە: خاوەن پەیوەندی، زانیاری و بڕوابەخۆبوونی زیاترە، ڕەگەزی نێرە نەک مێ یان توانای قسەکردنی زۆرترە. کێ لە قسەکردندا پێشەوایەتی دەکات و کێ خۆی دەخاتە پاش پشت دەبەستێت بە ئەو پەیوەندییە ئاڵۆزەی کە لە نێوان گشت ئەو هێزانە/فاکتەرانە هەیە.

زۆربەی ڕستەکانی تێکستەی بەرهەم ئەحمەد ساڵح ڕستەی گوزارشتین بەڵام داخوازی و بانگکردن-یشی تێدایە. یەکەمین ڕستە بانگکردنە "میوانانی بەڕێز" بەڵام بێئەوەی بە نیشانەیەک "سەرسوڕمان" کۆتایی پێ بێت. دواتر بە ڕستەی گوزارشتی دەستپێدەکات و بەردەوام دەبێت. لە ڕستەی یەکەمی پارچەی یەکەم نووسەر ڕاستەوخۆ خوێنەر دەدوێنێ "خۆشحاڵم لەم سەکۆیەوە بە خزمەتتان دەگەم". نووسەر دەخوازێت پەیوەندی لە نێوان "ئەز و ئێوە" دروست بکات. لە ڕستەکانی هەمان پارچە ئەم پەیوەندییە بۆ پەیوەندی دوولایەنە گەشەی پێدەدرێت: "تا لە نزیکەوە بە دید و ڕوانین و هەروەها کار و چالاکییەکانی بەندە

ئاشنا بن، له بەرامبەریشدا بەندەش دەیەوێ بە بیر و بۆچوون و تێڕوانینەکانی ئێوە ئاشنا بێت".

لە دواهەمین ڕستەی ئەم پارچەیەدا نووسەر بۆ جارێکی تر ڕاستەوخۆ خوینەرانی دەدوێنێت بەهۆی بانگکردنیان "بەخێربێن"! لە ئێرەدا نووسەر دەیەوێت خۆی لە خوێنەران نزیکبکاتەوە ئەمیش وەکو هەوڵێک بۆ شکاندنی ئەو چوارچێوە پەیوەندییە فەرمی و دوورەی کە هەیە لە نێوان هەردوولا. ئەم پەیوەندییە سنووردارە: خوێنەر لە کارو چالاکییەکانی نووسەر ئاگاداربێت، هەروەها نووسەر لە بیرو بۆچوون و تێڕوانینەکانی خوێنەران ئاشنا بێت.

لە سەرەتای پارچەی دووەمدا نووسەر وەکو کەسێکی سیاسی خۆی دەناسێنێت و ئەرێنییانە باسی خۆی دەکات. پارچەی دووەم لە دوو ڕستە پێکدێت کە ڕستەی یەکەمی لە ١١٢ وشە پێک دێت، ئەمە بێجگە لە شەش کۆما. ڕستەی بە ئەم جۆرە درێژ نادروستە چونکە سەر لە هەریەک لە نووسەرو لە خوێنەر دەشێوێنێت.

بڕوانە لە سەرەتای ڕستەکەدا نووسەر باسی خۆی دەکات وەکو کەسێکی سیاسی، واتە کەسەکە تاکە، دیارەو ناسراوە. هەروەها باس لە پەیوەندییەک دەکات کە "ئەو" هەوڵی دروستکردنی داوە لەگەڵ هاوولاتیانی. دواتر نووسەر لە هەمان ڕستە باس لە "سیاسەتمەدارێک" دەکات کە خەسڵەتی گشتی هەیە، واتە ئەو باس لە کەسێکی تاکی دیار و ناسراو ناکات. دواتر ئەو بە گشتی باسی ئەو پەیوەندییە دەکات کە پێویستە بۆ کەسێکی سیاسی کە لەگەڵ هاوولاتیانی هەبێت. لە ئێرە خوێنەر تووشی دوولی دەبێت و گومان پەیدا دەکات. بۆچی نووسەر لە ماڵپەڕی خۆی و لە باسکردنی خودی خۆی وازدەهێنێت و باس لە پەیوەندییەک دەکات کە بەپێی نووسەر دەبێت هەموو سیاسەتمەدارێک هەیبێت

لەگەڵ هاوولاتیانیدا؟ نووسەر خوێنەرانی نادوێنێت و خۆی دووردەکات لێیان.
ڕستەی دووەمی پارچەی دووەم لە ١٥ وشە پێکدێت، بێجگە لە دوو کۆما. ئەم دوو کۆمایە یارمەتی خوێنەر دەدەن کە وشەکان کەڵەکە نەبێت بەسەریاندا و دەبێت بە هۆکاری پتر تێگەیشتن. بە ئەم شێوەیە ژمارەی وشەکانی ئەم ڕستەیە بێجگە لە وشەکانی نێو دوو کۆماکە دەکاتە ١١ وشە. ئەمەش ڕستەیەکی ئاساییە و تێگەیشتنی ئاساییە. ئەم ڕستەیە داخوازییە چونکە نووسەر "هیوادارە" کە ماڵپەڕەکە ببێت بە دەرفتێکی نوێ بۆ بەردەوامیی میانەو دۆستایەتی "لە نێوان خۆی و خوێنەرانی".

پارچەی سێهەم کە بریتییە لە تەنها ڕستەیەک. ڕستەکە لە ٣٣ وشەو ٣ کۆما پێکهاتووە. نووسەر لە سەرەتادا باس لە داوایەک دەکات کە پێشتر لە ڕستەی دووهەمی پارچەی دووهەم باسی کردوە "ئەم داوایەم" واتە داوای "بەردەوامی میانەو دۆستایەتیمان" (بڕوانە پرینسیپی تێما-ڕێما لە پەیوەندیی کەسایەتی). نووسەر دەنووسێت کە داواکەی گشتییە بەڵام تایبەتیشە. لە ئێرەدا جۆرە هەڵاواردنێک بەدی دەکرێت چونکە ڕوناکبیران و خوێندکاران و گەنجانی لە "ناڕوناکبیران" و ناخوێندکاران و پیران جودا کردۆتەوە. نووسەر هەڵاواردکردنێکی تریش دەکات چونکە وشەکانی تەنها ئاراستەی لایەنێک دەکات "کچان و کوڕانی کوردستان کە لەم سەکۆ ئینتەرنێتەوە دەتوانن کەڵکێکی گەورە لە زانست و تەکنەلۆژیا وەربگرن". ئەی ئەوانی تر کە تواناى بەکارهێنانی ئەم سەکۆ پێیشکەوتوویان نییە؟ نووسەر جارێکی تر خوێنەر تووشی دوودڵی دەکات. خوێنەر چاوەڕێی ئەوە دەکات کە نووسەر/نێنەر بڵێت کە ئەم سەکۆ پێشکەووتووە ببێت بە هۆکاری بەرفراوانترو چڕکردنی ئەو پەیوەندییەی کە ئەو هەوڵی بۆ داوە دروستی بکات. "کچان و کوڕان کەڵک لە زانست و تەکنەلۆژیا وەربگرن" بابەتێکی لابەلای

تـره بـەڵام پـەرەپێدانی پـەیوەنـدی، بابـەتێکـی تـره کـه تێمـای سـەرەکیـی تێکستەکەیه.

پارچەی چوارەم له ڕستەیەکی گوزارشتی درێژ پێکدێت کە بریتییە لـه ۳۸ وشەو ٥ کۆما. بەرهەم ئەحمەد سالح دەنووسێت "گەنجی ئێمە، له دەیەکانی ڕابردوودا، له هەموو دەرفەتێکی پێشکەوتن و خوێندەواری و چانسی گەشەکردن بێبەش بوو". ئەمه گوتنێکی ڕاست نییه چونکه گەنجان لـه دەیەکانی ڕابردوودا دەرفەتی پێشکەوتنو خوێندەواریو چانسی گەشەکردنیان هەبوو. ئـەمـه تـشتێکی ڕێژەییه بۆ هەموو بوارەکـان. دواتـر نووسـەر دەنووسێت "هیـوادارم تـەکنـەلۆژیـاو تۆڕێکی فراوانی پەیوەندی، له ڕێی ئینتەرنێتەوە، بتوانێـت قـەرەبوویـەکـی شـایانی ئەو بێبەشییەیـان بکاتـەوە و ئـەوانـیش ژیرانـه ئـەم دەرفـەتـه تازانـه بقۆزنـەوە". خاڵێکی گرنگ بـۆ تێبینیکـردن ئـەوەیـه کـه گـەنجانی دەیـەکانی ڕابـردوو نـاکرێ هەتاکو ئێستاش هەر گەنج بن. گەنجانی دەیەکانی ڕابردوو دەکرێت پیـری ئـەمڕۆ بن. ئەم هیواخواستنەی نووسەر له دیدی گەورەوە بۆ بچووک دێت.

نووسـەر ئامۆژگـاری و ڕێنمـایی دەدات وەکـو ئـەوەی خوێنـەران (لـه ئێـرەدا گەنجان!) داوایان کردبێت یـان پێویـستیان بێـت. دواتـر نووسـەر تـوێژی گـەنجان وەکو منـداڵ سـەیـر دەکـات چونکـه وشـەی "ژیـر" لـه لایـەن گـەورەوە بـۆ منـداڵ بەکاردێت. بەرهەم ئەحمەد سالح به شێوەیەک سەیری گەنجان دەکات که نـەزانـن یان نەتوانن ئەم دەرفەته تازانه بقۆزنەوە. ئەمه بابەتێکه که پەیوەندی نزیکـی بـه ئامانجی بابەتی سەرەکیی تێکستەکەوە نییه، بەڵام ئەو پەیوەندییـه ناهاوتایـه کـه بەرهەم ئەحمەد سالح، وەکو کەسایەتییەکـی ڕامیـاریی بـەرز، لـەگـەڵ خوێنـەرانـی هەیەتی دەردەکەوێت.

پارچەی پێنجەم، کە لە ڕستەیەکی ٣٦ وشە پێکدێت، بە نیشانەی سەرسوڕمان کۆتایی هاتووە. لە ڕووی ڕێزمانییەوە ئەم ڕستەیە گوزارشتییەو ناکرێت بە نیشانەی سەرسوڕمان کۆتایی پێبهێنرێت. دیسان لە ڕوانگەی پەیوەندیگرتن لە نێوان نووسەرو خوێنەراندا ناڕۆشنی بەدیدەکرێت. ئەم پارچەیە بۆ سێ ڕستە دابەش دەکرێت: "لەم پێناوەدا حەزدەکەم ئەم ماڵپەرە ببێتە سەکۆیەکی گەرموگوڕی گفتوگۆی دوو لایەنە-١ ، گەنجانو خوێندکارانو ڕوناکبیران لێیەوە پەرە بە خولیاکانیان بدەن-٢ و منیش گەنجێتی خۆم لە بیرو کرداردا پەرە پێ بدەم و سوود لە پێشنیازەکانتان وەرگرم بۆ خزمەتی نیشتمان-٣". ئەو ئاراستەیەی کە نووسەر ڕستەی یەکەمی لەسەر دامەزراندوە پەیوەندی لۆجیکانەی بە ڕستەی دووهەمەوە نییە. ڕستەی سێهەم پەیوەندی بە هەردوو ڕستەی یەکەم و دووهەمەوە هەیە بەڵام ئەم پەیوەندییە لاوازە. ڕستەی یەکەمی ئەم پارچەیە پەیوەندیی سەرەکی بە تێمای سەرەکی تێکڕای تێکستەکەوە هەیە. تێمای ڕستەی دووهەم، پەیوەندی بە تێمای سەرەکی تێکستەکەوە نییە، بەڵکو لە چوارچێوەی ئەو پارچەیەدا پەیوەندی تێما-ڕێمای بە ڕستەی یەکەمەوە هەیە. ڕێما: ئەم ماڵپەرە ببێتە سەکۆیەکی گەرموگوڕی گفتوگۆی دوو لایەنە، تێما لە ڕستەی دووهەم: لێیەوە. بۆ جارێکی تر پەیوەندی گەورە بۆ بچووک لە ئەم پارچەیەدا دەردەکەوێت: نووسەر حەز دەکات کە گەنجان و خوێندکاران و ڕوناکبیران لە ماڵپەڕەکەی نووسەرەوە پەرە بە خولیاکانیان بدەن. باوک حەز دەکات منداڵەکەی ببێت بە پزیشک بەڵام منداڵ حەزی دەکرد باوکی پزیشک بوایە. پەیوەندییەکە دەربارەی دەمەکانی کردارە، واتە دەمی داهاتوو بۆ منداڵ و دەمی ڕابردوو بۆ باوک. دواتر ئایا ماڵپەڕەکەی نووسەر بەرسڤی خولیاکانی گەنجان و خوێندکاران و ڕوناکبیران دەداتەوە.

ماڵپەڕەکەی بەرهەم ئەحمەد ساڵح سیاسییە نەک ماڵپەڕێکی بۆ نمونە وەرزشی بۆ گەنجان یان بەشە جیاجیاکانی زانستی و وێژەیی بەپێی ڕشتە جیاجیاکانی خوێندنی خوێندکاران و تایبەتمەندییەکانی تاک و کۆمەڵی ڕوناکبیران. نووسەر لە ڕستەی سێهەمدا دووپاتی پەیوەندیی گەورە بۆ بچوک دەکاتەوە: <u>منیش گەنجییەتی خۆم لە بیرو کرداردا پەرە پێ دەدەم و سوود لە پێشنیازەکانتان</u> (گەنجان و خوێندکاران و ڕوناکبیران) <u>وەردەگرم</u>.

بە واتایەکی تر: نووسەر لە بیرو کرداردا هەروەکو گەنجان و خوێندکاران و ڕوناکبیران گەنجە ئەگەر نا، بەتەمەنە. وشەی "پێشنیاز" جودایە لە "پێشنیار" کە ئینگلیزییەکەی proposition ە. هەردوو وشەکە داتاشراون: ئامرازی پەیوەندی+ وشە (نیاز-نیار). وشەی "نیاز" پەیوەندی بە حەزو ویستی کەسێک هەیە بۆ کاتێکی یان ماوەیەکی دیاریکراو، بۆ نمونە مرۆڤ دەبێژێت: تۆ نیازی چیت هەیە؟ ئەگەرچی واتای وشەی "نیار"م لە ژمارەیەک فەرهەنگدا دەستنەکەوت بەڵام ئەم وشەیە لە ئەو دۆزانە/کۆنتێکستانە دێتە بەکارهێنان کە پەیوەندی بە کۆمەڵێک خەڵک هەیە، نەک تەنها کەسێک، و دەکرێ پانتایی ماوەکەی کورت یان درێژ بێت.

بۆ نمونە دەگوترێت *پێشنیارت* چییە *بۆ چارەسەری گرفتەکە، پێشنیارت چییە بۆ پێشخستنی پڕۆژەکە، پڕۆسەکە، میتودەکە هتد*. بۆ نمونە لە پەرلەمان و کۆنگرەی ڕێکخراو و پارتەکان پێشنیار پێشکەش دەکرێت و تاووتوێ دەکرێ. لە ئەو شوێنەی کە لەسەر پێشنیارێک گفتوگۆ دەکرێ پێگەی بەشداربووان هاوتایە، بۆ نمونە هەموویان ئەندامن. لە ئەم پارچەیەدا بەرهەم ئەحمەد ساڵح باس لە سەکۆیەکی گەرموگوڕی گفتوگۆی دوولایەنە دەکات. ئاساییانە گفتوگۆ دوولایەنە دەکرێت بۆ نموونە لە لایەن بەڕێوەبەرو کرێکار، مامۆستاو خوێندکار،

باوک و منداڵ بێت. پێشتر بەرهەم ئەحمەد ساڵح نە داوای پێشنیاری کردووە نە پێشنیاز بەڵام دواتر باس لە "پێشنیازەکانتان"، واتە پێشنیازی خوێنەران دەکات. هەردوو وشەی "خولیاو پێشنیاز" پەیوەستە بە تاکەکەسەوە، بەڵام وشەکانی "بەرژەوەندی و پێشنیار" پەیوەستە بە گشتەوە نەخاسمە لە دۆزی فەرمیدا.

لە کۆتایی ئەم پارچەیەدا نووسەر دەنووسێت "سوود لە پێشنیازەکانتان وەرگرم بۆ خزمەتی نیشتمان". ئەگەر ئێمە بیخەملێنین کە مەبەست لە "پێشنیاز" "پێشنیار"ە ئەوا دیسان پەیوەندییە ناهاوتاکە خۆی زەق دەکاتەوە. ئەمە لەبەرئەوەی کە خوێنەر پێشنیار لە ڕێگەی نامەی ئەلکترۆنییەوە دەدات بە ماڵپەڕەکە بەڵام دڵنیا نییە کە ئایا بەرهەم ئەحمەد ساڵح پێشنیارەکە دەخوێنێتەوە یان نە. لە ئەگەرێکدا ئەگەر بەرهەم ئەحمەد ساڵح پێشنیارێک بخوێنێتەوە ئەوا خۆی بڕیار لە تاوتوێکردنی دەدات، ئینجا ئەمە بە تەنها بێت یان لەگەڵ کەسانی تر یان بە پەیوەندی لەگەڵ نێنەری پێشنیارەکە.

لە ڕستەی گوزارشتی یەکەمی پارچەی شەشەم نووسەر جەخت دەکات کە کەسانی تر داوایان لە بەرهەم ئەحمەد سالح کردووە کە ماڵپەڕێک بۆ کارو چالاکییەکانی دروست بکەن. بە واتایەکی دی، دروستکردنی ماڵپەڕەکەو ناساندنی خۆی و پەیوەندیکردنی بە خوێنەران بیرۆکەی خۆی نەبووە. لە هەمان ڕستە نووسەر خواستی گەورەتری هەیە. ئەم ڕستەیە ناڕۆشنە. ئایا ئەم خواستەی بەرهەم ئەحمەد ساڵح لە خۆیەتی، دۆستانی یان خوێنەرانیەتی؟

لە ڕستەی گوزارشتی دووهەمی ئەم پارچەیە نووسەر خواستێکی گەورەی خۆی بە خوێنەران نیشان دەدات: "ئارەزووومە ئەم پەنجەرەیە بۆ تەماشاکردنی ئێوەی خوێنەریش بێت، ئەم سەکۆیە بۆ ئاڵوگۆڕی بیروڕاو بیرکردنەوەی هاوبەش بێت". هەڵبەت ئەگەر نووسەر بیەوێت ماڵپەڕەکەی بکات بە سەکۆیەک بۆ

ئاڵوگۆڕی بیروڕاو بیرکردنەوەی هاوبەش دەکرێت زۆر بە ئاسانی بکرێت، بۆ نمونە لە ڕێگەی نامەی ئەلکترۆنییەوە. وشەی "ئارەزوومە" هەڵخەڵەتێنەرانەیە. نووسەر وا نیشاندەدات کە ئێستا بواری بەدیهێنانی سەکۆیەکی لە ئەم جۆرە نییە، کە پێچەوانەکەی ڕاستە. دواتر دەنووسێت "بیرکردنەوەی هاوبەش مەوداکانی تێروانین و ئەزموونی ژیانمان دەوڵەمەند دەکات." واتە ئەم "دەوڵەمەندبوونە" دەکەوێتە نێو ئارەزووەکەی نووسەرەوە.

دواتر نووسەر دەنووسێت "بۆیە، جارێکی تر، بەخێرهاتنتان دەکەم و بە هیوای پەیوەندییەکی تۆکمە و بەردەوام". ئەم پەیوەندیی تۆکمە و بەردەوامە، کە مێدیۆمەکەی ماڵپەڕەکەی نووسەرە، لە سەر بنەمای لوتفی دۆستان هاتۆتە دامەزراندن نەک وەکو پێویستییەکی سەردەمانە بۆ کەسێکی بالادەستی سیاسی و فەرمیی وڵات. ئەم پەیوەندیی تۆکمەو بەردەوامە ڕێڕەوەکەی لەسەر بنەمای خواست و حەزو ئارەزووی نووسەرە نەک ویست will و مەبەست aim و بەرژەوەندی intresst گشتی. بەرهەم ئەحمەد ساڵح لێپرسراوێکی پایەبەرزی حزبی و حکومییە. نەک هەر ئەرکە بەڵکو ئەو پێویستی بە پەیوەندییەکی دانەبڕاو لەگەڵ جەماوەر هەیە.

ئەو توانای دارایی هەیە و بواری تەکنیکیش هەیە کە ماڵپەڕێک دروست بکات و کەسێک یان زیاتر وەکو کارمەند بۆ ئەو ماڵپەڕە دابمەزرێنێت. هەر لە ئەم ماڵپەڕە دەکرێ ئایکۆنێک بۆ ئاڵوگۆڕی فرەلایەنە بکرێتەوە بۆ ئەوەی خوێنەران پێشنیار و ڕاو و بۆچوونی خۆیان سەبارەت بە گەلێک بوار بخەنە بەردەم. هەڵبەت هەر لە ئەم ماڵپەڕەی ئێستای نووسەردا خوێنەر دەتوانێت ڕاستەوخۆ پەیوەندی بکات. پرسیار ئەوەیە کە نووسەر/وەرگر وەڵامی نێنەر/خوێنەر دەداتەوە! یان بە لایەنی کەم ئەو کارمەندانەی کە ئەرکی بەڕێوەبردنی

ماڵپەڕەکەیان لە ئەستۆدایە وەڵامی خوێنەر دەدەنەوە ئەگەر یەکێک پرسیارێکی ئاراستەی بەرهەم ئەحمەد ساڵح کرد! ئەمەش ئەو پەیوەندییە ناهاوتایەی کە لە نێوان هەردوو لادا هەیە زەق دەکاتەوە.

لە کۆتایی ئەم تێکستەدا نووسەر دەنووسێت: لەگەڵ ڕێزی بەرهەم ئەحمەد ساڵح. تێبینی بکە کە هیچ تایتڵێک title، وەکو دکتۆر، سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان، جێگری سەرۆک وەزیرانی عێراق یان جێگری سکرتێری ی.ن.ک.، لە پێش ناوەکە نییە. ئەمەش میتودێکی بەرەواجە بۆ نزیکبوونەوەی نووسەر لە خوێنەرانی ئاسایی و ناساندن و پێشکەشکردنی خۆی وەکو کەسێکی ئاسایی.

## بۆچوون Attitude

ئێمە پێشتر گوتمان کە بونیادی نێوکەسایەتی لە تێکست ڕەنگدانەوەی ئەو چاوەڕوانیانەیە کە لە نێنەر/نووسەر و وەرگر/خوێنەر دەکرێت، هەروەها لە ئەو پەیوەندییەی کە لە نێوان هەردوو لادا هەیە. خاڵێکی گرنگ لە ئەم دیمەنە نیشاندانی بۆچوونە، واتە بیرکردنەوەو ویست و هەستی مرۆڤ، سەبارەت بە بابەتە باسکراوەکانی تێکستەکە. بە مەبەستی بەردەوامیی پەیوەندییەک، ئەگەر لایەنێک ئەوەی نیشان دا کە حەزی بە تشتێک هەیە یان نە ئەوا ئەمە دەبێت بە ڕێسایەک بۆ لایەنەکەی تر کە پەسەندی بکات. مامڵەی زمانەوانی لە نێوانی لایەنەکان بۆ دەربڕینی بۆ نمونە پیاهەڵدان یان سەرکۆنەکردن، فەرماندان یان ملکەچکردن، گرنگە.

لە دەربڕینێکی وەکو "من لەوانەیە بێم بۆ ئاهەنگەکە" ئەوا مرۆڤ لە بیستنی وشەی ئاوەڵفرمانی ڕستەکە "لەوانەیە" لە ناوەڕۆکی گشت ڕستەکە دوودڵ دەبێت. لە "من دێم بۆ ئاهەنگەکە ئەگەر بۆم بکرێت" ئەوا ڕستە یاریدەرەکە دەبێتە

هۆکاری نادڵنیایی لە هاتنەکە. لە "من بە دڵنیاییەوە هەوڵ دەدەم بێم بۆ ئاهەنگەکە" هێشتا هەر نادڵنیابوون بەدەردەکەوێت. لە ئەم جۆرە نمونانە ئەوە دەردەکەوێت کە بۆچوونی نێنەر سەبارەت بە ئەوەی کە دەیڵێت جێگەی متمانە نییە. ئێمە بە ئەم جۆرە بۆچوونانە دەبێژین گومانداری. ئەم گومانانە، لە ڕێگەی هەڵبژاردنی وشە، ناوەڕۆکی دەربڕین یان مامڵەی زمانەوانی بێت، کاردەکەنە سەر بونیادی تێکست. تێبینی بکە کە بونیادی نێوکەسایەتی پەیوەستە لەگەڵ بونیادی کەسایەتی تێکستدا.

لە ڕوانگەی کۆمەڵگاوە گومان جێگای بایەخە، چونکە ئەمە بەندە بە دەستەڵاتەوە. ئەو کەسەی کە دەستەڵاتی کەمترە پتر میتودی گومانداری بەکار دەهێنێت. ئەمیش وەکو ستراتیژییەکی وریابوون کە زیاتر بواری مامڵەکردن دەدات بە کەسی دەستەڵاتداری بەرامبەر. ئەو خوێندکارەی کە وەڵامی پرسیارێکی مامۆستا دەداتەوە دەکرێت وەڵامەکەی بە ئەم جۆرە بهێنێتە دارشتن: "لە ڕاستیدا نازانم بەڵام پێدەچێت وەڵامی پرسیارەکانم ...". بە جۆرێک خوێندکار داندەهێنێت بە ئەوەی کە مامۆستا بڕیاری کۆتایی دەرچوونی لە تاقیکردنەوەکە دەدات.

با بگەڕێینەوە بۆ لای تێکستەکەی بەرهەم ئەحمەد ساڵح و سەیری ئەم دەربڕینەی بکەین: "ئارەزوومە ئەم پەنجەرەیە بۆ تەماشاکردنی ئێوەی خوێنەریش بێت". هەڵبژاردنی وشەی "ئارەزوومە" بە واتای گومان دێت. پێچەوانەکەی بێگومان-ییە. ئەگەر نووسەر بە دڵنیاییەوە قسەی بکردایە ئەوا دەیتوانی بنووسێت "ئەم پەنجەرەیە بۆ تەماشاکردنی ئێوەی خوێنەریشە". ئەم دارشتنە خوێنەر دڵنیا دەکات لە خوێندنەوەی هەر نووسینێکی ڕەوانەکراو بۆ ئەدرەسی ئەلکترۆنی ماڵپەڕەکە لە لایەن، بە لایەنی کەمەوە، سەرپەرشتیارانی.

## چوارچێوە Frame

گرنگترین بەش لە بونیادی نێوکەسایەتیدا ئەو چوارچێوە کۆمەڵایەتییەیە کە تێکستەکە دەیخولقێنێت. ئەمە سەبارەت بە دۆخی هاریکاریکردنی نێوان بەشداربووانی پەیوەندییەکەیە. بەپێی ئەم چوارچێوەیە تێکست بەدوای دامەزراندنی پەیوەندی لەگەڵ خوێنەرانیدا دەگەڕێت. بە جۆرێکی تر تێکست تەنها ڕەنگدانەوەیەکی ناچالاکانەی دۆخی دەرەکی خودی تێکستەکە نییە، بەڵکو تێکست ئەو ژینگە ناوەکییەش دادەمەزرێنێت کە گونجاوە بۆ ئەوەی بگات بە مەبەستەکەی. چوارچێوەی تێکست پێویست ناکات یەکانگیر بێت لەگەڵ ئەو چاوەڕوانییەی کە لە تێکستەکە دەکرێ، بەڵام کۆنتێکست دەستنیشانی ئەو چوارچێوەیە دەکات کە گونجاو و باوەڕپێکراوە. بۆ نمونە نووسراوێکی فەرمی کە لە لایەن ڕێڤەبەری پۆلیسەوە ئاراستەی هاووڵاتییەک دەکرێ، ناکرێ هاوسۆزی و نزیکایەتی پێوە دیاربێت، ئەگەر نا زۆر نامۆ و جێگەی باوەڕ نابێت. بەڵام چوارچێوە کاریگەری لەسەر خوێنەر/وەرگر دادەنێت کە چۆن لە نووسراوێک تێبگات. نووسراوێکی دادگا کە بە ڕێزەوە داواکاری ئاراستەی هاووڵاتییەک دەکات، لەوانەیە ببێت بە هۆی کەمتر هەستپێکردنی ئەو پەیوەندییە ناهاوتایە کە لە لایەن هەردوو لادا هەیە، بەبەراورد لەگەڵ نووسراوێک کە ئاساییانە نووسرابێت. ئەم جۆرە چوارچێوە دەبێت بە شێوازێک کە چۆن تێکست لەسەر کۆنتێکست مامڵە لەگەڵ خوێنەرانی بکات.

بۆ دنیای دەرەکی تێکستێکی نووسراو تەماشای نێنەرو وەرگرو پەیوەندییەکانی نێوانیان دەکرێ. بۆ دنیای ناوەکی تێکست، ئەو دنیایەی کە وشەکان دیاری دەکەن، واتە چوارچێوە، ئەوا جۆرەها تێکستی ئەز و تێکستی تۆ

گوهداری دەکرێ. تێکستی ئەز ئەو کەسەیە کە لە تێکستە پێشکەشکراوەکەدا دێتە قسە، ئەو کەسەی کە قسەکەی ئاراستەیە تێکستی تۆ-یە. لە دەربڕینێکی وەکو ئەمە "*تۆ چی دەکەیەت بەیانی؟ تۆ دەتوانیت بێیت بۆ ماڵی من.*" ئێمە ڕووبەڕووی پەیوەندییەک دەبینەوە کە دەربارەی دوو کەسن کە زۆر باش یەکتر دەناسن. لە ئێرەدا ڕۆڵی هەر دوو کەسەکە "من و تۆ" دیارە. لە مانشێتی ڕۆژنامەیەکدا دەکرێت ئەمە بنووسرێت" *ئایا لە یاری تۆپی پێی نێوان هەڵبژاردەی سلێمانی و دهۆک کێ سەردەکەوێت؟*" لە ئێرەدا پرسیارەکە ئاراستەی خوێنەرانی ڕۆژنامەکە ناکرێت بەڵکو ئاراستەی "تۆ" دەکرێت. ئەگەر خوێنەر لە خوێندنەوەی تێکستەکە بەردەوام بێت بە مەبەستی خوێندنەوەی زیاتری تێکستەکە ئەوا ئەو بە ئەو ڕۆڵەی کە تێکستەکە پێی بەخشیوە ڕازی دەبێت.

لە تێکستەکەی بەرهەم ئەحمەد ساڵح-دا ڕاستەوخۆ بانگی خوێنەر دەکرێت، "میوانانی بەڕێز". ئێمە بە ئەم جۆرە بانگکردنە دەبێژین پێگوتن. پێگوتن لە ڕوانگەی جڤاکییەوە پڕبایەخە چونکە ئەمە دەستنیشانی شوێنی خوێنەر دەکات وەکو ڕۆڵی وەرگرێکی گونجاو، هەروەها بەپێی مەبەستی تێکستەکە پێناسەیەکیشی دەداتێ. پێگوتن دەکرێت کەسانی تریش، بێجگە لە ئەو خوێنەرە چاوەڕوانکراوە، بگرێتەوە بە تایبەتی ئەو دەمانەی کە دیالۆگ لە تێکستەکەدا هەبێت. بۆ نمونە لە تێکستەکەی بەرهەم ئەحمەد سالح ئەمە هاتووە: "*ئەم داوایەم گشتییە، بۆ هەموو هاوڵاتیانە، بەڵام بەتایبەتیش مەبەستم لە ڕوناکبیران و خوێندکاران و گەنجەکانمانە...*" . لە ئێرەدا پێگوتن ئاراستەی کەسانی تر دەکرێت تاکو خوێنەری تێکستەکە.

هەروەها لە ڕێگەی لەسەرگوتنی کەسەکان، تێکستەکە چوارچێوەی خۆی دیاریدەکات، بە تایبەتی لە دەمێکدا تێکستەکە دەربارەی خودی ئەز بێت. ئایا

تێکسته ناوی کەسەکـه، پێگـەی ڕێڤـەبـەری وەکـو بـەڕێوبـەر یـان وەزیـر، ئاسـتی خوێندەواری دکتۆر یان پرۆفیسۆر، پێگەی ئـاینی یـان پیـشەیـی وەکـو مامۆسـتا، پارێزەر، نیشان دەدات؟ هەڵبەت ئەم لەسەرگوتنانه زۆر شت دەربـارەی بۆچـوونی جڤاکی لەسەر کەسەکه دادەنێت. بەرهەم ئەحمەد ساڵح چوارچێـوەی کـەسـایەتـی خۆی له تێکستەکه دیاری نەکردووە.

### نزیکی و دووری Distance

له تێکست باس له دووری و نزیکی دەکرێ. له ڕێگـەی بـەکارهێنـانی جـۆرەهـا ماملەی زمانەوانی، ستراتیجی کۆمەلایەتـی، پێگـوتن، لـەسـەرگـوتن هـی تـر، ئـەوا جۆرەها تێکستی ئەز بەپێی جـۆرەهـا دووری لـه تێکـستی تـۆ وێـستگه دەگرێـت. هەڵبەت تشتێکی ئاشکرایه بەتایبەتی له دەمی ئاخافتندا که ئێمه زۆر لـه نزیکـەوە لەگـەڵ ئـازیز و خۆشـتەڤـیـێن خـۆ قـسەدەکـەیـن تـاکو کـەسـانێکی نـەناسـراو لـه کارمەندانی ڕێڤەبەری و دەزگاکانی فەرمی تری حکومەت. بۆ نمونـه ئێمـه لـەگـەڵ کـەسـێکی زۆر نزیـک بـه ئاشـکراو بـێ پـێچ و پـەنـا گفتوگـۆ دەکـەیـن؛ لـەگـەڵ بەکارهێنانی ناوی کەسەکـه. بۆ کـەسـێکی تـر بـەپێـی دووری ناسـیاوی و پێگـەو ئاستی ڕێڤەبەری، ئـاینی، کۆمـەلایـەتـی هتـد. لـەسـەرخـۆو بـه ئاگـاداری گفتوگـۆ دەکەین لەگەڵ بەکارهێنانی وشەی تر پێش ناوەکەی، ئەمه ئەگەر ناوی کـەسـەکـه بێته بەکارهێنان. له ئەم بارەدا بـۆ نمونـه دەگوترێـت: کـاک یـان مامۆسـتا ئـازاد، دکتۆر، جەنابی بەڕێوبەر یان جەنابی وەزیر، بەڕێز هتـد. نزیکـی و دووری پتـر لـه دۆخەکانی فەرمیدا دەردەکەوێت.

نزیکی و دووری له چوارچێوەی کۆمەلایەتیدا زۆر گـرنگن. ئـەمـه وادەکـات کـه تێڕوانینەکانی نێوکەسایەتی پترتر بێته دەرکەوتن و پترتر پەیوەندییـەکـانی نێـوان

تێکستی ئەز و تێکستی تۆ بهێنێتە دەرخستن. لە پارچەی یەکەمی تێکستەکەی بەرهەم ئەحمەد ساڵحدا ئەمە هاتووە: "من" خۆشحاڵبووم لەم سەکۆیەوە بە خزمەتان "ئێوە" دەگەم و سوپاس بۆ ئێوەش کە ئەم مەڵپەڕەتان هەڵبژارد تا لە نزیکەوە بە دید و ڕوانین و هەروەها چالاکییەکانی بەندە ئاشنا بن. نزیکی زۆرە لە ئەو دەمانەی کە دەنگی بانگکردنی وەکو لە ئەز یان ئێمە بۆ تۆ و ئێوە لە تێکست هەبێت. لە ئەم تێکستەدا ئەم دەنگانە بەدەر دەکەوێت: بێجگە لە ئەمە تێکستەکە بە "<u>میوانانی بەڕێز</u>" دەستی پێکردوە کە ئاماژە بە دۆخێکی نافەرمی دەدات لەگەڵ ڕێزگرتنی ئەو کەسانەی کە تێکستەکەی ئاراستەدەکرێت. ئەمەش ئەو پەیوەندییە نزیکە کە چاوەڕوان دەکرێ هەبێت پتر تر نزیک دەکاتەوە.

## ماملەکردنی زمانەوانی و کۆمەڵگا Speech act an Society

بەپێی ئەو ڕوونکردنەوانەی کە لە "چوارچێوە و بۆچوون" باسکران ئەوا ئێمە جارێکی تر باس لە تێکستەکەی بەرهەم ئەحمەد ساڵح دەکەین. ئەم تێکستە دەکەفێتە نێو کۆنتێکستی ڕامیارییەوە بە مەبەستی دروستکردنی پەیوەندییەکی بەرفراوان لەگەڵ خەڵک. بە شێوەیەکی سەرەکی، تێکستەکە ئاراستەی ئەو خوێندەوارانە کراوە کە دەتوانن ئەم شێوازی پەیوەندیکردنەی ئەنتەرنێت بەکاربهێنن. لە بەرامبەردا وا چاوەڕوان دەکرێ کە خوێنەران بتوانن پەیامی خۆیان بەپێی ئەم شێوازی پەیوەندیکردنە بگەیەنن بە نووسەری تێکستەکە. ئێمە لە کەلتووری تێکستدا گوتمان کە تێکست ڕەنگدانەوەی ئەو ڕێساو نەریەت و هەڵسوکەوتانەیە کە بەندە بە کۆمەڵێک خەڵک لە پانتایی ماوەیەک. نووسەر سودی لە ئەم کەناڵە پێشکەوتووەی پەیوەندی وەرگرتووە بۆ پەیداکردنی پەیوەندییەکی بەرفراوان لەگەڵ جەماوەردا. ئەمەش دەستپێشخەرییەکی دروست و تازەیە بۆ کەسێک کە کارایە لە گۆڕەپانی

ڕامیاری ئەمڕۆی کوردییدا. نووسەر بەپێی ئەو ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی و کەلتوورییەی کە لە کۆمەڵگای کوردیدا هەیە، مامڵەکردنی زمانەوانی "باش"ی بەکارهێناوە، وەکو "**بەخێرهاتن، ڕێزگرتن، سوپاسکردن و پیاهەڵدان**".

بەرهەم ئەحمەد ساڵح وشەی باشی تر وەکو "*بەختەوەری، ژیانێکی شایستەتر، پێشکەوتن و گەشەکردن*"ی بەکارهێناوە. ئەم وشانەش واتای گۆڕانکاری دەگەیەنن. ئەو کەناڵی پەیوەندیکردنەی کە نووسەر بەکاری هێناوە، تازەیە. دیسان بەشداربووانی ئەو چالاکییەی کە تێکستەکەی نووسەر دەچێتە نێوی تازەیە. پێشتر نووسەر ڕووبەڕوو لەگەڵ ژمارەیەکی سنوردار لە دۆستانی دەپەیڤی بەڵام ئێستا لە ڕێگەی ئەم مێدیۆمەوە دەتوانێت پەیوەندی لەگەل سەدەها هەزار کەس بکات لە دووری هەزاران کیلۆمەتر. ئەم کەسانە تەنها لە ڕێگەی مێدیاکانەوە بەرهەم ئەحمەد ساڵح دەناسن. بێجگە لە ئەوەی کە نووسەر ئاماژە بە گۆڕانکاری دەدات، ئەوا دیسان کەناڵی پەیوەندیکردنەکە و ژمارەی زۆری بەشداربووان واتای گۆڕانکاری دەدات لە ئەو کۆنتێکستەی کە تێکستەکە دەچێتە نێوی. ئایا بەرهەم ئەحمەد ساڵح بەپێی ئەم گۆڕانکارییانە تێکستەکەی هاتۆتە داڕشتن؟ ئایا تێکستەکە بەپێی پەیوەندیی نێوان نووسەرەکەی، خوێنەرانی هاتۆتە داڕشتن؟

گرنگترین خاڵ کە بەرهەم ئەحمەد ساڵح بە هەند وەری نەگرتبێت ئەو چوارچێوەیەیە کە پەیوەندی خۆی لەگەڵ خوێنەرانی دادەمەزرێنێت. ئەو سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی حکومەتی هەرێمی کوردستانە. نووسەر دەبوایە پێگەی دەستەڵاتی خۆی بۆ خوێنەر دەستنیشان بکردایەو بەپێی ئەو چوارچێوەیەی کە ئەو لە نێویدا دەژی لەگەڵ خوێنەرانی بهاتایە گفتوگۆ. دیسان بەپێی ئەم دەستەڵاتە خوێنەر چاوەڕێی ئەو ڕۆڵانە دەکات کە نووسەر دەیدات بە ئەز تێکست و تۆ تیکست. دەستنیشانکردنی ئەم چوارچێوەیە پێویستە، چونکە

مەرج نییە هەموو خوێنەرانی ماڵپەڕەکە بەرهەم ساڵح بناسن! وەکو سەرۆکی حکومەت نووسەر لێپرسراوە بەرامبەر گشت ئەو خەڵکەی کە لە پانتایی سنووری حکومەتەکەیدا دەژین. سنوری ئەم هەرێمە لە شاری زاخۆ تاکو هەردوو شارەدێکانی مەیدان و قۆرەتووی خانەقینە. لە پانتایی ئەم سنوورەدا دەڤۆک و دیالێکتی قسەکردنی زۆر هەیە، بە تایبەتی شێوەزاری شاری سلێمانی و دهۆک. بەرهەم ئەحمەد ساڵح شێوەزاری سلێمانی بەکارهێناوە، بۆ نمونە تەنها وشەیەکی بەکارهێنراوی کرمانجی باکوور لە تێکستەکەدا نییە، بێجگە "پێشنیاز" کە جێگای سەرنجە. ئەمەش واتای سنوردارکردنی خوێنەرانی دەگەیەنێت.

بەرهەم ئەحمەد ساڵح ئاماژەدەدات بە ئەوەی کە کەسێکی سیاسییە، بەڵام دەستنیشانی پێگەی دەستەڵاتی سیاسیی خۆی ناکات. ئەو بەپێی ئەو کۆنتێکستەی کە سیاسەتی تێدا دەکات ناهێتە قسەکردن بەڵکو بەپێی مرۆڤێکی سیاسی شاری سلێمانی خۆی نیشانی خوێنەران دەدات. خۆقەتیسکردنی نووسەر لە سووچێکی ئەو کۆنتێکستەی کە تیایدا دەژی بە واتای تەنها بچووککردنی قەبارەی پێگەی سیاسی و پانتایی کاریگەری سیاسی خۆی ناگەیەنێت، بەڵکو واتای کەم کارتێنەکردنی ئەو کۆنتێکستەیە بەسەر خودی نووسەردا. دیسان نووسەر زمانی نووسین و قسەکردنی لە یەکتر جودا نەکردۆتەوە، ئەگەر نا ژمارەی وشەکانی ڕستەیەکی نەدەگەیشتە ١١٢ وشە (بڕوانە زمانی نووسین و قسەکردن). ئەمەش ئەوە نیشان دەدات کە نووسەر، بۆ نمونە، تێکستەکەی پێنگاڤ پاش پێنگاڤ دانەڕشتووە.

زانینی ئەوەی کە نووسراوە بەس نییە بۆ تێگەیشتنی تێکست، بەڵکو خوێنەر دەبێت بزانێت تێکستەکە چی دەکات. نووسەریش دەبێت ئامانجی نووسینی تێکستەکەی بە پوختی بخاتەڕوو. بە گشتی ئەرکی پەیوەندیی تێکست لە نێوان

نێنەرو وەرگر هەیە. ئەو هاوهامەنگییە کۆمەڵایەتییەی کە لە نێوان نووسەرو خوێنەوارانـدا هـەیـە، وەکـو چوارچێوە، بۆچوون و دوور و نزیکی، پێویستە لـە داڕشتنی تێکستدا بێتە دیاریکردن. ئەمانە لە بواری بوونیادی نێو کەسایەتی لـە تێکستەکەی بەرهەم ئەحمەد ساڵح باش نەهاتۆتـە داڕشـتن. تێکستەکە بە پێی ئەو چالاکی و شێوازی پـەیوەندیکردنـەی کـە ئـەو هـەیـەتـی لـەگـەڵ خوێنـەرانـی نـەهاتۆتـە داڕشـتن: سـەرۆکـی حکومـەت-هاوولاتیـان. ئـەو سـوودی لـە ئـەو گۆڕانکارییانە وەرگرتووە کە لە کەلتوری کۆنتێکستی کۆمەڵگای کوردیدا هاتۆتـە مـەیـدان بـەڵام تێکـستەکـەی ئاراسـتەی گـشت پانتـایی سـنووری چـالاکی و پـەیوەندییـەکانی خـۆی نـەکـردووە. دیـسان بونیـادی تێکستەکـەی نووسـەر لـە هەڵبژاردنـی وشـە، سـینتاکس و پێکهاتـەی تێکـست دروسـت نـەهاتۆتـە داڕشـتن. هەروەها ناوەڕۆکی تێکست یان بونیادی کەسایەتی سەبارەت بە بابەتـە لابـەلاکـان و پەیوەندییان بە بابەتـی سـەرەکـی و پێـشنیار بـۆ ئـەم بابـەتانـە پـشێوی پێـوە دیارە.

## کورتەی باس

ئێمە پێشتر گوتمان کە بونیادی تێکست، بونیادی کەسایەتی و بونیادی نێو کەسایەتی تێکست لەگەڵ یەکترو لەگەڵ ئەو کۆنتێکستەی کە دەچنە نێوی لێک دانەبڕاون. ئەم سێ بونیادەو کۆنتێکست کاریگەری لەسەر یەکدی دادەنێن و ناکرێت لە یەکدی بێنە جوداکردن. نەخشەی خوارەوە کورتەی ئەم مۆدێلە باسدەکات.




وێنەی ٢٧. هاوهامەنگی نێوان بوونیادی تێکست، بوونیادی کەسایەتی تێکست و بوونیادی نیو کەسایەتی تێکست لەگەڵ کۆنتێکست.

# بەشی پێنجەم

## زمانی کوردی

### سەرەتا

### کوردستان و کورد

لە مێژووی ڕۆژهەڵاتی ناڤین وڵاتێک بە ناوی کوردستان نییە، بەڵام نەتەوەیەک بە ناوی کورد دێتە بەرچاو. ئەو هۆزانەی کە پێکهاتەی ئێستای کورد پێک دەهێنن نەک هەر دێنە باسکردن لە مێژوو، نەخاسمە لە مێژووی کۆن، بەڵکو خودانی شارستانی، ئاین و ئیمپراتۆڕی بوون. بەڵگە زۆرن کە گەواهی ئەم گۆتنەی من بدەن، بە تایبەتی لە بوارەکانی شوێنەوارناسی، ئاینی، زمانەوانی و هەروەها باوەڕ و هزر و داب و نەریتی ئەم کۆمەڵە خەڵکە کە جیاوازە لە نەتەوەکانی دەوروبەری. ئەم کتێبە باسی ئەم بوارانە ناکات بەڵام ئەو کەسەی دەخوازێت دەتوانێت بڕوانێتە کتێبەکانی مێژوویی، بۆ نمونە "شەرەفنامە"ی شەرەفخانی بەدلیسی و "کورد و کوردستان"ی ئەمین زەکی بەگ.

ئێمە لە ڕوداوێکی مێژوویی دەست پێدەکەین کە کاریگەری بەسەر ئەم کۆمەڵەی کە پێی دەگوترێت کورد هەیەو بۆ ئەم باسە زمانەوانییە پڕ بایەخە. ئەم ڕووداوەش دابەشکردنی یەکەم جاری خاکی کوردستانە لە لایەن شاکانی

ئێران و دەوڵەتی عوسمانی لە ساڵی ١٥١٤ بەپێی ڕێکەفتننامەی چاڵدێران[٢٢]. ئەم ڕێککەفتنە دوای شەڕی نێوان شا ئیسماعیل سەفەویی ئێران و سوڵتان سەلیمی عوسمانی دێت. جێی ئاماژەیە کە هێزەکانی کورد، کە لەسەر بنەمای خێڵ سەرچاوەی گرتبوو، بەشێک بوون لە پێکهاتەی ئەم دوو سوپایە. لەشکری میرەکانی کورد ڕۆڵیکی بالآیان هەبوو لە سەرکەفتنی سوپای عوسمانی لە شەڕەکە، بۆیە سوڵتانی عوسمانی ژمارەیەک لە ناوچەی میرنشینی تاکو ڕادەیەک سەربەخۆی بۆ کوردان پێکهێنا. میرەکانی کورد دەبوو ڕێز لە سنوری ناوچەکانی میرنشین بگرن و نەدەبوو هەوڵی فراوانخوازی ناوچەی دیاریکراو بە خۆ بدەن. هەڵبەت مەبەست لە ڕێزگرتنی سنووری ناوچەکانی میرنشین لە لایەن میرەکانی کورد نادامەزراندنی وڵاتێکی یەکگرتووی کوردی بوو.

## کوردستانی ژێر دەستەڵاتی عوسمانی

وەکو پێشتر ئاماژەی پێدرا، لە ئەنجامی بەشداریی کاریگەری هۆزەکانی کورد لە سەرکەفتنی عوسمانییەکان بەسەر شای سەفەویدا ئەوا سوڵتانی عوسمانی میرەکانی کوردی خەڵات کرد بە دروستکردنی چەند میرنشینێک. ئەم میرنشینانە پابەندبوون بە ئەوەی کە لە خزمەتی سوڵتانەکانی عوسمانی بن. بەپێی ئەم پابەندبوونە میرەکان نەیاندەتوانی لەگەڵ یەکتر ڕێکبکەفن و یەکبگرن. میرەکانی کورد بەریەرکانێ و دژایەتی سوڵتانەکانین نەدەکرد بەڵام سوڵتانەکان هەردەم ئاگری شەڕ و ناکۆکیان لە نێوان میرەکان خۆش دەکرد. بێجگە لە ئەمە میرەکان زۆر لوتبەرز بوون بەرامبەر بە یەکترو گیانی دووبەرەکی و تۆڵەسەندنەوەیان دژ بە یەکتر زاڵتر بوو هەتاکو هەست و هزری نەتەوایەتی. لە ڕاستیدا بنەماکانی

---

[22] بڕوانە سادق شەرەف کەندی (١٢:١٩٩٦).

کۆمەڵگای کوردەواری لەسەر پێگەکانی سیستەمی عەشیرەتی دامەزرابوو. سوڵتانەکان زانیاری دروستیان دەربارەی تای تەرازووی هێزی هەموو عەشرەتێک یان میرنشینێک هەبوو، هەروەها زانیاری وردو درشتیان سەبارەت بە هزرو کردەوەی میرەکان و سەرۆک عەشیرەتەکان و باری کەلتووری و کۆمەلایەتی و ئابوریی دانیشتوانی دەڤەرەکانی میرنشین هەبووە.

سوڵتانەکان بە درێژایی مێژوو میر و سەرۆک خێڵەکانیان دژ بە یەکتر بە شەڕ دەدا، لەسەر بنەمای کەرت بکە و زاڵ بە. زۆرجار بۆ چاوترساندن و کەمکردنەوەی هێزەکانی میرنشین و بڵاوکردنی بێباوەڕی و بێمتمانەیی لە دەڤەرەکانی کوردنشین میرێک یان سەرۆک هۆزێک لە لایەن سوڵتانێکەوە تەنگی پێهەڵدەچێنرا کە یاخی بێت. دواتر ناوچەی ئەو میرە یاخیبووە دەکەفتە بەر کۆمەڵکوژی و تالانی لە لایەن میرەکان و هۆزەکانی تری کوردەوە. بێجگە لە دەستکەفتەکانی شەڕ بۆ لەشکرە کوردەکان و فراوانکردنی دەستەلات بۆ ماوەیەکی کاتی بۆ ئەو میرە کوردانەی کە پێش سوپای عوسمانی دەکەفتن، ئەوا ئەم میرانە پایەیان لە لای سوڵتانەکان بەرزتر دەبوو، بۆ نمونە لەقەبی "پادشا"یان وەردەگرت. لە مێژووی کوردان ژمارەیەک ناوداری کورد، کە بە شانازییەوە باسیان دەکرێت، لەقەبی "پادشا"یان هەیە. هەڵبەت هەندێک لە ئەم پادشایانە ناچارکراون یاخی ببن لە لایەن دەستەلاتی عوسمانییەوەو دواتر بە یارمەتی عەشیرەتەکانی تری کوردەوە لە لایەن سوڵتانەکانەوە. تەفرو تونا کراون.

میرو عەشیرەتە کوردەکان نەک هەر ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبووە لە کوشتن و تالانکردنی یەکتری بەڵکو پێش سوپای عوسمانی کەوتوون بۆ سەرکوتکردنی نەتەوەکانی تر کە ڕادەپەڕین بۆ ئازادبوون لە دەستەلاتی عوسمانی. ئەم ڕەوشە

ناهەموارە بەردەوام بووە تاكو شەڕی یەكەمی جیهان. لە ئەم شەڕە ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانی تێكشكا و بۆ چەندین وڵات دابەشكرا. بە ئەم شێوەیە خاكی كوردستانی ژێر دەستەڵاتی عوسمانی بۆ جارێكی تر بەسەر سێ ولاتی تازە دروستبوو لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین دابەشكرا و لكێندرا، ئەوانیش توركیا، سوریا و عێراقن.

ئێمە پێشتر گوتمان كە سیستەمی ڕێڤەبەری میرنشینەكان لەسەر بنچینەی خێڵەكایەتی یان عەشرەتگەری دامەزرێنرابوو، بۆ نمونە ئەگەر میرێك یان سەرۆك خێڵێك بمردایە ئەوا كوڕەكەی (پتر كوڕە گەورە) دەبوو بە میراتگر. لە لایەكی تر سوڵتانەكان هەمیشە ئاگری ناكۆكی و دووبەرەكییان خستۆتە نێو میرنشینەكانی كوردەوە. هەروەها سوڵتانەكان زانیاریی وردو درشتیان لەسەر میرنشینەكان و ئاستی ژیانی ئابووری و كۆمەڵایەتی و كەلتووری دانیشتوانەكانیان هەبووە.

بۆ نمونە ئەگەر میرێك دەوڵەمەند ببوایە، ئاستی بژێوی خەڵكی ژێر فەرمانڕەوایەتی باش ببوایە و میر و دەستوپێوەندەكانی هزری نەتەوایەتی و بایەخیان بە خوێندەواری و فەرهەنگی كوردی بدابایە ئەوا لە لایەن سوڵتانەكانەوە لەناو دەبران[23]. میر، موتەسەریف، ئەلبای و پادشا كوردەكان نەیاندەتوانی لە ئەو بازنەیەی كە دیاریكرابوو بۆیان بچنە دەرەوە، ئەگەر نا لەناودەبران یان دووردەخرانەوە بۆ جێگایەكی دوور لە كوردستان. دژایەتیی بەردەوام و پلانداڕێژراوی سوڵتانەكانی عوسمانی هۆكارێكی گرنگ بوو بۆ پەرەنەسەندنی زمان و وێژەی كوردی. هەربۆیە كە ژمارەی ئەدیب و شاعیرانی كورد، زیاتر شاعیران، هەتاكو ڕوخانی دەوڵەتی عوسمانی لە دەوروبەری ٢٠ كەسدا بێت تشتێكی نامۆ نییە.

---

[23] بۆ نمونە عەبدال خان و میرنشینەكەی لە بتلیس تەفرو توونا كرا. بڕوانە سەعید ناكام (١٩٧٩).

## کوردستانی باکور یان لکێنراو بە تورکیا

کۆماری تورکیا لە ساڵی ١٩٢٣ بە سەرۆکایەتی مستەفا کەمال ڕاگەیەنرا. مستەفا کەمال "کەمال ئەتاتورک" سەرۆکی بزوتنەوەی ناسیۆنالیستی تورک بۆ دەرکردنی هێزەکانی بێگانە لە تورکیا بۆ یەکەمینجار لە کوردەکان یارمەتی وەرگرت. بە یارمەتی کوردەکان بزوتنەوەی ناسیۆنالیستی تورکیا ئەرمەنەکان و گورجییەکانی لە ڕۆژهەڵاتی تورکیاو یۆنانییەکانیان لە ڕۆژئاوای تورکیا دەرکرد. لە ساڵی ١٩٢٤ مستەفا کەمال لە مەجلیسی حکومدا حکومەتەکەی بە حکومەتێکی تورکی ناوبرد. هەر لە ئەم ساڵەوە حکومەت و سوپای تورکیا دەستیان کرد بە کۆمەڵ کوشتن و کۆمەڵ کۆچپێکردنی کوردان و زمانی کوردی قەدەغە کراو نکۆڵی لە بوونی کورد هاتە ڕاگەیاندن. کوردان ئەم ڕەوشەیان پەسەند نەکردو چەندین ڕاپەڕین و بەرەنگاریان دژی دەوڵەتی تورکیا ئەنجام دا بەڵام لەبەر هۆکاری ناوخۆیی، وەکو هزری عەشیرەتگەری و نەبوونی بەرنامەی بەرپلاو، و هۆکاری دەرەکی، بە تایبەتی دژایەتیکردنی دەوڵەتانی ڕۆژئاوا لە دامەزراندی وڵاتێکی کوردی، ڕاپەڕینەکان شکستیان هێناوە[٢٤]. هەرچۆنێک بێت خەبات بەردەوامە بۆ ڕزگاری کوردستان بەڵام مخابن هەتاکو ئەمڕۆ هزری ئاینی (کورد موسڵمانی برا بچوکە)و عەشیرەتگەری و ناکۆکی و دوژمنایەتی لە ئەم بەشە برەوی هەیەو دژ بە بەرژەوەندی کوردان کەڵکی لێ وەردەگیرێت.

ئەمڕۆ لە کوردستانی لکێندراو بە تورکیا زمانی کوردی نکۆڵی لێناکرێت بەڵام لە بوارەکانی فەرمی نایەتە بەکارهێنان و زۆرینەی دانیشتوانی ئەم پارچەیە نازانن و ناتوان بە کوردی بنووسن، بەڵکو قسەش بکەن. هەتاکو ئەمڕۆ بەکارهێنانی زمانی کوردی لە قوتابخانەو زانکۆو ڕێڤەبەرییەکانی تر قەدەغەیەو بلاڤۆک لە

---

[24] بڕوانە د. سادقی شەرەفکەندی (١٩٩٦:١٣١)

شێوەی کتێب، گۆڤار، ڕۆژنامەو ریکلام هتد. بە زمانی کوردی گەلێک سنوردارە. لە ئەم پارچەیە دوو دیالێکتی سەرەکی هەیە؛ کرمانجی ژووروو و زازا. کرمانجی ژووروو لە چەندین دەڤۆک و شێوەزار پێکهاتووەو هەتاکو ئێستا هیچ کام لە ئەم دەڤۆک و شێوەزارانە فۆرمێکی ستانداردی ناوچەیی وەرنەگرتووە. سەبارەت بە زازا ئەوا هەندێک نڤیسکارێن زازا دەبێژن کە زازا زمانێکی سەربەخۆیەو کوردی نییە. هەڵبەت کەسانی پشت ئەم بانگەشەیە گۆڤارێکیش بە ناوی زازا چاپ و بڵاو دەکەن[٢٥]. هەروەها زازا لە چەندین دەڤۆک و شێوەزار پێکدێت کە هەتاکو ئێستا فۆرمێکی دیاریکراوی نییە. دیسان زازا، بەپێی مەزهەب، بەسەر دوو پێکهاتەی سەرەکی دابەشبوون؛ زازای عەلەوی و زازای سونی.

### کوردستانی ڕۆژئاوا یان لکێنرلو بە سوریا

لە پاش شەڕی یەکەمی جیهان سوریا، کە پێشتر بەشێک بوو لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، کرا بە دەوڵەت. بەشێکی کەم لە خاک و دانیشتوانی کوردستان لکێنرا بە ئەم وڵاتە تازەوە. ڕێژەی دانیشتوانی کورد لە ئەم پارچەیە بە بەراورد لەگەڵ نەتەوەی عەرەب کەمە. لە ئەم پارچەیە بوونی کورد نکوڵی لێ ناکرێت بەڵام ژمارەیەکی بەرچاوی کورد لە ناسنامەی سوری یان هاووڵاتیبوون بێبەشن. ئەمیش واتای بێبەشبوونیان لە سادەترین مافەکانی مرۆڤ دەگەیەنێت، وەکو مافی منداڵان بۆ چوونە خوێندنگا. سوریا ڕامیاری بەعەربکردنی خاکی

---

[٢٥] وشەی "زازا" لە لایەن خەلکی "زازا" نایەتە بەکارهێنان. زازا-ی عەلەویی مەزهەب بە خۆ دەبێژن "کرمانج"و بە زاراوەی خۆ دەبێژن "کرمانجکی". زازا -ی سونی مەزهەب بە خۆ دەبێژن "کرد"و بە زاراوەی خۆ دەبێژن "کردکی". هەروەها خەلکی "زازا" بە خەلکی کرمانجی باکور دەبێژن "کردئاسی". ژێدەر "مالمیسانژ" لە هەڤپەیڤینێک لە کتێبخانەی کوردی لە ستۆکهۆڵم ٢٠-١١-٣-١٢. ئەم زانیارییە لە لایەن کەنعان دۆغان کە "زازا"یە دووپات کراوە.

کوردستانی پیادە دەکات بۆ نمونە "پشتێنەی ئاسایش"ی بۆ ناوچەکانی کوردنشینی نێوان سنووری لەگەڵ تورکیا دروست کردووە. ئەمەش بووە بە هۆکاری ڕاگواستنی سەدەها هەزار کورد لە زێدی خۆیان.

لە ئەم پارچەیە زمانی کوردی تەنها لە بواری قسەکردن دێتە بەکارهێنان. کوردانی ئەم پارچەیە دیالێکتی کرمانجی ژوورو بەکاردەهێنن.

## کوردستانی باشوور یان لکێنراو بە عێراق

لە پاش شەڕی یەکەمی جیهان، عێراق کە بەشێک بوو لە دەوڵەتی عوسمانی، لە لایەن دەوڵەتانی ڕۆژئاوا دروستکرا. لە عێراق سێ پێکهاتەی سەرەکی هەیە: کورد و عەرەبی سونە و عەرەبی شیعە. مێژوو گەواهی دەدات، بە تایبەتی لە دروستبوونی ئەم وڵاتەوە، کە هیچ دەمێک ئەم سێ پێکهاتەیە برایانە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ یەکتر نەکردوە. بە پێچەوانەوە کەلتوور و ڕابردوویەکی پڕ دوژمناکارانەیان بەرامبەر بە یەکتر هەیە.

زۆرینەی دانیشتوانی عێراق، عەرەبی شیعەیە، ئینجا کوردو عەرەبی سونە. هەرچۆنێک بێت لە دروستکردنی ئەم وڵاتە هەتاکو ساڵی ٢٠٠٣ کەمینەی عەرەبی سونە فەرمانڕەوایەتی ئەم وڵاتەیان کردووە. بە پێچەوانەی نەتەوە سەردەستەکانی تری وڵاتانی داگیرکەری پارچەکانی تری کوردستان، عەرەبی سونە توانای تەواوی بەسەر خاکی عێراقدا نەبووە. مەبەست لە توانای تەواو توانای سەربازی، کەلتووری، مەزهەبی، نەژادی هی تر دەگرێتەوە. ئەم وڵاتە لە ڕۆژی دروستبوونیەوە هەتاکو ئەمڕۆ ناجێگیرهو کورد هەمیشە لە ڕەوشی شۆڕشدا بووە دژ بە حکومەتی ناوەندیی عێراق. ئەمیش واتای ئەوە دەگەیەنێت کە کورد تاکو ڕادەیەک جۆرە دەستەڵاتێکی سەربازی، کەلتووری، ڕامیاری، ڕێڤەبەری و زمانیی هەبووە.

له کوردستانی لکێنراو بە عێراق هەمیشە زمانی کوردی بەکارهاتووە، بە تایبەتی لە قوتابخانەکان. لە ئەم پارچەیە هەمیشە ڕۆژنامەو گۆڤارو کتێب چاپ و بڵاو کراوەتەوە. هەرچەندە لە ئەم پارچەیەدا بێجگە زازا هەموو دیالێکتەکانی دی هەیە بەڵام زۆرینەی بەرهەمەکانی نووسراو بە دیالێکتی کرمانجی خواروو، دەڤۆکی سلێمانی-یە. هۆکارەکانی پاش باڵادەستی دەڤۆکی سلێمانی بەسەر ئەم پارچەیە زۆرن بۆ نمونە: لە سەرەتای دروستبوونی وڵاتی عێراق لە ئەم شارە مەملەکەتی کوردستان هاتۆتە ڕاگەیاندن و لە ئەو دەمانەوە و هەتاکو ئەمڕۆ بزوتنەوەی ڕۆشنبیری، وێژەیی، ڕۆژنامەگەریەتی و بلاڤۆکی نووسین لە ئەم شارە پترترە لە هەموو شارەکانی تری کوردستان. دەڤۆکی سلێمانی بەسەر گشت دەڤۆک و شێوەزارەکانی تری کرمانجی خواروو زاڵبووە.

ئەمڕۆ زۆربەی کوردەکانی پارچەکانی کوردستان و قسەکەرانی تری دیالێکتەکانی دی کەم تاکو زۆر شارەزای ئەم دەڤۆکە هەن. هۆکارێکی دی بۆ باڵادەستی دەڤۆکی سلێمانی یان کرمانجی خواروو بە بەراورد لەگەڵ دیالێکتەکانی تر لە ئەم پارچەیە ئەوەیە کە ئەم دیالێکتە زۆرینە پێکدەهێنێت. هۆکاری تریش هەیە وەکو ڕامیاری و ڕێڤەبەری. دهۆک لە ساڵی ١٩٦٩ کرا بە پارێزگا لە دەمێکدا ڕووبەری ئەم پارێزگایە نیوەی دەڤەری بادینان پێکناهێنێت. نیوەکەی تر خرایە سەر پارێزگای موسڵ کە بەشێکی دانیشتوانەکەی کەوتنەبەر شاڵاوی ڕاگواستن و بەعەرەبکردن. لە قوتابخانەکانی شاری دهۆک هەتاکو پێش ڕاپەڕین زمانی عەرەبی بەکاردەهێنرا و برافی ڕۆشنبیری و بلاڤۆکی وێژەیی و زمانەوانی کەم بوو. هۆکارێکی تر دابڕانی دەڤەری بادینان بوو لە ناوچەکانی تری کوردستان؛ بۆ نمونە دانیشتوانی ئەم دەڤەرە زیاتر هاتوچۆی شاری موسڵ-یان دەکرد هەتاکو هەولێر ئەمیش لەبەر نەبوونی یان خراپی ڕێگاویان و هەژاری. حکومەتی ناوەندی عێراق

بێجگە لە دابڕاندنی ئەم دەڤەرە لە ناوچەکانی تری کوردستان، ئەوا مامڵـەیەکی تایبەتیشی لەگەڵ خەڵکەکەی دەکرد بۆ نمونە کوردی یەزیدی و شەبەک ی بە کورد نەدەژمارد. ئەمیش واتای دابڕانی دانیشتوانی ئەم دەڤەرە لە یەکتری دەگەیەنێت. بێجگە لە ئەمانە ئەوا حکومەتی ناوەندی برەوی بە نەخوێندەواری و هزری تۆڵەسەندن و عەشایەری و دوژمنایەتی لە نێوان ئەم دەڤەرە و ناوچەکانی تری کوردستانی باشوور داوە. هۆکاری تریش هەیە بۆ نمونە لە ساڵی ١٩٦٩ زانکۆی سلێمانی هاتە دامەزراندن بەڵام زانکۆی دهۆک لە سالێ ١٩٩٢ هاتە دامەزراندن.

خاڵێکی تر، جوگرافیی شاری سلێمانییە کە ڕۆڵێکی گرنگی دیوە لە ئەوەی ببێت بە چەقی بزاڤی خەباتی کوردایەتی و زمانەوانی. شاری سلێمانی بە شار و شارۆچکەی کوردی دەورەدراوەو بە بەراورد لەگەڵ شارەکانی تری کوردستان کە نزیکبوون لە دەستەڵاتی نێوەندی عێراقی و دەڤەری نیشتەجێی عەرەبی. ڕاگواستن و بەعەرەبکردنی شارو گوندەکانی شەنگال، کەرکوک، دووزخورماتوو، شارەبان، خانەقین، جەلەولاو مەندەلی هتد. لە ساڵەکانی ١٩٧٠ دەستی پێکرد. بەشێکی بەرچاوی ئەم ڕاگوێزراوانە لە شارەکانی سلێمانی و هەولێر نیشتەجێ بوون. ئەمەش بوو بە هۆکاری گەورەتربوونی ئەم دوو شارە و پتەوتربوونی بزاڤی بەرگری و ڕۆشنبیری و زمانەوانی.

لە لایەکی تر کوردانی لوڕ (فەیلی و شیعە مەزهەبی کورد) لە سەرەتای ١٩٧٠کاندا دوچاری بەربڵاوترین شاڵاوی کوشتن و ڕاگواستن هاتوون. هەتاکو ئەمڕۆ زۆرینەی شوێنەکانی نیشتەجێبوون و سامانیان لە لایەن عەرەب داگیرکراوە. هەتاکو ئەمڕۆش زۆرینەی کوردی فەیلی، هەروەکو زۆرینەی

کوردەکانی ناوچە دابڕاوەکانی تر لە هەرێمی ڕێڤەبەری کورد، لە باری هەژاری و نەخوێندەواری و فشاری عەرەبی دەژین.

دانیشتوانی ناوچەکانی دابڕاو لە هەرێمی کوردستان لە بارێکی دەروونی خراپ دەژین، بە تایبەتی کوردانی یەزیدی، شەبەک و فەیلی. بێجگە هەژاری، نەخوێندەواری، کەمی خزمەتگوزاری و بێهێزی ڕەوتی ڕۆشنبیری و ویژەیی لە ئەم ناوچانە ئەوا خەڵکەکەشی هەمیشە لە ژێر هەڕەشەی کوشتن دەژین. بێجگە پلان و نەخشەی داگیرکەران بۆ تێکدانی هزری نەتەوایەتی ئەم سێ کەمینەیەی کورد لە کوردستانی باشوور ئەوا سیاستمەداران و نووسەران و ڕۆشنبیرانی کورد ڕەخنەو گازندەیەکی ناڕەوا دەکەنە سەر ئەم کەمینانە. ئەم سیاسەتمەدار، نووسەر و ڕۆشنبیرانە کە بەخت یاوەریان بووە و لە ژیانێکی خۆش و کامەران و ئارام دەژین دەیانەوێت خەڵکانێک کە لە باری هەژاری و هەڕەشەی مردن دەژین وەکو ئەوان بیربکەنەوە. لە بری تەرخانکردنی ڕێژەیەک لە داهاتی حکومەتی هەرێم بۆ دانیشتوانی ئەم ناوچانە کە زۆرترین زیانی بەرکەووتووە و ڕێزگرتن لە باوەڕ و تایبەتمەندییەکانیان ئەوا ئەم بەڕێزانە ئەم کەمینانە بە ئەوە تاوانبار دەکەن کە گوایە ئەوان ئایین و مەزهەب پێش کوردایەتی دەخەن. ئاسۆی ئەم جۆرە بیرکردنەوانە تەسکە، نەک بەرفراوان، یەک لایەنەیە، نەک فرەلایەن، سادەیە، نەک ئاڵۆز. ئەم جۆرە بیرکردنەوانە هاوتەریبە لەگەڵ بیرکردنەوەی تەسک و سنووردار و یەک لایەنەی هزری دەرەبەگایەتی کە هەمیشە لە لایەن داگیرکەرانی کوردستان بەکارهاتووە و بەکاردێت[٢٦].

---

[26] هۆکاری مێژوویی هەیە کە بۆچی کوردی یەزیدی بەدگومانە لە کوردایەتی؛ بۆ نموونە بەدرخان بەگ لە دەوروبەری ساڵەکانی ١٨٤٠ دا کوشتارێکی زۆری لە کوردانی یەزیدی لە ناوچەکانی هەکاری، نسێبین، جزیر هتد. کرد. هەروەها میر محەمەدی ڕەواندز کوشتارێکی

ئاریشەیەکی تر کە لە ئەم چەند ساڵەی دواییدا لە نێوان سیاسەتمەدارو نڤیسەران و ڕەوشنبیرێن دەڤەری بادینان و سۆران سەری هەڵداوە شەڕە زاراوەیە. پێشڕەوان و پەرەپێدەرانی ئەم ئاریشەیە ئەو کەسانەن کە بەخت بووە بە یاوەریان، کە یەک لایەنە، سادە، هەڕەمەکیانە، دەرەەبەگانە بیردەکەنەوە. لایەنێکیان دەبێژێت با شێوەزاری سلێمانی ببێت بە زمانی ستاندارد بۆ کورد؛ لایەنەکەی تر باسی جووت ستاندارد دەکات بەبێ ئەوەی دەستنیشانی زاراوەیەکی دیاریکراو بکات لە دەڤۆکەکانی کرمانجی ژووروودا. ئەم داواکارییە لەسەر بنەمای زانستی سەرچاوە ناگرێت و کەسانی پاش داواکارییەکە پسپۆڕو شارەزای لینگویستیک نین. دیسان سەپاندنی شێوەزارێک یان جووت ستانداردی پێشێلکردنی ڕاستەوخۆی مافی خەڵکانی سەر بە دیالێکتەکانی لوڕی، هەورامی و زازایە، کە ئێمە جار جار گلەیی و سەرزەنشتی کوردایەتییان دەکەین.

ئەمرۆ شاری دهۆک بووە بە بنکە بۆ دیالێکتی کرمانجی ژووروو. نڤیسەرو ڕۆشنبیرێن ئەم شارە خاوەن ماتریالی زۆرن. تاکو ڕادەیەکی باش لە دامودەزگاکانی فەرمی ئەم شارە دەڤۆکی بادینی دێتە بەکارهێنان بەڵام چونکە ئەم دامودەزگایانە گرێدراوی وەزارەتەکانی پایتەختی هەرێمی کوردستانن ئەوا کارمەندانی ئەم شارە دەبێت شارەزای دیالێکتی کرمانجی خواروو بن. بە واتایەکی تر دەبێت هەردوو کرمانجی خواروو و ژووروو بزانن. لە بەرامبەردا خەڵکانی شارەکانی تری کوردستانی باشوور پێویستیان بە فێربوونی کرمانجی ژووروو یان

---

زۆری لە کوردی یەزیدی کرد. دیسان لە ساڵی ٢٠٠٨ پاش ئەوەی کوردانی یەزیدی کچێکیان بە ناوی "دوعا" بەردباران کرد لەبەرئەوەی لەگەڵ موسڵمانێک پەیوەندی خۆشەویستی هەبووە، ئەوا هەندێک لە کوردی موسڵمان لە شاری هەولێر هێرش و هەوڵی تۆڵەسەندنەوەیان لە هەندێک خوێندکاری کوردی یەزیدی کرد کە لە زانکۆی سەلاحەدین دەیانخوێند.

بادینی نییە، چونکە ئەو بڕیار و ڕێنماییانەی کە لە پایتەختەوە دێت بە سۆرانییە نەک بادینی. دابڕینی یان دابڕاندنی شاری دهۆک لە شارەکانی تری کوردستان واتای زیانێکی نەتەوەیی مەزن دێت. خۆشبەختانە بواری کردەنی دابڕاندن نییە.

دهۆک دەتوانێت، بەڵکو دەبێت، ببێت بە خاڵی گرێدان لە نێوان کرمانجی خواروو و ژووروودا. دهۆک بە تەنیا توانای بەڕێوەبردنی ئەم ڕۆڵەی نییە بەڵکو پێویستی بە پشتگیری دەرەکی هەیە، بە تایبەتی لە شارەکانی تری کوردستانی باشوور. لە ڕوانگەی ڕێڤەبەری و نەتەوەییەوە دهۆک ناچارە دەرگا بەرەو ڕووی کرمانجی خواروو بکاتەوە، بە هەمان شێوە دەبێت دامودەزگانی فەرمی گشت کوردستانی باشوور دەرگا لە ڕووی کرمانجی ژووروو یان بادینی بکەنەوە. کرانەوە بە ڕووی یەکتر، ڕێزگرتن و پەسەندکردنی یەکتر وەکو ئەوەی کە هەین نەک وەکو ئەوەی کە هەندێک کەس دەخوازن، واتە سەپاندنی بیرو بۆچوون بەسەر یەکتر. لە ڕوانگەی یەکگرتنی زمانی کوردییەوە دەبێت هەموو لایەک، لەسەر بنەمای لینگویستیکی، کەم تاکو زۆر لە تایبەتمەندییەکانی لایەنەکانی بەرامبەر پەسەند بکات. هەموو لایەک دەبێت هەست بکات کە پشکی دیالێکتەکەی ئەو لە زمانی فەرمی، ستاندارد یان یەکگرتووەی کە هێمایە بۆ نەتەوەبوون هەیە. زمانبەکارهێنەرانی کوردی شارەکانی کرماشان، سنە، هەکاری، دەرسیم دەبێت لە بەدیمەنکردنی ئەو زمانی فەرمیـیە کە واتای یەکبوونی هەموومان دەگەیەنێت تەواو هەڵە نەبن. زمانی فەرمی کوردی نابێت تەنها ڕەنگدانەوەی شارێک، دەڤۆکێک یان شێوەزارێک بێت.

## کوردستانی ڕۆژهەڵات یان لکێنراو بە ئێران

لە ئێران بنەماڵەی سەفەوییەکان ئیمپراتۆریەتێکیان دامەزراندو مەزهەبی شیعەی ئیسلامیان وەکو ئاینی وڵات پەسەندکرد. پێش دەستپێکردنی شەڕی چاڵدێران هەندێک لە ئەو کوردانەی کە لە دەڤەرەکانی کوردنشین دەستەڵاتداربوون پێشنیاری هاوکاریکردنیان بە شا ئیسماعیلی سەفەوی کرد دژ بە سوپای عوسمانی. شا ئیسماعیل نەک هەر پێشنیارەکەی بەرپەرچ دایەوە، بەڵکو هەندێک لە کوردەکانیشی زیندانی کرد. هۆکاری پەسەندنەکردنی پێشنیاری خانەدانەکانی کورد لە لایەن شا ئیسماعیل-ەوە مەزهەب بوو، چونکە کوردەکان سونی مەزهەب بوون.

لە ئەم بەشە، هەر وەکو بەشەکەی عوسمانی، کوردەکان خاوەن میرنشین بوون بەڵام هەر هزری دەرەبەگایەتی و گیانی ناکۆکی و دووبەرەکی لە نێوان کوردان زاڵ بووە. لە پاش چەند شەڕێکی سەخت لە ماوەی ساڵەکانی ١٧٥٢ تاکو ١٧٩٥ دا بنەماڵەیەکی کورد بە سەرۆکایەتی کەریمخانی زەند فەرمانڕەوایی گشت ئێرانی گرتە دەست. کەریم خانی زەند وەکو سەرداری چەند نەتەوەیەک دەهاتە ئەژمارن نەک وەکو سەردارێکی کورد. ئەو لە ئێران لەقەبی "وەکیل"ی وەرگرت نەک شا، بە پێچەوانەی سەردارەکانی فارس، کە یەکسەر لەقەبی "شا"یان بە خۆیان ڕەوا بینی.

هەروەکو بەشەکەی عوسمانی، لە ئەم بەشەدا چەندین ڕاپەڕین و سەرهەڵدان دژ بە دەستەڵاتی ناوەندی کراوە بەڵام چونکە ئەم ڕاپەڕین و سەرهەڵدانانە لە چەند دەڤەرێکی سنوردارکراودا بوون ئەوا پتر مۆرکی خێڵەکی تاکو نەتەوەیی هەبووە. لە ساڵی ١٩٤٥ بە یارمەتی یەکێتی سۆڤیەتی جاران وڵاتێکی کوردی بە نێوی کۆماری مهاباد هاتە دامەزراندن. فشاری وڵاتانی ڕۆژئاوا، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو

بەریتانیا، لەسەر یەکێتی سۆڤیەت بوو بە هۆکاری نەمانی پشتیوانی بۆ کوردان بەڵام پشتیوانی و بەهێزتربوونی دەوڵەتی ناوەندی ئێران. ساڵی ١٩٤٦ کۆماری کوردستان لە مهاباد بەبێ بەرگری لە لایەن سوپای ئێران ڕوخێنرا.

زمانی کوردی لە ئەم بەشە تەنها بۆ قسەکردن دێتە بەکارهێنان. لە بوارەکانی فەرمی و خوێندن زمانی فارسی دێتە بەکارهێنان. زمانی قسەکردن واتای بەکارهێنانی چەندین دیالێکت و دەڤۆک و شێوەزاری جیاواز دەگەیەنێت لە لایەن کوردەکانی ئەم بەشە. هەرچەندە هزری نەتەوایەتی لە ئەم بەشە پتر بووە بەڵام هێشتا بنەمای خێڵ، دیالێکت/دەڤۆک، مەزهەب و ئاین بەهێزە.

## زمانی کوردی

زمانی کوردی سەر بە کۆمەڵەی زمانەکانی ئێرانییەو پێکدێت لە چوار دیالێکت: کرمانجی ژووروو، کرمانجی خوارو، لوڕو گۆرانی. هەر دیالێکتێک پێکهاتەی چەند دەڤۆکێکە، هەر دەڤۆکێکیش پێکهاتەی ژمارەیەک شێوەزاری بچوکتری ناوچەیین. شوێنی جوگرافی دیالێکتەکان بە پێی خشتەی خوارەوەیە:

١. دیالێکتی کرمانجی ژووروو: بە هەموو زاراوەو دەڤۆکەکانی لە کوردستانی لکێنراو بە تورکیا، ئێران، عێراق و سوریا.

٢. دیالێکتی کرمانجی خواروو: بە هەموو زارلوە و دەڤۆکەکانی لە کوردستانی لکێندراو بە عێراق و ئێران. کۆنتاکتی لەگەڵ هەموو دیالێکتەکاندا هەیە (بێجگە زازایی).

٣. دیالێکتی لوڕ: بە هەموو زارلوەو دەڤۆکەکانی لە کوردستانی لکێندراو بە عێراق و ئێران.

٤. دیالێکتی گۆرانی: بە هەموو زاراوە و دەڤۆکەکانی لە کوردستانی لکێنراو بە عێراق، ئێران و تورکیا. کەمینە پێکدەهێنێت[٢٧].

ئاستی تێگەیشتنی هاوبەش لە نێوان قسەکەرانی دیالێکتەکان/زاراوەکان/دەڤۆکەکان بۆ یەکتر بەندە بە نزیکی جوگرافی، تێکەڵاوی، هەروەها رادەی هۆشیاری و خوێندنەوە، پلەی خوێندن، ویست و کەسایەتی قسەکەران و دۆخی کات و شوێن وەک هەر زمانێکی تر لە جیهان. بۆ نمونە لە لایەک ئاستی تێگەیشتنی هاوبەش لە نێوان قسەکەرانی زاراوەی گەرمیانی لە شاری خانەقین لەگەڵ زاراوەی سلێمانی لە شاری سلێمانی باشە، هەروەها ئاستی تێگەیشتنی هاوبەش لە نێوان قسەکەرانی سلێمانی لەگەڵ زاراوەی سۆرانی لە شاری سۆران باشە بەڵام بە گشتی ئاستی تێگەیشتنی هاوبەش لە نێوان قسەکەرانی گەرمیانی لە خانەقین لەگەڵ قسەکەرانی سۆرانی لە سۆران پڕ باش نییە هەرچەند هەردوو زاراوەکە دەکەونە چوارچێوەی دیالێکتی کرمانجی خواروو. لە لایەکی تر ئاستی تێگەیشتنی هاوبەش لە نێوان قسەکەرانی زارلوەی گەرمیانی لە دیالێکتی کرمانجی خواروو لەگەڵ قسەکەرانی زارلوەی فەیلی کە لقێکی دیالێکتی لوڕە باشە لە شاری خانەقین و دەوروبەری، هەروەها ئاستی تێگەیشتنی هاوبەش لە نێوان قسەکەرانی سۆرانی/دیالێکتی کرمانجی خواروو لە سۆران لەگەڵ زاراوەی بادینی کە لقێکی دیالێکتی کرمانجی ژووروە باشە. بە ئەم شێوەیە ئێمە دەکرێت بێژین ئاستی تێگەیشتنی هاوبەش هەیە لە نێوان فەیلییەک بۆ گەرمیانییەک، گەرمیانییەک بۆ سلێمانییەک، سلێمانییەک بۆ سۆرانییەک، سۆرانییەک بۆ

---

[27] هەڵبەت ئەم دابەشکردنە بە پێی فواد حەمە خورشیدە (١٩٨٥:٤٠. هەندێک بۆچوونی دی هەیە کە دەبێژن زازایی و هەورامی دوو دیالێکتی جیاوازن.

بادینییەک، بادینییەک بۆ بۆتانییەک هتد. ئەم جۆری تێگەیشتنی هاوبەشە پێی دەگوترێت تێگەیشتنی کۆنتینیۆمی.

ڕاستییەکی ئاشکرا ئەوەیە کە تاکو ئێستا "سەرەڕای هەموو شۆڕش و ئالۆگۆڕەکان" ئاستی تێگەیشتنی هاوبەش بە پێی پانتایی جوگرافی نێوان قسەکەرانی ئەم دیالێکتەکانە کەمە. هۆکارەکانی ئەم کەم تێگەیشتنی هاوبەشە دەگەڕێتەوە بۆ گەلێک هۆ لە ئەوانە، مێژوویی، نەبوونی دامەزراوەیی کارگێڕی کوردی، سستی ئالۆگۆڕی دیمۆگرافی، هێشتنەوە و پەراوێزخستنی کۆمەڵگای کوردی، بێهێزی مێدیا، هۆکاری ئاینی وەک بوونی شیعە، عەلەوی، سونە، یەزیدی، کاکەیی هتد.، کەمی خوێندەواران و ئاستی نزمی خوێندەواری و سیستەمی خوێندن، کەلتوری بالادەستی نەتەوە سەردەستەکانی کوردستان، هەژاری، کەمی ڕێگاوبان و ئامرازی هاتووچۆ و پەیوەندیکردن و هتد. بەلام لە هەمووی گرنگتر، بێجگە نەبوونی وڵاتێکی سەربەخۆ، نەبوونی زمانێکی فەرمییە کە بتوانێت ئەم هەموو دیالێکتانە بگرێتەخۆ، بەجۆرێک قسەکەرانی ئەم دیالێکتانە لە دەمی ئاخافتنی فەرمیدا یان نیمچە فەرمیدا هانا بەرن بۆ ئەم زمانە بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ یەکتردا. لە ئێرەدا من دەخوازم بێژم کە ئاستی تێگەیشتنی هاوبەش لە نێوان ئەو کەسانەی کە تێکەلاون لەگەڵ قسەکەرانی دیالێکتەکانی تر، ئاستی خوێندەوارییان بەرزە و داواکاریی زمانەوانییان لەسەر خۆیان هەیە باشە.

## زمان و کۆمەڵ

لە کۆمەڵگای کوردەواری لە کوردستانی لکێنراو بە عێراق گەلێک گۆرانکاری لە بوارەکانی ڕێڤەبەری، ئاوەدانی، نیشتەجێکردن، کارگێڕی، تێکەلاوبوون، مێدیا و هتد. هاتۆتە ئاراوە، ئەمە بێجگە لە مێدیای کوردی لە دەرەوەو تێکەلاوبوونی

ڕەوەندی کورد لە هەموو پارچەکانی کوردستان لە تاراوگە. ئێستا قسەکردن بە هەموو جۆرە دیالێکت و زاراوەکانی کوردی دەتوانرێت بێتە بیستن لە زۆربەی ماڵان لە ڕێگەی ئامێری سەتەلایت. ئەم گۆڕانکارییانە کاردەکەنە سەر زمانی بەکارهێنراوی کۆمەڵی کورد لە هەردوو بواری فەرمی و نافەرمی. ئێستا ئاستی تێگەیشتنی هاوبەش لە زمانی قسەکردن لە نێو بەکارهێنەرانی دیالێکتەکان چاکترە لە ڕابردوو. ئەمەش بە واتای گۆڕانکاری لە زمانی بەکارهێنراوی کوردی دێنە ئەژماردن چونکە لە گفتوگۆ پەیڤ و ڕاڤەی وشە و ڕستەکانی قسەکەران کە سەر بە دیالێکتی جودان دێنە بەکارهێنان و گۆڕین.

### زمان و نووسەران و خوێندەواران

زمانی نووسین هەمان زمانی قسەکردنە لە کوردییدا. بەڵگەم هەیە بۆ ئەم گۆتنەم: زمانی نووسینی کرمانجی خوارو لە کوردستانی لکێنراو بە عێراق شێوازی زمانی قسەکردنی شاری سلێمانییە. بەڵام زمانی نووسین لە بڵاوکراوە و قسەکردنە فەرمییەکانی مێدیاکانی کوردستانی لکێنراو بە ئێران کە کرمانجی خوارو بەکاردەهێنن ڕەنگدانەوەی زمانی قسەکردنی خەڵکی ئەم پارچەیەیە و جیاوازە لە کوردانی لکێندراو بە عێراق. هەمان تشت بۆ کرمانجی ژووروو: زمانی نووسین لە دەڤەری بادینانی کوردستانی لکێنرلو بە عێراق کە زمانی قسەکردنی خەڵکی ئەوێیە جیاوازە لەگەڵ زمانی نووسینی دەڤۆکی بۆتانی کە هەردوو سەر بە هەمان دیالێکتن. مەبەستی من ئەوەیە کە نووسەران بە زمانی قسە دەنووسن نەک بە زمانی نووسین. جگە لە ئەمە کتێبێکی ڕێزمان نییە کە ئەم نووسەرانە پشتی پێببەستن بۆ داڕشتنی ڕستەو تێکست.

له ئێرەدا پێویست بە نمونەهێنانەوە ناکات چونکە ئەمە ڕاستییەکی ئاشکرایە. سەرەڕای ئەمانە زۆرێکی نووسەران داواکاریی زمانەوانییان لە سەر خۆیان کەمە، بۆ نمونە نووسەران تێکست بە دیالێکتێکی تر ناخوێنن بۆئەوەی ئاشنای ئەو وشەو دەستەواژانە بن کە زۆر دێنە بەکارهێنان لە دیالێکتی تر. ئەگەر نووسەرێک ئەمە بکات ئەوا خەزێنەی وشەی پتر دەبێت، هێدی هێدی ئەم وشانە دەخاتە بواری بەکارهێنان، ئاستی تێگەیشتنی بۆ تێکستی تر لە دیالێکتی تر زیاتر دەبێت، هەروەها ئاستی تێگەیشتنی خوێنەران لە دیالێکتەکانی تر بۆ نووسینەکانی ئەم نووسەرە زیاتر دەبێت. بە گشتی نووسەرانی کورد، یان ڕاستر نووسەری قسەی زاراوەکان، ئاراستەی نووسینەکانیان بەرەو ڕووی خوێندەوارانێک دەکەن کە خەسڵەتیان سنووردارە بە پێی هەردوو، ژمارەو ناوچە. ئەمانەش خەسڵەتی ئێتنیکە نەک نەتەوە (بڕوانە بەشی نەتەوەو ئێتنیک).

دیسان مخابن زۆرێکی خوێندەواران، تەنانەت ئەوانەی کە خاوەنی بڕوانامەی بەرزن، یەک ڕۆمانیان تەنانەت بە ئەو دیالێکتەی کە خۆیان پێی دەپەیڤن نەخوێندۆتەوە. تێگەیشتنی هاوبەش کەمە چونکە ئاستی داواکاری نووسەرو خوێندەواران لەسەر خۆیان و بەرامبەرەکانیان کەمە. ڕۆمانێک کە بە دیالێکتی کرمانجی خواروو نووسرابێت ئەوا ژمارەی خوێندەوارانی سنووردارەو زیاتر دانیشتووی شاری سلێمانین. ڕۆمانێک کە بە دیالێکتی کرمانجی ژووروو نووسرا بێت ئەوا خوێندەوارانی زیاتر سنووردارترەو زیاتر دانیشتووی دهۆکن.

وەکو بەرسڤێک بۆ هەندێک نمونەی خراپ کە هەندێک نڤیسکار بۆ ئەرگومێنتەکانیان بەکاری دەهێنن من دەبێژم: ئاستی تێگەیشتنی هەڤپشک لە نێوان عەرەبێکی عێراقی و عەرەبێکی سوریا کە هەر دوو نەخوێندەوار بن کەمە. بەڵام لە عێراق و سوریا یەک زمانی نووسین هەیەو ئەم زمانەش وا دەکات کە

خوێندەوارانی هەردوو وڵات لە یەکتر تێبگەن. ئەز دەخوازم بێژم: ئەگەر کورد نەتوانێت، نەخوازێت یان هەست نەکات بە پێویستی دروستبوونی زمانی نووسین، کە ستانداردو فەرمییە، کەواتە نەتەوە نییە، بەڵکو پێکهاتەی چەند ئیتنێکێکی جیا جیایە کە ناتوانن کاری هەڤپشک بکەن لەبەر نەبوونی بەرژەوەندیی گشتی و نەبوونی هزری پێکڤە ڕێڤەبەری.

## ئایا دەکرێت زمانێکی فەرمی بێتە بەرهەمهێنان؟

وێنەی ژمارەی ٣ لە لایەک دووری و نزیکی دیالێکتەکان لە یەکتر و لە لایەکی تر چۆنیەتی نزیکخستنەوەی ئەم دیالێکتانە لە یەکتر نیشان دەدات.




*وێنەی ٢٨*. دووری و نزیکی دیالێکتەکان/دەڤۆکەکان و تا ڕادەیەک وێنەیەکی ئایدیاڵی تێکەڵبوونیان.

وەک دیارە کرمانجی خواروو تێکەڵاوی ڕاستەوخۆی لەگەڵ هەموو دیالێکتەکان هەیە. ئەم دیالێکتە شوێنی جوگرافی باشە، دەکەفێتە ناوەڕاستی هەمووان، مێژووی تێکەڵاوی زۆرە لەگەڵ دیالێکتەکانی تر. هەروەها خاوەنی زۆرینەی کەرەستەی خوێندن، خوێندەواران، دۆکمێنت، کتێب و نووسینە لە هەموو

بوارەکانی وێژە، هونەرو زانستی[28]. بێجگە لە زەمینەیەکی لەبار، ئەوا کۆددانان و ئەرکەکانی تاقیگەیی ئەم دیالێکتە لە ئەوانی تر گەلێک پێشکەفتووترە. سەرەڕای هەموو ئەم خاڵە ئەرێنییانە نابێت کرمانجی خواروو بێتە سەپاندن بەسەر دیالێکتەکانی تر، بەڵکو دەبێت ئەم دیالێکتە بە گۆڕانکاری جۆری و چەندایەتی لە بواری زمانەوانی بێتە تێکەڵاوکردن لەگەڵ دیالێکتەکانی تر، بە تایبەتی لەگەڵ کرمانجی ژوورو. ئەمە دەکرێت ببێتە جێگەی پەسەندبوونی هەموو لایەک. چونکە دیالێکتی کرمانجی خواروو و ژوورو زۆرینە پێکدەهێنن، زۆرترین کۆنتاکتیان لەگەڵ یەکترو ئەوانی تر هەیە. ئەمەش ئاستی تێگەیشتن پتر دەکات، لەبەر هەندێک تواناشیان زیاتر دەکات بۆ بوونیان بە فەرمیبوون[29]. بەڵام پێنگاڤی کردەنی بۆ ئەم پرۆسەیە چۆن دەبێت و لە کوێ دەبێت دەست پێبکرێت؟

ئەز لە ئێرە لە چەندین ڕوانگە تیشک دەخەمە سەر دەستپێکردنی ئەم پرۆسەیە. هەرچۆنێک بێت ئەم ڕوانگانە لەگەڵ یەکتر تێکەڵاون، لە یەکتر ناهێنە جوداکردن و کاریگەرییان لەسەر یەکتر دەبێت:

---

[28] هەڵبەت نووسین بە دیالێکتی کرمانجی ژوورو لە پێشکەفتنە.

[29] لە ڕوانگەی مێژوو بۆچوونێک هەیە کە دەبێژێت هەورامی و زازایی زمانی ئاینی کۆنی کورد بووە، بۆیە ڕەسەنترینە. لەبەر هێرشی داگیرکەران قسەکەرانی ئەم دوو زاراوەیە ناچارکراون لە کوێستانەکان بژین و بهێنە گۆشەگیر کردن. ئەم دوو دیالێکتە کەمترین کۆنتاکتیان هەبووە لەگەڵ دیالێکت و زمانی دی بۆیە پاکترین دوو دیالێکتی کوردییە. ئەمە وا دەکات کە ئەم دوو زاراوەیە گەشەی زمانەوانی کەمتر بکەن و قسەکەرانی دیالێکتەکانی تر کەمتر لە ئەمان بێنە تێگەیشتن. دیسان بەکارهێنەرانی ئەم دوو دیالێکتە کەمینەن لە نێو کوردان هەر بۆیە ئەمان ناچاربوون زیاتر بە زاراوەی تر قسەبکەن. هەورامییەکان شێوازی قسەکردنی سلێمانی دەزانن، هەروەها زازاکان کەم تا زۆر شێوازی قسەکردنی کرمانجی ژوورو دەزانن.

## ڕوانگەی نووسین و قسە Writing and talk perspective

خوێنەر دەتوانێت جارێکی تر جیاوازییەکانی نێوان زمانی قسە و نووسین بخوێنێتەوە. ئێمە گوتمان کە قسە بریتییە لە شەپۆلێک هەوا کە لە دەمی قسەکەر دێتەدەرێ و بەر گوێکانی بیسەر (هەروەها گوێکانی قسەکەر) دەکەفێت. لەوما ئاساییە دەنگەکانی وشە یان وشەکانی ڕستە لە ساتی قسەکردن لە یەکتر نەیەنە جوداکردن. لە قسەکردن هەندێک دەنگ ناگوترێت یان دێنە قووتدان، یان لە ئەنجامی پرۆسەی فۆنەتیکی و فۆنۆلۆجی دەنگێک بە دەنگێکی تر دێتە گۆڕین. تەنانەت دەنگی زیاتر دەگوترێ کە پێویست بە گوتنی ناکرێ. ئەم ئالوگۆڕکردنەی دەنگەکانی قسەکردن کاردەکاتە سەر گوتنی وشەکان تاکو ئەو ڕادەیەی کە هەندێک وشە لە رستەدا بە هەڵە بگوترێ یان هەر نەگوترێ. ئاساییانە لە زمانی کوردیدا جێناو-ەکان ناگوترێت. هەروەها ئاساییانە ڕستەکانی قسەکردن لە گۆشەنیگای ڕێزمانەوە تەواو دروست نین، بەڵکو بێسەروبەری پێوە دیارە. بۆ نمونە ڕستەکانی قسەکردن بە ئاسانی لە یەکتر جودا ناکرێنەوە. بڕوانە بەشی فۆنەتیک و فۆنۆلۆجی[30].

بە پێچەوانەوە پیتەکانی وشە و وشەکانی ڕستە لە نووسیندا دیارە. هەروەها پارچەکانی تێکڕای تێکستێک هەر چەند درێژ بێت لێک جودا دەکرێنەوە چونکە ڕێکخراوە. هەربۆیە زمانی نووسین زمانێکی پارێزراوە.

کورد هەتاکو ئێستا خاوەن زمانێکی نووسین نەبووە هەربۆیە ئەو گۆڕانکارییانەی کە بەردەوام لە زمانی قسەکردن ڕوودەدات لە شوێنە جودا جوداکانی کوردستان پتر زمانی قسەکردنی دیالیکتەکان و دەڤۆکەکانی لە یەکتر دوور کردووە. هەروەها باڵادەستیی کەلتووری زمانەکانی دەستەڵاتدارانی بێگانەی

[30] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە کتێبی فۆنەیتک و فۆنۆلۆجی ٢٠١١ غازی عەلی خورشید.

کوردستان گرفتەکەی خراپتر کردووە. پێشتر لە بەشی وشە لە ڕوانگەی ڕێزمان ئەوە نیشان درا کە تەنانەت لە نێو دیالێکتی کرمانجی خواروو و ژووروو ڕێکخستن نییە، تەنانەت بۆ جێناوەکانیش.

ئێستاش لەگەڵ هەندێک نمونە:

**لە ئاستی دەنگ:**

فڕێدانی دەنگ وەکو: "منالْ، وار، کرن، شت" لە بری "منداڵ، بوار، کردن تشت".

گۆڕینی دەنگ وەکو: ئاخاوتن، کەوتن، حەوتوو و والاّ لە بری *ئاخافتن، کەفتن، هەفتە و ڤالا*.

پترکردنی دەنگ وەکو: نیاسین، ڕمیا، هەبووی لە بری ناسین، ڕما، هەبوو.

**لە ئاستی وشە:**

لکاندنی دوو وشە لەگەڵ یەکتر و قرتاندن وەکو: "لەو، لەوان، لێرە، بەو، لەوێ" لەبری "*لە ئەو، لە ئەوان، بە ئەو، لە ئەوێ*".

**لە ئاستی ڕستە:**

فڕیدانی وشە، لکاندنی دوو وشە لەگەڵ یەکتر، قرتاندن و وشەی نوێ وەکو:

"پێت دەڵێم" لە بری "من بە تۆ دەڵێم".

"پێتان دەڵێین" لە بری "ئێمە بە ئێوە دەڵێین".

"تە لێ خست" لە بری "تە ل ئەوێ خست".

"من ژێ ستاند" لە بری "من ژ ئەوی ستاند"

"سێوێکت دەدەمێ" لە بری "من سێوێک دەدەم بە تۆ".

## لە ئاستی تێکڕای تێکست

ئاساییانە دەنگەکان/پیتەکان وشە دروست دەکەن، وشەکان گرێ و ڕستە دروستدەکەن. دواتر ئەم ڕستانە پارچەکانی تێکست پێکدەهێنن. بۆ نموونە هەواڵێک، سەگوزشتەیەک، چیرۆکێک، ڤەکۆلینێک یان ڕیپۆرتاژێک. ئاساییانە لە قسەکردن دەنگەکان و وشەکانی ڕستە، بەڵکو ڕستەکانی نێو پارچەیەکی تێکستێک لە یەکتر جوداناکرێن ئەگەر بێنە نووسین، واتە ترانسکریپەکردن transcription. لە ڕوانگەی ڕێزمان و داڕشتن هەر ساتێک قسەکانی مرۆڤێک هاتە نووسین، ئینجا ئەو دەمە مرۆڤ دەزانێت چەندە قسەکانی ناڕێکخراو بووە. ئەو خوێنەرەی سەرنجی تێکستەکانی ڕۆژنامەکانی کوردستان بدات بە ئاسانی ئەوە بەدی دەکات کە تێکستەکانی ئەم ڕۆژنامانە تاکو ڕادەیەکی بەرچاو ناڕێکخراوە. لە ئەم گۆشەنیگایە دەتوانرێت پارچەیەک لە تێکستەکەی بەرهەم ئەحمەد ساڵح بە نموونە بهێنرێتەوە. پارچەیەک تێکست کە لە ١١٢ وشە پێکدێت بەڵام بریتییە لە تەنها ڕستەیەک! هەنووکە لەگەڵ دوو نمونە لە پارچەی تێکستی تر کە ئامارە بە هەمان گرفت دەدات، واتە جودانەکردنی پارچەی تێکست لە ڕستەی تێکست. بۆ دیتنی تێکڕای تێکستەکەی د. عبدالوهاب موسی بڕوانە پاشکۆی ئەم کتێبە. د. عبدالوهاب موسی یەکێکە لە لایەنگرانی جووتزمانی/ستاندارد بەڵام ئەم تێکستەی کە بەڕێزیان نووسیویەتی پێچەوانەی بۆچوونی جووتزمانی قسەدەکات. خاوەنی پارچە تێکستەکەی تر د. ڕەفیق شوانی-یە کە لایەنگری سەپاندنی زاراوەیەکە بەسەر دیالێکت و زاراوەکانی تری کوردی. نووسەر لە ئەم پارچەیەدا، کە ئەز لە کتێبی "زمانی کوردی و شوێنی لە ناو زمانەکانی جیهاندا" وەرم گرتووە، هۆی سیاسی وەکو بەڵگەیەک بۆ سەپاندنی شێوەزارێک دەهێنێتەوە.

د . عبدالوهاب خالد موسى ماڵپەڕی ئێکەتییا نڤیسەرێن کورد – دهۆک ٢٠١٠-٨-٠٣

جوگرافیا زمانی

جوگرافیا زمانی، د سەدێ بیستێدا رێبازا خویا تایبەتا ڤەکولینێ و چارچوڤێ دیارکرییێ کارێ خو گرتەبەر، هەرچەندە رهێن بابەتێ ڤەکولینا دیالێکتان د زڤرنەڤە سەدێ نوزدێ، واتە بنەماییێن جوگرافیا زمانی ل دەورویەرێن سالا ١٨٧٠ زایینی دەست پێکریە ل سەردەستێ وێ گرۆپا رێزمانڤانێن ئەلمانی ئەوێن رەنجەکێ باش مەزاختی د وارێ ڤەکولینێن زمانیداو ل دەمێ خو هاتینە ناڤکرن ب (رێزمانڤانێن لاو) ، ئەڤان زانایا گرنگیەکا تایبەت ب ڤەکولینا دیاردا هەبوونا دیالێکتان ددا ، چونکی ل وێ باوەرێ بوون کو دیاردا هەبوونا دیالێکتان دشێت باشترین بەلگەیا بدەتە وان دەربارەی تیورێن وانێن تایبەت ب گەشەکرنا زمانی و بەراوردکرنا زمانێن ئێک خێزان نەخاسمە خێزانا زمانێن هندو ئورووپی.

د. ڕەفیق شوانی لە کتێبی "زمانی کوردی و شوێنی لە ناو زمانەکانی جیهاندا" (٢٠٠٨:١٣٩)

هۆی سیاسی: لە سەردەمی بەرپاکردنی ڕاپەڕین و شۆڕشدا بەزارێک بڵاوکراوەو ڕاگەیەندراوەکانی لە ڕۆژنامەو ڕادیۆدا بڵاو دەکاتەوە، وردە وردە ئەو زارو شێوەزارە بە هۆی کاری سیاسییەوە گەشە دەستێنێت و مەودای بەکارهێنانی فراوان دەکات و بەهۆیی وشیاری و بڵاوبوونەوەی هەستی نەتەوایەتی و نیشتمانپەروەتییەوە، لە ناو ڕۆشنبیرو خوێندەوارو نووسەرانەوە بەکار دەهێنرێ، بەکارهێنانیشی بەرهەمی ڕۆشنبیریی جیاوازی پێ تۆماردەکرێت، ئەم بەکارهێنان

و بڵاوبوونەوەی ئـەم زارە، زەمینـەی بۆ خۆش دەبێت لـە سـەردەمـی ڕزگـاری نیشتمانی نەتەوەییدا پێویستی بە بڕیارێکی سیاسی گونجاو هـەیە بۆ ئـەوەی بکرێ بەزمانی فەرمی و نەتەوەی یا بەلای کەمەوە لە بەڕێوەبردنـی دام و دەزگا کارگێڕی و خوێندن و هۆیـە جیاجیاکـانی ڕاگـەیانـدن بـە شـێوەی سـەرانـسەری بەکاربهێنرێ و بوارنەدرێ بە شێوەزارێکی تر لەبەرانبەریدا بەکاربێت.

## ڕوانگەی فۆنۆلۆجی

ئێمە لە ئەم بەشە تیشک دەخەیەنە سەر ئەو جیاوازییانەی کە بـە ئاشـکرا لـە نێـوان هـەردوو دیـالێکتی کرمـانجی خـواروو و ژووروو دەبینـرێ. زۆرێـک لـە ئـەو وشـانەی کـە لـە کرمـانجی ژووروودا بـە دەنگـی /ف/ و /ڤ/ بێـژان دەکرێـت لـە کرمانجی خواروو، بە تایبەتی دەڤـۆکی سـلێمانی بـە دەنگـی /و/ بێـژان دەکرێـت. ئێمە پێشتر ڕوونمان کردەوە کە ئەم جیاوازییە نابێتە هۆی جیاوازی لـە واتـا. ئـەز لە ئێرە بۆچوونی خۆم سەبارەت بە ئەم جیاوازییـە نیـشان دەدەم. وشـەکانی بـۆ نمونە "ئاڤ، شەڤ، ئاخافتن، شڤان، ئەڤین، کەفـت، هـاڤین، ڤـالا، سـێف" بێنـە بەکارهێنان لە زمانی نووسین پەسەندترە تـاکو وشـەکانی "ئـاو، شـەو، ئاخـاوتن، شوان، ئەوین، کەوت، هاوین، والا، سێو". وەک دیارە کە دەنگی /و/ نیـوە بزوێنـە بەڵام دەنگی /ڤ/ نەبزوێنە ئەمـەش خوێنـەر پتـر دڵنیـا دەکـات کـە دەنگـەکـانی بـزوێن لـە نـەبـزوێن جـودا بکاتـەوە. ئاسـاییانە زۆرینـەی خوێنـدەواران زانیارییـان سـەبـارەت بـە فۆنـەتیـک و فۆنۆلـۆجی نییـە. لـە ڕاسـتیدا ئـەم بۆچوونـەی مـن چارەسەرێکی گونجاوە بۆ گرفتێک کە هـەیە لـە نێـوان ئـەم دوو دیالێکتـە، ئـەمـە هەرچەندە دیفتۆنگ شتێکی ئاساییە لە هەموو زمانێـک. بـە ئـەم جـۆرە منـداڵانی فێرگـەکـان زووتـر فێـری جیـاوازیی دەنگـی بـزوێن و نـەبـزوێن دەبـن، سـەرەڕای

ئاشنایەتی بۆ دیالێکت و دەڤۆکەکانی تر. بڕوانە ڕوونکردنەوەکانی کتێبی زمان و ئەدەبی کوردی (٢٠٠٧:١٣) بۆ پۆلی :

١. پیتی (وـ ی)ی بزوێن هەرگیز لە سەرەتای وشەو بڕگەوە نایەن و ئەوەی لەم شوێنانەدا هات بێگومان پیتی (وـ ی)ی نەبزوێنە، وەک (وەرزش، وازی، والا، یاری، ...).

٢. هەر کاتێک لە پێش و لەدوای پیتی (وـ ی)یەوە پیتێکی بزوێن هەبێت، ئەوا ئەم (وـ ی)یە بێگومان دەبنە پیتی نەبزوێن وەک (سێو، شێو، لاو لاو، تاو تاو، ...).

٣. ئەگەر لە پێش یان لە دوای پیتی (وـ ی)یەوە پیتێکی نەبزوێن هاتبێت ئەوا ئەم (وـ ی)یە دەبنە پیتی (بزوێن) وەک (کورد، دەستگوشین، بڕین، فڕین، ...).

٤. هەرگیز لە زمانی کوردییدا دوو پیتی (بزوێن) بە دوای یەکدا نایەن.

بێجگە لە ئەمە دیاردەی بەکارهێنانی دەنگی /ف/ لە جیاتی دەنگی /و/ لە دەڤەری گەرمیان، کرماشان، لوڕستان، سنەو هەولێر باوە. دیسان لە گۆشەنیگای ئیتمۆلۆجی زۆرێک لە ئەم وشانە لە بنەڕەتدا لە کرمانجی ژووروودا بەکارهێنراوەو دواتر هاتۆتە بەکارهێنان لە کرمانجی خواروو. ئەز ئەمەش وەکو بەڵگەیەک بەکاردەهێنم بۆ بۆچوونەکەم.

ئەز لە ڕوانگەی نووسین و قسە ئاماژەم بە هەندێک لایەنی دی لە گۆڕانکاریی فۆنۆلۆجی داوە. هەروەها بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە کتێبی "فۆنەتیک و فۆنۆلۆجی" لە نووسینی غازی عەلی خورشید.

## ڕوانگەی نەتەوەیی

ئێمە لە بەشی نەتەوەو ئێتنیک بە کورتی جیاوازییەکانی نێوان نەتەوەو ئێتنیک-مان خستەڕوو. ئەگەر من پێناسەی نەتەوە لە "ڕێکخستنێکی هاوهامەنگی فرەکەلتوور" دەست پێبکەم ئەوا ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت دەڤۆکێک بسەپێنن بەسەر تێکڕای ئەم کۆمەڵەیەی کە پێی دەگوترێت کورد یان ئەو کەسانەی کە باسی جووت، سێ، چوار یان پێنج ستاندارد دەکەن هزری نەتەوایەتییان دەخرێتە ژێر پرسیارەوە.

کردنی دەڤۆکێک بە زمانی یەکگرتوو بۆ چەند دیالێکتێک کە پێکهاتەی یەک زمان پێکدەهێنن کارێکی باشەو دروستە ئەگەر زەمینەی کردەنی هەبێت. بانگەشەکردن بۆ کردنی کرمانجی خواروو، دەڤۆکی سلێمانی، بە زمانی فەرمی یان یەکگرتووی کورد داوایەکە کە زەمینەی کردەنی نییە. شێوەزاری سلێمانی توانیویەتی تاکو ڕادەیەکی باش بە دەورووبەری خۆی تاکو سنوورەکانی کەرکوک، هەولێر و خانەقین بڵاوبێتەوە بەڵام سنووری دەستکردی نێوان هەردوو بەشی کوردستانی لکێنراو بە عێراق و ئێران نەبڕیووە. لە دەمێکدا زۆرینەی قسەکەرانی هەردوو لای سنوورەکە سەر بە کرمانجی خواروون. تەنانەت زمانی بەکارهێنراوی ڕێکخراوەکانی ڕامیاری بەرهەڵستکاری کوردی ئێران کە لە هەرێمی کوردستان دەژین جودایە لە دەڤۆکی سلێمانی. لە لایەکی تر ئەم دەڤۆکی سلێمانییە لەبەر دەرگای دەڤۆکی بادینی کە لقێکە لە دیالێکتی کرمانجی ژوورو هاتۆتە ڕاوەستاندن. ئەمەش دیاردەیەکی سروشتییە.

جووت زمانی یان جووت ستاندارد کە لە لایەن هەندێک نڤیسەرێن کرمانجی/بادینی بانگەشەی بۆ دەکرێت دیاردەیەکی مەترسیدارە چونکە بۆچوونێکی لە ئەم جۆرە ڕێگەخۆشکەرە بۆ سێ، چوار و پێنج ستانداردی. لە ڕاستیدا هەندێک

نفیسەرێن زازا، هەورامی و لورِ بە ئاشکرا بانگەشە بۆ کردنی ئەم دیالێکتانە بە زمـان دەکەن، ئینجا مرۆڤ نازانێت مەبەستیان کـام شـێوەزاری ئـەم دیالێکتانـەیـە! گرنـگ ئەوەیە کە کوردی نەبن. هەمان رەخنە دەچەسـپێت بـەسـەر نڤیـسەرێن بـادینی کـە داخوازی جووت ستاندارد دەکەن. گەلۆ مەبەستی ئـەوان کـام دەڤۆکـە لـە کرمـانجی ژوورووی؟ بادینی یان یەکێکی ترا بێجگە لە ئەمە قسەکەرێن هـەر دەڤۆکێـک دەکرێـت بە شێوازی جودا بپەیڤن، بەڵکو نڤیسکاران بە شپرزەیـی دەنڤیـسن و وەکـو یـەکدی نانڤیسن، بۆ نموونە ناڤی *دهۆک بە سێ جۆر دێتە نڤیسین دهۆک، دوهۆک و دهوک*. بە رێنووسی لاتینی DIHOK, DUHOK, DIHUK[31].

ئەز دەخوازم بێژم: بەپێی هەمان ئەو ئەرگومێنتانـەی کـە هـەنـدێک نڤیـسکارو رەوشنبیر زمـانی کـوردی بـۆ دوو، سـێ، چـوار و پێـنج سـتاندارد دابـەشـدەکـەن، دەکرێت سبەینێ هەمان نڤیسکارو رەوشەنبیر هەر یەک لـە ئـەم جـۆر سـتانداردانە بۆ چەند دەڤۆک یان شێوەزاری ستاندارد دابـەش بکـەن. هـەڵبـەت لـە روانگـەی زانستی زمان بەڵگە نییە بۆ سەلماندنی کارێکی لە ئەم چـەشنە، بـە تایبـەتـی لـە نێوان کرمانجی خواروو و ژوورووی. کام زمان لە ئەم جیهانە لـە چـەندین دیالێکـت، دەڤۆک و شێوەزار پێک نەهاتووە؟ بە پشبەستن بە کام ڤەکۆلینی زانـستی زمـانی جـووت سـتاندارد پـەسـەنـدە؟ ئایـا لێکۆڵینـەوە لـە روانگـەکـانی فۆنۆلـۆجی، ئیتمۆلـۆجی، وشـەسـازی، سـێمانتیک، سـینتاکس، سایکۆلینگویـستیک، سۆسیۆلینگویـستیک، زمـانی منـداڵان، دیـسکۆرس و دیـالێکتۆلۆجی کـراوە کـە پشتگیریی سەپاندنی شێوەزارێک بەسەر هەموو بکات یان جووت زمانی پـەسـەنـد بکات؟ وەڵامەکەی نەخێرە. هۆکارەکانی پاش بانگەشەی سـەپانـدنی شـێوەزارێـک بەسەر ئەم کۆمەڵەی کـە پێـی دەگوترێـت کـورد یـان جـووت و پێـنج سـتانداردی

---

[31] بروانە ئیسماعیل تاها شاهین (٢٠٠٨:١٧).

کەمیی زانیارییە سەبارەت بە زانستی زمان لە لایەن ئەو کەسانەی کە بانگەشەی لە ئەم جۆرە دەکەن.

کورد لە هەرێمی کوردستانی عێراق ژمارەیەک دەزگای زانستی لە بواری زمان هەیە، بۆ نمونە بەشەکانی زمانی کوردی لە زانکۆکان، ئەکادیمیای کوردی (کۆڕی زانیاری کورد)و سەنتەری کوردۆلۆجی. ئەم دەزگایانە جار جار هەڤدیتن و هەڤپەیڤین دەکەن بەڵام ناکۆکییەکان تاکو دێت پتر و پتر دەبێت. نموونە زۆرن وەکو: ڕێنووسی یەکگرتووی کوردی لە لایەن کۆڕی زانیاری کورد پەسەند کراوە بەڵام بە کردەوە لە لایەن نووسەران نایەتە پەیڕەوکردن[32]. لە ڕاستیدا زۆرێک لە نووسەران ئاگاداری ڕێنماییەکانی کۆڕی زانیاری کورد نین بەڵام داوای سەپاندنی شێوەزارێک و جووت زمانی دەکەن!

## ڕوانگەی فرە ئەرکی

ئێمە پێشتر تاکو ڕادەیەکی باش باسی زمانی بەکارهێنراومان لە کۆمەڵگا کرد، ئێمە گوتمان کە زمان پەیوەندییەکی دانەبڕاوی لەگەڵ ژیانی کۆمەلایەتی خەڵک هەیە. پەیوەندییەکە دوو لایەنە: هەر وەک چۆن کۆمەڵگاو ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە کۆمەڵگا ڕوودەدەن کاریگەرییان بەسەر گۆڕانکاریی زمان هەیە، بە هەمان شێوەش زمان و گۆڕانکارییەکانی زمان کاریگەری بەسەر گۆڕانکاری کۆمەڵگا هەیە. ئێمە گوتمان شێوەی دارشتن (بونیادی تێکست) و ناوەڕۆکی تێکست (بونیادی کەسایەتیی تێکست) و ئەو پەیوەندییەی کە لە نێوان نووسەران و خوێنەران (بونیادی نێوکەسایەتی تێکست) هەیە، بەندن لەگەڵ یەکتر و کاریگەرییان بەسەر یەکتر هەیە. بۆ نمونە چۆنیەتی خستنەڕووی یان دارشتنی بیرۆکەکانی نێنەرێک کار

32 بۆ نمونە: ڕێنماییەکانی کۆڕی زانیاری کورد بۆ نووسین (بەدران ئەحمەد حەبیب ٢٠٠٤).

دەکاتە سەرئەوەی کە چۆن تێکست، وەکو مامڵەیەکی جڤاکی، لە لایەن وەرگر بێتە تێگەیشتن. هەروەها ئێمە باسی ڕۆڵی کۆنتێکست-مان کرد کە هەر سێ بونیادەکەی تێکست دەکەفنە نێوی. ئێمە گوتمان کە کۆنتێکست بە هەموو ئەو ڕەوشە زمانەوانی و کەلتورییە دەگوترێت کە تێکستێکی لێبەرهەم دێت یان کاریگەری لەسەر دادەنێت.

ئەز لە ئێرە ئاماژە بە پەیوەندی تێکست لەگەڵ ئەکتەرەکانی کۆمەڵگا Social agents، یان زمانبەکارهێنەران، دەدەم. هەروەها پەیوەندی تێکست و زمان بەکارهێنەران لەگەڵ ڕووداوەکانی کۆمەڵایەتی Social events، کردەوەکانی کۆمەڵایەتی Social practices و بونیادی کۆمەڵایەتی Social structures دەدەم.

ئەکتەرەکانی کۆمەڵگا، واتە زمانبەکارهێنەران، "ئازاد" نین چونکە ئەوان بەرهەمهێنراوی کۆمەڵگان، بەڵام هەرچۆنێک بێت کردەوەکانیان بە تەواوەتی لە لایەن کۆمەڵگاوە کۆنترۆڵ نەکراوە. زمانبەکارهێنەران "توانای کاریگەری"ی خۆیان هەیە کە بەند نییە بە توانای کاریگەری بونیادو کردەوەکانی کۆمەڵایەتی/جڤاکی (دواتر بڕوانە پەیوەندییەکانی نێوان زمانبەکارهێنەران و بونیاد). زمان بەکارهێنەران تێکست دادەڕێژن، ئەوان پەیوەندییەکانی نێوان یەکەکانی تێکست دادەمەزرێنن. ڕاستە نووسین و وەرگێڕانی هەر چەشنە تێکستێک، نووسین بێت یان قسە، ڕێساو مەرجی تایبەت بە خۆی هەیە بەڵام لە ئێرەش نووسەر یان وەرگێڕ ئازادییەکی زۆری هەیە لە دارشتنی تێکست. بۆ نمونە نووسەر ئازادییەکی زۆری هەیە لە دانانی پەیوەندی سێمانتیکی نێوان یەکەکانی تێکستەکە، هەڵبژاردنی وشە، دارشتنی ڕێزمانی و بەکارهێنانی خاڵبەندی.

بونیادی کۆمەڵایەتی هەموو یەکەیەکی کۆمەڵگا دەگرێتەوە. مرۆڤ دەتوانێت بونیادی کۆمەڵایەتی وەکو (هەروەکو بونیادی ئابوری، بونیادی ڕامیاری، چینەکانی کۆمەڵ، سیستەمی ڕێڤەبەری و دامەزراوەیی یان زمان) ڕیزێک لە

ئەگەری فـەراهـەمکـراو و بـەتوانـا سـەیربکـات. پـەیوەندییـەکـانی نێـوان بونیـادی کۆمـەڵایـەتـی و ئـەوەی کـە بـە ڕاسـتی لـە کۆمـەڵگـا ڕوودەدات، ڕووداوەکـانی کۆمەڵایەتی، ئـاڵۆزە. ڕووداوەکـانی کۆمـەڵگـا دەرئـەنجامی ڕاسـتەوخـۆ و سـادەی کاریگەرییەکانی بونیادی کۆمەڵایەتی نین. پەیوەندیی نێوان بونیـادی کۆمـەڵایـەتـی و ڕووداوەکانی کۆمەڵایەتی بە هۆی کردەوەکانی کۆمەڵایەتـی گرێـدراوە. وانـەگـوتن لە خوێندنگاو زانکۆکان دەکرێت وەکو کردەوەی کۆمەڵایەتی بێتە ئەژماردن.

کردەوەی کۆمەڵایەتـی دەکـرێ وەکـو پیـادەکردنـی جـۆرەهـا شـێوازی یـەکـەی کۆمەڵایەتی بێت کە پێکڤە لەگەڵ یەکتر لە ڕوانگەی چوارچێـوەیـەکـی دیـاریکراوی ژیانی کۆمەڵایەتـی گرێـدراون. چۆنیـەتـی وانـەگـوتن لـە خوێنـدنگاکان و خوێنـدنی گوتاری هەینی لە مزگەفتەکان وەکو کردەوەی کۆمەڵایەتی دێتە خەمڵانـدن. زمـان یەکەیەکـی سـەرەکییـە لـە گـشت ئاسـتەکـانی کۆمـەڵایـەتیـدا (هـەڵبـەتـە ڕێگـای ناسینەوەو پەیوەندیکردنی تریش بێجگە لە زمان هەیە وەکو وێنـە). کـردەوەکـانی کۆمەڵایەتی دەکرێت وەکو پیادەکردنی ئەم یەکانەی خوارەوە بێت:

**کردەوەو هەڤکردەوە** Action and interaction

**پەیوەندییەکانی کۆمەڵایەتی** Social relations

**کەسەکان (لەگەڵ بروا، بۆچوون، شارەزایی، ئاستی خوێنـدن و خوێنـدەواری هتد.)** Persons (with beliefs, attitudes, histories etc.)

**دنیای مادی** The material world

**زمانی بەکارهێنراو یان دیسکۆرس** Discourse

بۆ نمونە وانەگوتن لە پۆلەکانی قوتابخانە شێوازێکی دیاریکراو لە بـەکارهێنـانی زمان پەیڕەو دەکات بەپێی پەیوەندیی کۆمەڵایەتی پۆل، بونیادو شـێوەی فیزیکـی پۆل، کەرەستەی ماددیی فەراهەمکراو لەپۆل، پەیوەندییەکانی مامۆستایان لـەگـەڵ

یەکترو قوتابیان، ڕێنمایی و داواکارییەکانی وەزارەتی خوێندن بۆ قوتابخانەکان، پەیوەندیی قوتابخانە لەگەڵ قوتابخانەو دامودەزگاکانی تری فەرمی و نافەرمی هتد. پەیوەندی نێوان گشت ئەم یەکانەی کردەوەی کۆمەڵایەتی فرەلایەن و چوونیەکە dialectical relationship.

لە ڕوانگەی ئامانجی ئەم کتێبە، دەکرێ بڕوا، بۆچوون و شارەزایی مامۆستایانی زمانی کوردی لە قوتابخانەو خوێندنگا، کەرەستەکانی خوێندن، هەروەها ڕێنمایی و داواکاری وەزارەتی پەروەردەوە وەکو کردەوەیەک لە کردەوەکانی هەمەلایەنەی کۆمەڵایەتی بێتە خەملاندن کە واتای دوبارە بەرهەمهێنانەوەی کۆمەڵگا (پێناسنامەی کۆمەڵایەتی، پەیوەندی کۆمەڵایەتی و سیستەمی زانیاری و بڕوا) و گواستنەوەی کۆمەڵگا ببەخشێت. هەرچۆنێک بێت کردەوەکانی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگای کوردەواریدا کۆمەڵگا دوبارە بەرهەم دەهێننەوە تاکو بیهێننە گواستنەوە. ئێمە گوتمان کە زمان لە گشت ئاستەکانی کۆمەڵایەتیدا کاردەکات: لە کردەوەکانی کۆمەڵایەتی، ڕووداوەکانی کۆمەڵایەتی، بونیادی کۆمەڵایەتی و بیرو بۆچوونی ئەکتەرەکانی کۆمەڵگا.

ئەگەر زمانی بەکارهێنراو لە قوتابخانە، زانکۆ، ڕێڤەبەرییەکان، وەزارەت، مێدیا و دامودەزگاێن فەرمی و نافەرمی تر لە چوارچێوەی سنووردارکراوی دەڤۆکێک یان دیالێکتێک بێتە قەتیسکردن ئەوا هێندەی کۆمەڵگا دووبارە بەرهەم دێت (پێناسنامەی کۆمەڵایەتی، پەیوەندی کۆمەڵایەتی و سیستەمی زانیاری و بڕوا) هێندە ڕووداوی کۆمەڵایەتی نوێ بەرهەم نایەت. بە واتایەکی تر، ئەم کردەوە کۆمەڵایەتییە دووبارەبووانە بە ئاستەم دەبن بە هۆی گواستنەوەی کۆمەڵگا Transforming society. لە ڕاستیدا ئەم سیستەمە گشتگیرییەی کە لە کوردستان برەوی هەیە لە ئاست پێویستییەکانی سەردەم و داخوازییەکانی ئێستاو ئایندەی کورد، وەکو نەتەوە، نییە.

## ڕوانگەی هەڤتێکەڵی Interference perspective

دانیشتوانی کوردستان بەهۆی زنجیرەیەک هۆکار؛ وەکو ڕێڤەبەری، ڕامیاری، ئابووری، ئاوەدانی، هونەری، نەتەوەیی، میدیا، پەناهەندەیی لەگەڵ یەکتر تێکەڵبوون و بەردەوام تێکەڵ دەبن. ئەم هەڤتێکەڵییە دەبێت بە هۆکاری هەڤتێکەڵیی زمانیش. ئێمە لە بەشی یەکەم و چوارەم تاکو ڕادەیەکی باش باسی سۆسیۆلینگویستیک و دیسکۆرس-مان کرد. ئەز لە ئێرە باس لە ئەو گۆڕانکاریانە دەکەم کە لە زمان ڕوودەدات و کە لە ئەنجامی ئەم هۆکارانەوە پەیدا دەبن.

هەڤتێکەڵی لە گشت بوارەکانی زمان ڕوودەدات: فۆنۆلۆجی، وشە، مۆرفۆلۆجی، سینتاکس و سیمانتیک. هەڵبەت ئاستی هەڤتێکەڵی بەپێی بوارەکان جودا دەبێت. مرۆڤێک کە توانای بەسەر دوو یان سێ دیالێکت هەبێت دەتوانێت قسەکانی لە هەڤپەیڤینێک یان ئاخافتنێک لە دیالێکتێک بۆ یەکێکی تر بگۆڕێت. ئەم دیاردەیە پێی دەگوترێت کۆدگۆڕین changing code لە ئەم دۆخەدا هەموو ڕوانگەکانی زمان دێتە گۆڕین. بۆ ئەو کەسەی کە توانای بەسەر دوو دیالێکت دەشکێت ئەوا ئاسییانە کۆدگۆڕین لە دەمی هەڤپەیڤین ڕوودەدات. ئەمەش بە چەند قۆناغێک دەبێت:

(١) مرۆڤێکی جووتزمان/جووت دیالێکت وشەیەک لە دیالێکتی یەکەم بۆ دووهەم دەهێنێت کە بێژانی دەنگی نزیکی نۆڕمی دیالێکتی یەکەمە.

(٢) ئەگەر جووتدیالێکتەکە پێویستی بە دووبارەکردنەوەی وشەکە بوو، یان کەسی بەرامبەر دەستیکرد بە بەکارهێنانی وشەکە ئەوا وشەکە لە دیالێکتی دووهەم جێگەی خۆی دەکاتەوە، یان دەبێت بە جێگری وشەیەک لە ئەم دیالێکتە.

(٣) لە ئەگەری بەکارهێنانی وشەکە لە لایەن ئەو مرۆڤانەی کە تەنها یەک دیالێکت دەپەیڤن ئەوا گۆڕانکاری زۆر بەسەر وشەکە دێت کە شوێنی خۆی لە

دیالێکتی دووهەم کردۆتەوە. هەڵبەت ئەم وشە نوێیە دەکەفێتە نێو سیستەمی ڕێزمانی دیالێکتی دووهەمیش. ئێمە لە پاش ئەم پێشەکییە کورتە هێدی هێدی شیکردنەوەی زیاتر پێشکەش دەکەین:

### هەڤتێکەڵی دەنگ voice Interference

لە زمانی قسەکردن جۆرەها ئاڵوگۆڕ بەسەر دەنگەکانی پێکهاتەی وشەکانی گوتراو هاتووەو دێت. ئێمە پێشتر باسی ئەم ئاڵوگۆڕانەمان کردو هۆکارەکانی ئەم ئالوگۆڕانەشمان ڕوون دەکردەوە. وەک لە خشتەی وشەکان دیارە ناتوانرێ وشەکانی دیالێکتیکت لە دیالێکتێکی تر جودا بکرێنەوە. وشەکان بەپێی نزیکایەتی و هاوسێیەتی دەڤۆک و شێوەزارە جوداکانی دیالێکتەکان هەڤتێکەڵن و خەسڵەتی کۆنتوێنیۆمی-یان هەیە. وەک لە خشتەکە دیارە جیاوازییەکانی دەنگی هەندێک وشە لە نێوان شێوەزار، دەڤۆک و دیالیکتەکان لە ئالوگۆڕپێکردنی تەنها دەنگێک دێت وەکو <u>مزگەفت</u> بۆ <u>مزگەوت</u>، <u>ئاخافتن</u> بۆ <u>ئاخاوتن</u>، <u>زاڤا</u> بۆ <u>زاوا</u>. بە ئەم ئاڵوگۆڕکردنە دەگوترێت ئالوگۆڕپێکردنی یاساکانی دەنگی Transmission of rules.

هەندێک ئاڵوگۆڕی تر سەبارەت بە پترکردنی یان لابردنی دەنگێکە بۆ نمونە <u>ڕمیا</u> بۆ <u>ڕما</u>، <u>نیاسین</u> بۆ <u>ناسین</u>. ئاڵوگۆڕی تر سەبارەت بە گۆڕینی دەنگێکی بزوێنە بە بزوێنێکی تر وەکو <u>بەهار</u> بۆ <u>بوهار</u>، <u>مەرام</u> بۆ <u>مەرەم</u>. ئاڵوگۆڕی تر سەبارەت بە لابردنی دەنگە وەک <u>تشت</u> بۆ <u>شت</u>، <u>کردن</u> بۆ <u>کرن</u>، <u>کەفت/کەوت</u> بۆ <u>کەت</u>. هەندێک ئاڵوگۆڕی تر سەبارەت بە هەڵگەڕاندنەوەیە وەک <u>بەرف</u> بۆ <u>بەفر</u>، <u>زیخ</u> بۆ <u>خیز</u>.

## هەڤتێکەڵی ڕێزمان Grammer Interference

هەڤتێکەڵی ڕێزمان لە ئەو دەمانە پەیدا دەبێت کاتێک هەندێک توخم لە زمانی/دیالێکتی یەکەم دەکەفێتە نێو زمانی/دیالێکتی دووهەم و دواتر هێدی هێدی لە ڕێزمانەکە تێکەڵ دەبێت. یان کاتێک کەسێک کە بە دیالێکتی یەکەم دەپەیڤێت بەڵام هەندێک توخم لە دیالێکتی دووهەم تێکەڵ بە یەکەم دەکات. هەڵبەت هەڤتێکەڵییەکە ڕێژەیین و دەکەفێتە سەر نزیکی و دووری دیالێکتەکان. هەنووکە لەگەڵ چەند نمونەیەک:دوکانەکان بازاڕ لە هەندێک دەڤەری گەرمیان و لوڕستان بەڵام دوکانەکانی بازاڕ لە سلێمانی (ئالۆگۆڕی مۆرفۆلۆجی). بەراوردی دوکانێن بازێڕ بکە لە دەڤەری بادینان.

گرفتەکە چارەسەر دەکرێت لە کرمانجی خواروو بەڵام گرفتەکە دێتە چارەسەرکردن. لە کرمانجی ژووروو یا گرفت دێت چارەسەرکرن.

## هەڤتێکەڵی وشە Lexical Interference

بەکارهێنانی وشەکانی دیالێکتێک لەلایەن زمانبەکارهێنەرانی دیالێکتەکانی تری هەمان زمان بە دیاردەیەکی ئاسایی دێتە ژماردن. وەرگرتنی وشەیەکی نوێ لە لایەن دیالێکتێکەوە نەک هەر دەبێت بە هۆی دەوڵەمەندبوونی گەنجینەی وشەی ئەو دیالێکتە، بەڵکو ئەم وشە نوێیە کاریگەری لەسەر ئەو وشانە دادەنێت کە دەچنە نێو چوارچێوەی سێمانتیکی وشەکە، بۆ نمونە ئاخافتن و هەڤپەیڤین کە لە کرمانجی ژووروو بۆ کرمانجی خواروو هاتووە. کاریگەری لەسەر وشەی گفتوگۆ داناوە. زۆر وشەی قەرزکراو یان وەرگیراو کە لە دیالێکتێکی نوێ دێتە بەکارهێنان بەر گۆڕانکاری فۆنۆلۆجی و مۆرفۆلۆجی/ڕێزمانی دەکەفێت. بۆ نموونە وشەی ئاخافتن دەبێت بە ئاخاوتن.

هەندێکجار وشەێن بەکارهێنراوی نێو دیالێکتەکان دەچنە نێو هەمان چوارچێوەی سێمانتیکەوە، بەڵام مەرج نییە هاوواتا بن. بفەرموون لەگەڵ سێ نموونە:

ماوە، دەم و کات: بڕوانە ئەم ڕستانە:

ماوەی کۆرسەکە سێ هەفتەیە.

ماوەی نێوان دوو بەرواری/کاتی دەستنیشانکراو؛ واتە لە ڕۆژی دەستپێکردن تاکو ڕۆژی کۆتایی.

ماوەی نێوان براوەی یەکەم و دووهەم دوو خولەک بوو.

کاتی جیاواز لە ماوەکە بە چرکە دەستنیشانکراوە.

لە دوو ڕستەکەی سەرەوەدا مرۆڤ دەتوانێت دەستنیشانی ماوەکە بە ڕۆژ، کاتژمێرو چرکە بکات.

دەمی بەیانی، نیوەڕۆ، ئێوارە، شەو هتد. لە ئێرە مرۆڤ ناتوانێت دەستنیشانی ساتی دەستپێکردنی یان کۆتایی هاتنی بۆ نموونە دەمی بەیانی بکات.

بۆ نمونە گۆران دەڵێت:

دەمی بەیانە ڕووناکە ئاسۆ ئاسۆی هیوای کورد مژدە بێت لە تۆ.

کات دێتە دەستنیشانکردن؛ واتە ساتی ڕوودان یان کردن دیاری دەکرێ؛ بۆ نمونە کاتژمێر دوانزدەی نیوەڕۆ.

گوێگرتن، گوهداریکردن، بیستن و ژنەفتن:

وشەکانی گوێگرتن و گوهدارکردن لەگەڵ یەکتر هاوواتان. هەروەها وشەکانی بیستن و ژنەفتن لەگەڵ یەکتر هاوواتان. ئەم چوار وشە لەگەڵ یەکتر هاوواتا نین.

مرۆڤ بە مەبەستەوە، بە ئاگاداریی‌و بایەخەوە قسەی مرۆڤێکی تر گوهداری دەکات. لە بەرامبەردا دەکرێ مرۆڤ دەنگی بۆ نمونە ئاژەڵ، مەکینە، گۆرانی یان هەڤپەیڤینی دوو مرۆڤی بێگانە ببیستێت یان بژنەفێت بەڵام بەبێئەوەی مەبەستی بووبێت یان جێگای بایەخی بووبێت. لە ئەم ڕوانگە دەستەواژەی "گوهدارێن ئازیز یان گوێگرانی ئازیز" دروستترە تاکو "بیسەرانی ئازیز" چونکە بێژەری، بۆ نموونە، بەرنامەیەکی ڕادیۆیی ئاراستەی قسەکانی زیاتر بۆ ئەو کەسانەیە کە بە ئاگادارییەوە گوێبیستی بەرنامەکە دەبن.

ڕوانین، تەماشاکردن، سەیرکردن و بینین:

لە مانگەشەوێکی هاوین ئەگەر مرۆڤ تەماشای یان سەیری یان بڕوانێتە ئاسمان ئەوا سەدەها ئەستێرە دەبینێت. واتە مرۆڤ پێشدەم پلانی بۆ یان بیری لە کرداری ڕوانین، تەماشاکردن و سەیرکردن کردووە بەڵام لەگەڵ ئەم کردارانە، کە هاوواتای یەکترن، ئەوا ئەو مرۆڤە ئۆتۆماتیکییانە یان بێ ویستی خۆی تشتی تریش دەبینێت.

وشەکانی ڕوانین، تەماشاکردن و سەیرکردن هاواتای یەکترن بەڵام مۆرفۆلۆجییانە و بەپێی پەیوەستەبوونیان association لەگەڵ واتای وشەی تر جیاوازن. بڕوانە ئەم سی ڕستە:

بێژەری بەرنامەیەکی تەلەفیزیۆنی دەتوانێت بڵێت: "تەماشاڤانێن ئازیز" بەڵام ناتوانێت وشەی "ڕوانین" مۆرفۆلۆجییانە لە کۆنتێکستێکی لە ئەم جۆرە بێنێتە بەکارهێنان. هەروەها وشەی "سەیرکەران" ناهێتە بەکارهێنان چونکە مۆرفێمی "کەر-ان" لەگەڵ ئاژەڵی "گوێدرێژ" دێتە پەیوەستەکردن. وشەی "بینەر" یان هەندێکجار کە "بینەرانی ئازیز یان بینەرێن ئازیز" دەبیستین تەواو دروست نییە

چونکە مەرج نییە مرۆڤ تەماشای تەلەفیزیۆن بکات لە ئەو دەمەی کە تەلەفیزیۆنەکەش دەبینێت.

هەڵبەت گەلێک نمونەی تریش هەن بەڵام مەبەستی من ئەوەیە کە دەتوانرێت لەسەر بنەمای سێمانتیکی ئەو وشانەی کە واتاکانیان زۆر نزیکە لە یەکتر جودا بکرێنەوەو لە کۆنتێکستی جیاواز بەکاربهێنرێن.

## ڕوانگەی سێمانتیک

ئێمە لە بەشی سێمانتیک گوتمان کە وشەی ناوەڕۆکی چەندین پەیوەندی واتایی لەگەڵ یەکتر هەیە. یەک جۆر لە ئەم پەیوەندییانە هاوواتاییە: کاتێک واتای دوو یان پتر وشە وەکو یەک بن یان لە یەکتر نزیک بن. هەڵبەت لە گەلێک لە زمانەکانی جیهان، بۆ نموونە فەرهەنگی "وشەی ئینگلیزی، فەرەنسی و سویدی هتد." هەیە. لە زمانی کوردی کاری لە ئەم جۆرە کراوە بەڵام هەمووی کۆششی تاکەکەسییە، واتە لیژنەیەک لە ئەکادیمیای کوردی، سەنتەری کوردۆلۆجی یان بەشی کوردی یەکێک لە زانکۆکانی کوردستان بە ئەرکێکی لە ئەم جۆرە هەڵنەستاوە. کاری تاکەکەسی، بێجگە لە ئەوەی کە مایەی هیلاکی زۆر دەگەیەنێت، ئەوا سودی ئابوری و چڵۆنایەتیشی کەمتر دەبێت. هەبوونی فەرهەنگێکی "وشەی کوردی" کەرەستەیەکی زمانەوانییە کە بۆ هەموو خوێندەواران و نووسەران سودی دەبێت. بۆ نمونە نووسەران نەک هەر شارەزایی پتر دەربارەی وشە بەکارهێنراوەکانی دیالێکتەکانی تر پەیدا دەکەن بەڵکو نووسینەکانیان ئاراستەی ژمارەیەکی زیاتری خوێنەران دەکەن بە پانتایی جوگرافیی بەرفراوانتر. ئەمەش پەیوەندییەکی فرە لایەنەی هەیە چونکە خوێنەرانیش بە وشەی نوێ و شێوازی نووسینی نووسەرانی تر ئاشنا دەبن.

کارێکی لە ئەم جۆرە کاریگەریی لەسەر ڕێزمـانیش دادەنێت چونکـە ئیتـر ڕێزمـان ئەو ڕێزمانە نابێت کە هەبووە، بـەڵکو ئـەو ڕێزمانـە دەبێت کـە پێویـست دەکـات دروست بکرێت بۆ تێکرای دیالێکتەکان. بۆ نمونە وەکو واتای ئەم وشانە:

هەمیشە: هەردەم، هەرکات، هەرسات، هەرگاڤ

گرفت: ئاریشە، تەنگوچەڵەمە، کێشە

وەکو گوتمان هاوواتـایی تـەنها بـەند نییـە بـە وشـەی تـاک تاکەوە، بـەڵکو دەستەواژە کە پتر لە یەک وشە پێکهاتووە دەگرێتەوە. بۆ نمونە وەکو واتـای ئـەم دەستەواژانە:

بە ئەم شێوەیە، بە ئەم جۆرە، بە ڤی ئاڤایی.

## ڕوانگەی وشەی ڕێزمانی و ناوەڕۆکی

ئێمـە پێـشتر گوتمـان کـە وشـە دابـەش دەکرێت بـەسـەر دوو جـۆر: وشـەی ڕێزمانی و وشەی ناوەڕۆکی. بڕوانە وێنەی خوارەوە:

| وشەی ناوەڕۆکی | وشەی ڕێزمانی |
|---|---|
| ناو | ئامرازی یەکگرتن |
| کردار | ئامرازی گەیەنەر |
| ئاوەڵناو | ئامرازی پەیوەندی |
| ئاوەڵکردار | ئامرازی سەرسوڕمان |
| جێناو | |
| ژمارە | |

وێنەی ٣٠. بە پۆلکردنی وشە.

لە هەموو زمانێک وشەی ناوەڕۆکی زۆرن بەڵام وشەکانی ڕێزمانی سنووردارە. نزیکەی یەک لە چواری ژمارەی وشەکانی هەر ڕستەیەک بریتییە لە وشەی ڕێزمانی[٣٣]. بە گوتنێکی تر، ئەگەر ئەکادیمیی کوردی (کۆڕی زانیاری کورد) یان لیژنەیەکی تر کە لە لایەن پەرلەمانی کوردستان مۆڵەت پێدراو بێت و بتوانێت ئەم وشانە لە زمانی نووسیندا دەستنیشان بکات. بە ئەم جۆرە ئێمە یەک لە چواری زمانی نووسین، واتە یەک لە چواری زمانی فەرمی/ستاندارد مسۆگەر دەکەین. ئەمەش کارێکی کردە نییە، دەکرێ بێتە ئەنجامدان. هەروەها هەندێک وشەی ناوەڕۆکی تر هەیە، وەک کردارەکانی یاریدەدەرو هەندێک ئاوەڵفرمانی ڕستە ناهێنە گەردانکردن، واتە ناهێنە لکاندن لەگەڵ وشەی ترو پاشگر یان پێشگری پێوە نایەتە لکاندن. واتە ئەم وشانە وەک وشەی ڕێزمانی ناهێنە گۆڕین لە ڕستەدا. ئەم وشانەش گەلێکجار دێنە بەکارهێنان لە دروستکردنی ڕستە لە هەردوو زمانی نووسین و قسەکردن. من دەمەوێت بێژم ئێمە چانسی پترکردنی ¼ دەتوانین بڵند بکەین. ئەمە تەنها کاری ڤەکۆڵین، ڕێکخستن، ئامادەکردن و بڕیاردان دەخوازێت لە لایەن زماننا‌سان بە پێی مەرج و یاسای زمانەوانی وەکو یاساکانی فۆنەتیک، ئیتمۆلۆگی وشەو هی تر کە ئێمە پێشتر ئامازەمان پێدا. بە شێوەیەکی تیۆریی پڕانی ئاریشەکانی ئاستی دەنگ/پیت و وشە (ئەو پیت/دەنگ و وشانەی کە زۆر دووبارە دەبن لە بەکارهێناندا) دەکرێت بێتە چارەسەرکردن. دیسان ئەگەر ئێمە لە ڕوانگەی سێمانتیک بڕوانینە وشەکان دەکرێت زۆر گرفت بێتە چارەسەرکردن. ئێمە لە بەشی تاقیکردنەوە زیاتر لەسەر ئەم بابەتە قسەدەکەین.

---

[33] سایکۆلۆژیی زمان لە نووسینی لارس مێلین (٢٠١٠:٥١). و. غازی عەلی خورشید.

# بەشی شەشەم

## تاقیکردنەوە

### یەکەم: کەرەستەی تاقیکردنەوە

کەرەستەی تاقیکردنەوە لە دوو بەش پێکدێت:

١. بەشی یەکەم لە هەندێک وشەی زۆر بەکارهاتوو پێکدێت کە بە شێوەی دیالێکتی کرمانجی ژوورو و خواروو، لوڕ، هەورامی و زازا لە هەمبەر یەک نووسراون. وشەکان بەگوێرەی وشەی ناوەڕۆکی و ڕێزمانی لە چەند خشتەیەک پێکدێت [٣٤]. پاشتر بە مەبەستی هەڵبژاردنی وشەی پەسەند بۆ زمانی فەرمی یان زمانی نووسین، بە تایبەتی وشەی هەردوو دیالێکتی ک.ژ. و ک.خ. لە ڕوانگەی فۆنۆلۆجی، سێمانتیک و دیالێکتۆلۆجی لەگەڵ یەکدی دێنە بەراوردکردن. خشتەکان پتر لە ٥٠٠ وشە پێکدێن (وشە لە خشتەی کردار زۆرن بەڵام کراوە بە ١٤ گروپ).

---

[34] هەروەکو لە بەشی یەکەم لە ژێر سەردێری *فەرمی، ئاخافتنی فەرمی و زمانی فەرمی* ئاماژەی پێ درا، ئەوا لە سەرەتای کارکردن یەک یان دوو دیالێکتێک دێتە هەڵبژاردن بۆئەوەی ببێت بە بنچینە بۆ زمانی فەرمی. من ک.ژ. و ک.خ. هەڵبژارد چونکە زۆرینەی ئاخێوەرانی کوردستان پێکدەهێنن و لە بواری فەرمی و نافەرمی زۆرتر دێتە بەکارهێنان بە بەراورد لەگەل دیالێکتی (زازاو هەورامی) و لور. هەلبەت کەرەستەی زمانەوانی ئەم دوو یان سێ دیالێکتەی پاشتر لە ڕوانگەی دیالێکتۆلۆجی دێنە بەکارهێنان و سوودلێوەرگرتن.

٢. له بەشی دووهەم هەندێک تێکست کە بە هەردوو دیالێکتی ک.ژ. و ک.خ. هاتۆتە نووسین لە هەمبەر یەک دێنە بەراوردکردن.

**کەرەستەی یەکەم: وشە**

ئێمە پێشتر گوتمان کە تاکو ئێستا کورد زمانێکی نووسینی یەکگرتووی نییە، ئەوەی کە دێتە نووسین کەمتازۆر ڕەنگدانەوەی قسەی بەکارهاتووی شێوەزار، دەڤۆک و دیالێکتە. وشەکانی ئەم تاقیکردنەوەیە بەپێی وشەی ناوەڕۆکی و ڕێزمانی دێتە دابەشکردن؛ ناو (گەردوون و کەش، ناوی ئاژەڵ، پەیوەندی خێزان، ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ، ناوی نابەرجەستە و خواردن)، ئاوەڵناو، جێناو (جێناوی کەسی، جێناوی نیشانە، جێناوی پرسیار و جێناوی دی)، ئاوەڵکردار، کردار، ئامرازی یەکگرتن، ئامرازی گەیەنەر، ئامرازی پێشبەند و ژمارە (وشەی ئامرازی سەرسوڕمان بە پێویست نەزانرا بێتە دووبارە نووسین چونکە پێشتر هاتۆتە نووسین). وشە لە خشتەی کردار و ئامرازی سەرسوڕمان تەنها لە ک.ژ. و ک.خ. هەن.

هەڵبەت بۆ هەر وشەیەکی ناوەڕۆکی لە ژێر خانەی هەر دیالێکتێک دەکرا بژارەی/وشەی زیاتر بنووسرێ، بەڵام لەبەر کەمیی جێگەو کاتو نەبوونی ژێدەری باوەڕپێکراوی ئاخێوەرانی دەڤۆکو شێوەزاری جودا جودای دیالێکتەکان ئەم کارە نەهاتە کردن. دیسان بۆ ئەم مەبەستە، لەبەر نەبوونی توانای دارایی، نەتوانرا سەردانی ناوچەو دەڤەری جوداجودای کوردستان بکرێ. ئەز سەبارەت بە دیالێکتی هەورامی و زازا دەخوازم دوو تشت بێژم:

یەکەم: چۆنیەتی بێژانکردنی هەندێک وشە بە ئەو شێوەیەی کە لە ئەم دوو دیالێکتە دەگوترێت ناتوانرێ بە تیپ بە دیمەن بکرێت و بخرێتە سەر کاغەز.

دووهەم: لە هەورامی بەپێی ڕەگەزی نێرو مێ وشە لە ئاستی ئاوەڵناو جیاواز دەگوترێت و دەنووسرێت. ئەم جیاوازییە دەچەسپێت بەسەر هەندێک وشە لە ئاستی ناو، ئاوەڵکردارو جێناو[٣٥].

---

[35] ژێدەری سەرەکی دیالێکتی هەورامی بۆ ئەم کتێبە مامۆستا عوسمان محەممەد هەورامییە. ژێدەری زۆرینەی/پڕانی وشە بۆ زازا کەنعان دۆغانە بەڵام هەروەها ماڵمیسانژ هاریکاری زۆری کردم. من لەبەر گەلێک هۆ، لە ئەوانە، مەبەستی ئەم کتێبە، کات و شوێن و هیدی، نەمتوانی گشت ئەو زانیارییەی کە ئەم سێ بەڕێزە ئاواتەخواز بوون بخرێتە سەر کاغەز، پێشکەش بە خوێنەرانی بکەم.

## یەک: ناو/ ناڤ

### ١- گەردوون و کەش (٥٠ وشە):

| کرمانجی ژووروو | کرمانجی خواروو | لوڕ | هەورامی | زازا |
|---|---|---|---|---|
| بوهار، بهار، بەهار | بەهار | وەهار | وەهار | وسار |
| هاڤین | هاوین، تاوسان | تاوسان | هامن | ئۆم ئۆم |
| پایز، پاهیز | پایز | پایز | پاییز | پایزۆ |
| زڤستان، زستان | زستان، زمسان | زمسان | زمستان | زڤستۆن |
| سار | سارد | سارد | سەرد | سەرد |
| گەرم | گەرم | گەرم | گەرم | گەرم |
| هونیک، فێنک، هێنک | فێنک | هونک | فێنک | ڤێنک |
| چیا، گرد | شاخ، چیا، کێو، گرد | شاخ، کیوە | کەش، کو، تەپ | کۆی، گیر |
| دۆڵ | دۆڵ | دۆڵ | دۆڵە | دۆڵ |
| دەشت | دەشت | دەشت | دەشتە | دەشت |
| بەڕی، بیابان، چۆل | بیابان | بیابان | بیابان | یابان |
| دارستان | دارستان | دارسان | دارەستان | دارستان |
| باخچە | باخچە | باخ | باخچە | باخچە |
| ئاڤ | ئاو | ئاو | ئاوی | ئاڤ، ئاوک |
| ئاگر | ئاگر، ئاور | ئاگر | ئێر، ئایر، ئاتر | ئادر |
| کانی | کانی | کانی | هانە | یەنی |
| چەم | چەم | چەم | دەرە | چەم، چونی |
| ڕووبار | ڕووبار | ڕووبار | چەمە | ڕووە |
| ڕۆژ | ڕۆژ | روژ | ڕو | ڕۆج |
| شەڤ | شەو | شەو | شەوە | شەڤ |
| سال | ساڵ | ساڵ | ساڵ | سەر |
| پار | پار | پارەکە | پار | پار |
| پێرار | پێرار | پیرارەکە | پێرار | پێرار |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| دەم | کات | تاق، تاو | کات | تاو، دەم |
| ڕۆژ، هەتاف | خۆر، ڕۆژ، هەتاو | خوەر | وەر، ڕوچیـــــار، وەرەتاو | ڕۆژێ، تیژێ |
| ستێر | ئەستێرە، هەسارە | هەسارە | هەسارە | ئەستارە |
| هەیڤ | مانگ | مانگ | مانگ | ئاشم |
| بەر، کەڤر | بەرد، گەور، کوچک | کوچک | کوچک، تەوەنی | کەڕە |
| خیچ، خیز | زیخ، چەو | زیخ | ڕیز | خێچ |
| قوم، تەقن | لم، قوم | قوم | لم، قوم | قوم |
| هەڕی | قوڕ، هەڕی | خەڕگ | هەڕە | چۆمڕ |
| گول، گولیک، چیچک | گوڵ | گوڵ | ولی | گول |
| دڕک، دردڕک، ستری | دڕک | دڕک | دڕەی | تەلە |
| گیا | گیا | گیا | گیولو | واش |
| چیمەن | چیمەن | چیمەن | هەرێز، چیمەن | چیمەن |
| با | با | با | وا | ڤا |
| باران | باران | واران | واران | ڤارۆن |
| پـــەلکـــەزێڕینـــە، کەسکوسۆر | پەلکەزێڕینە | زەڕینـــــەو | پلوورەوارانێ | کەسکوسورە، تیرێژا |
| | سەوز و سور | سیمینە | | هەوز و کەسکە |
| تەرزە، زیپک، تەیرۆک | تەرزە | تەرزە | تەوەرگە | تورزیلە، تورسەلە |
| بەفر، بەرف | بەفر | وەفر | وەروە | ڤۆر |
| گێژلوک | گێژەلووکە | گـەردەگوچا | گێژەلووکە | گژگۆلەکە، تالازکە |
| سبە، سپێدە | سبەی، بەیانی | بەیانی | سەبای، سەوای | سبە |
| ئیرو، ئەڤرو | ئەمڕۆ، ئیمڕۆ | ئەمڕو | ئارو | ئێر |
| نیڤرۆ | نیوەڕۆ، نیمەڕۆ | نیمەڕو | نیمەڕو | نیمڕۆچ |
| ئیڤار | ئێوارە | ئیوارە | وێرەگا | تەرە |
| دوە، دوهی | دوێنێ/دوێکە | دوێکە | هیزی | فیزیەر |
| پێر | پیرێ/پێرەکە | پێرەکە | پەری | پەرێ |
| بە (ر)ترا پێر | بەسرپێرێ | بەسرپێرەکە | پەرلوەری | ڤێرپەرێ |
| ..... | دەیە | ...... | دەیە | دەس سڕە |
| سەدسال | سەدە | ...... | سەدە | سەسەڕە |

## ٢-ناوی ئاژەڵ (٣٥ وشە):

| کرمانجیی ژووروو | کرمانجیی خواروو | لوڕ | هەورامی | زازا |
|---|---|---|---|---|
| سە | سەگ | سەگ | تووتە | کوتک |
| کتک، پشینگ، پشیک | پشیلە | پشی | کتە | پسنگ |
| مشک | مشک | مشک | ملە | مەرە |
| کێڤریشک، کەرووشک، کەرگوچک، کێروشک | کەروێشک، خەرگوش | خەرگووش | هەورێشە | ئارگوش |
| پەز | مەڕ | مەڕ | مەی | مێشنا |
| کاڤڕ، بەرخ | کاوڕ، بەرخ | کاوڕ | کاوڕ، وەرلە | کاڤڕ/بەران |
| بزن | بزن | بزن | بزە، بزڵە | بز |
| گیسک | گیسک | گیسک | گیسک | بزیا |
| مانگە، چێل، چێلەک | مانگا، چێڵ | مانگا | مانگاوە | مۆنگا |
| گۆلک | گوێرەکە/گۆلک | گوێرەکە | گورەگە | گوەلک |
| مریشک | مریشک، مامر | مامر | کەرگە | کەرگ |
| دیک، دێکل (ع) | کەڵەشێر، کەڵەباب | کەڵەشێر | کەڵەشێر | دیک |
| قاز | قاز | قاز | قازی | قاز |
| دەردەک، وەردەک، ئۆردەک، شینۆردەک | مراوی، سۆنە | مام مراوی | سونی | وەردەک |
| پنپنیک، بەلاتیتک، بەلاتینک، پەلپەلوسک | پەپولە | پەروانە | پەپوولە | پەلپەلکە، پنپنکە |
| باڵندە | باڵندە | مەلەوەر | باڵندە | ...... |
| چووک، چووچک | چۆلەکە، پاساری، کێشکە | مەلویچک | مریچڵی | مەلچک، میلچک، چوچک |
| رویڤی، رێوی | رێوی | رێوی | رەوا | لوە |
| گورگ، گور | گورگ | گورگ | وەرگ | ڤێرگ |
| حەفتیار | کەمتیار | کەمتیار | کەمتیار | کەفتیار |
| ماسی | ماسی | ماسی | ماساوە | ماسە |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| خەزال (ع) | ئاسک | ئاسک | ئاسک | ئاسک، خەزال |
| هرچ | ورچ | خرس | هەشە | هەش |
| بەراز، خەنزیر (ع) | بەراز | وەراز | بەراز | خوەز |
| پڵنگ | پڵنگ | پڵنگ | پاڵنگ | پڵنگ |
| بەق | بۆق، قورپاقە (ت) | قورپواق | قرواقێ | فنق |
| مێروو | مێـــروو، مێرووڵـــە، | مرۆچە | مرۆچە | مێرجەلە |
| مێش | مرۆچە | مەگەز | مەشی، مەگەز | مێس |
| زەرگەتە | مێش، مەگەز | زەمبـــــــوور، | زەردەواڵە | زەرقەت |
| هەنگ | زەرگەتە، زەردەواڵە | زەردەواڵە | هەنگ | هەنگ |
| داپیرۆک | هەنگ | هەنگ | کەژەتەنلی | میس ئنیمین |
| ژووژی | جاڵجاڵۆکە | عەنکەبووت | ژووژوو | دژە |
| شێر | ژیشک، ژووژوو | ژووژوو | شێر | شێر |
| | شێر | شێر | هەر | هەر |
| کەر | کەر | خەر | | |

### ٣- پەیوەندیی خێزان (٢٥ وشە):

| کرمانجی ژووروو | کرمانجی خواروو | لوڕی | هەورامی | زازا |
|---|---|---|---|---|
| باپیر | باپیره | بابا | بابا | پیرک |
| داپیر | داپیره، نەنک | دادا | ماما | پیرک |
| باب، باڤ | باوک، باب | باوگ | تاته | باوۆ |
| دایک | دایک، دایه | داڵگ | ئەدا | دایه |
| کوڕ | کوڕ | کوڕ | کور | لاج |
| کچ، کەچ، قیز | کچ، کەنیشک | کەنیشک، دوێت | کناچی | کێنا |
| مام، ئاپ | مام | مەمو | مامو | ئاپ |
| خال | خاڵ/لالۆ | خاڵو، لاله، لالۆ | لالو | خاڵ |
| مەت | پوور، پلک، میمک | میمگ | مەتیه | خاڵێ |
| مێر | پیاو، زەلام | پیاو | پیا، زەلام | جۆمێرد |
| ژن | ژن | ژن | ژەنێ | جنێهـ |
| برا | برا | برا | برا، براله | برا |
| خوشک | خوشک/خوەیشک | خوەیشک | واڵی | وای |
| بووک | بووک، وەوی | وەوی | وێوه | ڤیۆ |
| زاڤا | زاوا | زاوا | زەما | زۆما |
| ژنبرا | براژن | براژن | براژەنێ | براجنی |
| برازا | برازا | برازا | برازا | برارزا |
| خوارزا | خوشکەزا، خوارزا | خوەیشکەزا | وارەزا، واڵەزا | وارزا |
| ژنمام | ئامۆژن | مەموژن | مامۆژن | ناجک |
| هەوی | هەوه، هەوی | هەوه | هەوی | وێسنی |
| خەسوو | خەسوو | خەسویره | هەسروه | ڤیستۆری |
| خەزوور | خەزوور | خەسوو | هەسووره | ڤستۆری |
| نفش، زایه | نەوه، وەچه | وجاخ | نەوه، وەچه | ئاز، بەر، نەسل |
| باڤوکال | باووباپیران | باوک و باپیر | باووباپیرا | پیرک پیرک |
| بێژن | بێوەژن | بێوەژن | هیوەرژەنی | ڤیبایه |
| زارۆک | منداڵ | مناڵ | زارۆ | قژ |

## ٤-ئەندامی لەشی مرۆڤ (٤٠ وشە):

| کرمانجی ژووروو | کرمانجی خواروو | لوڕ | هەورامی | زازا |
|---|---|---|---|---|
| سەر، سەری | سەر | سەر، کەپوڵ | سەرە | سارە |
| پرچ، پۆر | پرچ/قژ | قژ، گیس | تیتی، قژ | گژگ |
| موو | موو/مووی | مووی | موو | مووی |
| بسک | زوڵف، بسک | زوڵف | زڵف (ئەگریجە) | زولف |
| ناڤچاڤ، ڕوو | ناوچەوان، ڕوو | تیۆڵ | ڕووە | ڕ ە |
| بری | برۆ | برۆ | برۆ | برۆ |
| چاڤ | چاو | چاو | چەم | چم |
| برژانـــــــــگ، مژوولانک | برژانگ | برژانگ | برژانگ | مێژگ |
| دفن، پۆز | لووت/کەپوو | لوویت، کەپوڵ | لووتە | پڕنگ |
| گوە، گوچک | گوێ/گوێچک | گووش | گوش | گوێش |
| ڕوومەت | ڕوومەت | گوپ | ڕوخسار | ڕومەت |
| لێڤ | لێو | لێو | لچ | لێو |
| لێڤ | لچ | لچ | لچ | لێو |
| ڕوندک، هێسر | فرمێسک، عەسر | عەسر | ئەسرین، هەڵسی | ڕۆینی |
| چەنە، ئەرزەنک | چەناکە | چناوکە | چەناگە، زنج | چەنە |
| ڕی، ڕها | ڕیش، ڕدێن | ڕێش | ڕیش | ئێردش |
| سمبێل | سمێڵ، سمبێڵ | سێوڵ | سمێڵی | زمبێل |
| ئەستو، ستو | مل | مل | مل | مل |
| گەوری، قرک | قوڕگ، گەروو | قوڕگ | گڵوی | قرک |
| مل، پی | شان | شان | شانە | نۆیش |
| باسک | باڵ، باسک، قۆڵ | باڵ | باڵ، قۆڵ | قۆڵ |
| ئەنیشک | ئانیشک/قوڕانیسک | قورانیسک | هەرەژنە | زەند، هەرچەنە |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| دەست | دەست | دەس | دەس | دەست |
| تلـــی، تبـــل، | پەنجە، ئەنگوست | کلک | پەنجە، ئەنگوسە | ئەنگیش |
| پەنچک | نینۆک، نوخان | نویخان | ناخوون | نەنگی |
| نەینۆک ناڤک | ناوک | ناوک | تەهە | ناک |
| دل | دڵ | دڵ | دڵ | زەر |
| سی، پشک | سی | سی | شوشی | سی |
| جـەرگ، جگـەر، کەزەب | جگەر/جەرگ | جەرگ | یەهەر | جگەر |
| زراڤ | زراو | زاڵی | زاڵە | زراو |
| ئـــــــوور، مەعیدە (ع) | گەدە | گەیە | گەدێ | مەعدە |
| ڕووڤی | ڕیخۆڵە | ڕیخۆڵە | ڕیخۆڵە، لێڵەخۆ | لواق لا |
| زک | سک، زگ | زگ | لەمە | پیزە |
| ڕان، ڕەهن | ڕان | ڕان | ڕان | ڕەهن، پالیسنە |
| ئەژنۆ، چۆک | ئەژنۆ، چۆک، زرانی | زرانی | زەنگۆڵ | زرانی، زۆن ە |
| پێ | پێ/پا | پا | پا | پای |
| مەژی | مێشک | مەغز | مەژگ | مێژ |
| پشت | پشت | پشت | پەشتی | پاشت |
| مـــست، کـــولم، گورمـــــست، گرمک، کولمست | مـــشت، مـــست، مشتەکۆڵە، کۆڵەمست | مـــــشت، مشتەکۆڵە | مشتە | گرمکـــــە، کولمکــــە، نونجکە |
| سنگ، سینگ | سنگ، سینە | سینک | سینە | سێنە |

## ٥- ناوی نابەرجەستە (٣٥):

| کرمانجی ژووروو | کرمانجی خواروو | لوڕ | هەورامی | زازا |
|---|---|---|---|---|
| بەروڤاژ | پێچەوانە | ...... | پێچەوانە، بەرواژوو | تەوش |
| تیپ | پیت | پیت | پیت | حەرفە |
| پەیڤ، وشە، بێژە، | وشە | وشە | واژە، وشە | چەکویە، کەلیمە |
| فراز، پەیڤ | گرێ | گرییە | لکە | ..... |
| ڕستە، هەڤۆک | ڕستە | ڕستە | ڕستە | جوملە |
| نیشانا هێدان/ سەرسوڕمان! | نیشانەی سەرسوڕمان! | نیشان سەرسوڕمان! | نیشانو سەرسڕمەندی! | نیشانێ ئینتەرژەکسیۆنێ |
| نیشانا پرسیار؟ | نیشانەی پرسیار؟ | نیشان پرسیار؟ | نیشانو پەرسای؟ | نیشانێ پەرسێ |
| خال (.) | خاڵ (.) | خاڵ | خاڵ (.) | نوقتا |
| ئالاڤ، داچەک | ئامراز | ..... | ئامراز | ادات |
| دەستەواژ | چەمک، دەستەواژە | ..... | چەمک، دەسەواژە | تەرم |
| قسە | قسە | قسە | قسێ | قسە |
| تۆرە | تۆرە | تۆرە | تۆرە، تۆبە | تۆبەتە، تۆبە، دۆرە |
| گفتوگۆ، ئاخافتن، گەنگەشە، هەڤپەیڤین | گفتوگۆ، ئاخاوتن | گفتوگۆ | گفتوگۆ | قسەیکەردش/ قالیکەردش |
| هەڤدیتن | چاوپێکەوتن | دیدار | چەمپەنەکۆتەی | پێدییەنە، |
| نڤیس، نڤیساندن | نووسین | نووسین | نویستەی، نووسین | پێڤینایەنە نوشتش |
| سەربەستی | سەربەستی | سەربەستی | سەربەستی | سەربەستی |
| هونەر | هونەر | هونەر | هونەر | هونەر |
| پێدڤی | پێویستی | احتیاجی | پیویستا | احتیاجی، لازمی |
| جڤین، هەڤدیتن، کۆمبوون | کۆبوونەوە | ..... | گلیرۆبییەی | پیسەرومیایش، کۆمبیایش |
| جڤاک | کۆمەڵ | کۆمەڵ | کۆمەڵ | جەماعت، کۆمەل |
| هەلبژارتن | هەڵبژاردن | هەڵبژاردن | هورروچتای | وەچینایش |

| سیاسەت، رامیاری | سیاسەت، رامیاری | سیاسەت | سیاسەت، رامیاری | سیاسەت |
|---|---|---|---|---|
| ڕێڤەبەری | بەڕێوبەرایەتی | ..... | ڕلوەبەردەی | ئیدارە |
| پێشنیاز | پێشنیاز، پێشنیار | پێشنیار | پیشتیار | پێشنیاز، تەکلیف |
| تەندروستی، ساخلەمی | تەندروستی | سحەت | تەندروستی | سحەت، وەشی |
| چارەسەر | چارەسەر | چارەسەر | چارەسەر | چارەسەر |
| ئەرێنی | ئەرێنی | ئەرێنی | ئەرێنی | موسبەت، پۆزیتیف |
| نەرێنی | نەرێنی | نەرێنی | نەرێنی | مەنفی، نەگاتیف |
| نهێنی | نهێنی | نهێنی | نهێنی | نەمتی، نمتە، نمتی |
| جوداکرن | هەلاوادرن، جوداکردن | جیاکردن | ویارای، جیاکەردەی | جیاکەردەش |
| تشت | شت، تشت، چت | تشت | چیو | چی |
| پێنگاڤ | هەنگاو، هەنگام | گام | هەنگام | گام |
| بەرەڤانی، بەرەڤدێری، بەرگری | بەرگری | ..... | وەرگرتەی | پاوتش |
| هەڵوێست | هەڵوێست | هەڵوێست | هەڵویست | تەور (تورکی) |
| ویژدان | ویژدان | ویژدان | ویژدان | ویژدان |
| ئابروو | ئابروو | ئابروو | ئاوەروو | حەیا |
| هشیار | هۆشیار | هوشیار، وشیار | هوشیار | هشیار |
| گونەه | گوناه | گوناح | گوناحە | گونێ |
| فێلباز | فێڵباز | هەقەباز، حیلەباز | فێڵباز | فێتبار |
| ئاریکاری، هەڤکاری | هاریکاری | هاریکاری، کومەک | هامکاری، گەلکاری | یارمەتی، هەمکاری |

٥- خۆراک ( وشه ٢٥):

| کرمانجی ژووروو | کرمانجی خواروو | لوڕ | هەورامی | زازا |
|---|---|---|---|---|
| سەوزە، سەبزە، زەرزەوات | سەوزە | سەوزە | سەوزە، سۆزە | زەبزێ |
| مێوە، فیکهە، فیقە | میوە | میوە | میوە | مەیوە |
| شڤیت | شویت | شویت | شویت | .... |
| پیڤاز | پیاز | پیاز | پیاز | پیۆنز |
| سیر | سیر | سیر | سیر | سیر |
| تڤر | توور، ترپ | ترپ | ترەوی | ترپ |
| باجانی سۆر | تەماتە | تەماتە | تەماتە | باجان سوور |
| بیبەر | بیبەر | فلفل، بیبەر | بیبەر | ئیسرەت |
| کاهو، خەس | کاهو، خەس | خەس، کاهو | کاهوو | خاس، مارول |
| کەلەم | کەلەرم، لەهانە | لەهانە | کەلەرم | کەلەم |
| کەرەوز | کەرەوز | کەرەوز | کەرەوز | کەرەویزە |
| گێزەر | گێزەر، گەزەر | گەزەر | گزەرگی | گزێر، بوونجکە |
| هەرمێ | هەرمێ | هەرمێ/عەرموت | مرو | مروە |
| سێڤ | سێف، سێو | سێف | ساوی | بای |
| نان | نان | نان | نان | نۆن |
| شیر | شیر | شیر | شوت | شت |
| هێک | هێلکە | خایە | هێڵە | هاک |
| نڤیشک | کەرە | کەرە | کەرێ | ڕۆن کەلە |
| پەنیر | پەنیر | پەنێر | پەنیرە | پەنیر |
| ئارد | ئارد | ئارد | ئاردێ | ئارد |
| خوێ | خوێ | خوا | مەکی، نمەک | سواڵ |
| برنج | برنج | برنج | برنج | ریز |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ساڤەر | ساوەر | ساوەر | پەتڵە | بەلخور |
| گندۆر | گندۆرە، کاڵەک | کاڵەک | کاڵەک | قاون |
| زەبەش، شفتی | شـووتی، شـفتی، شامی | شامی | شووتی | زەبەش |
| گەنم | گەنم | گەنم | گەنمە | گەنم |
| جێ | جۆ | جۆ | یەوە | جۆ |
| ماست | ماست | ماس | ماس | ماس |
| دۆ | دۆ | دۆ | دۆ | دۆ |
| هەژیر، هێجیر | هەنجیر | ئەنجیر | هەنجیر | ئینجیرە، هەژیرە |

## دوو: ئاوەڵناو (٤٥ وشە)

| کرمانجی ژووروو | کرمانجی خواروو | لوڕ | هەورامی | زازا |
|---|---|---|---|---|
| ڕەش | ڕەش | سیا | سیا، سیاو | سیا |
| سپی | سپی، چەرمی | چـــەرمـــی، چەرمگ | چەرمە | سپی |
| قاوەیی | قاوەیی | قاوەیی | قاوەیی | مهوە |
| سوور | سوور | سوور | سوور | سوور |
| زەر | زەرد | زەرد | زەرد | زەرد |
| کەسک | سەوز/کەسک | سەوز | سۆز | کەسک |
| شین | شین/کەو | کەو | کەوە | کەوە |
| مۆر | مۆر | مۆر | مور | موەر |
| گەور | بۆر | بوور | بۆر، بور | بۆر |
| تووژ | تفت | تفت | تفت | گوزین |
| سوێر، شۆر | سوێر/شۆر | شور | سۆڵ | شوەر |
| تاڵ، تەحل | تاڵ | تاڵ | تاڵ | تاڵ |
| شیرین، شرین | شیرین | شیرن | شیرین | شیرین |
| ترش | ترش/تورش | تورش | تش | ترش |
| مەزن | گەورە/مەزن | گەورە، گەپ | گۆرە | گرد |
| پچووک | بچووک/بیوچک | بیووچک | گولانە | گژ |
| بلند | بەرز | بەرز | بەرز | بەرز |
| نزم | نزم | نزم | نزم | نزم |
| پان | بەرین/پان | پان | بەرین، پان | هیرا |
| تەنگ | تەسک، تەنگ | تەنگ | تەسک، تەنگ | تەنگ |
| ستوور | ئەستوور | قەوی، قەیو | قادیم | قاڵند |
| زراڤ | باریک | باریک | باریک | بار ە |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| درێژ | درێژ | درێژ | درێژ | دەرک |
| کورت | کورت/کوڵ | کوڵ | کوڵ | کلم |
| پیر | پیر | پیر | پیر | پیر |
| گـەنـج، خـورت، جحێل جوان | گەنج، جحێڵ جوان | جایەڵ جوان | گەنج، هەرزەکار جوان | خـورت، جـوان، گەنج ڕند |
| کرێت | ناشیرین | ناشرین | ناشیرین، بیمەک | بەخوود، قەفچـل، پیس، بێرووچک |
| سادە | سادە | سادە | سادە | سادەو |
| ئالۆز | ئاڵۆز | ..... | ئاڵۆز | تێمیانکەوتە |
| دژوار، چەتن | دژوار، سەخت | سەخت | دژوار | زۆر، زەحمـــەت، چەتن |
| زرنگ | زرنگ | زرنگ | زرنگ، زیرەک | جیهاد |
| گەوج | گەوج، گێل | گێل | گێل | سیفیەک |
| ژیر | ژیر | عاقڵ | ژیر | بئاقل |
| جامێر | جوامێر | جوامیر | جوامێر | جۆمێرد |
| خوێری، سەرسەری | خـــوێڕی، سەرسەری | خوێڕی | خـــوێڕی، سەرسەری | نەکەس |
| ئـــازا، بـــستە، جەسوور | ئازا، جەسوور | ئازا | ئازا | جەسوور |
| ترسنۆک، ترسۆنەک | ترسنۆک | ترسنۆک | تەرسەزاڵ | ترسنەک |
| لاواز | لاواز | لەڕ | لاواز | نەچار |
| قەلەو | قەڵەو | قەڵەو | چاخ | خورەت |
| کەچەل | کەچەڵ | کەچەڵ | کەچەڵ | کەچەل |
| نەخۆش، نەساخ | نەخۆش، ناساخ | نەخوەش | نەوەش | نیوەش |
| پاک | پاک | پاک | پاک | پاک |
| پیس | پیس | پیس | پیس | پیس |
| هشک | وشک | وشک | وشک | وشک |

## سێ: جێناو

### ١. جێناوی کەسی

### جێناوی کەسی لە کرمانجیی خواروو

| ژمارە | کەس | جێناوی کەسی .personal pron | جێناوی خۆیی .reflexive pron |
|---|---|---|---|
| تاک | یەکەم | ئەز، من، ئەمن | خۆم، خوەم |
| | دووهەم | تۆ، توو، ئەتۆ، ئەتوو | خۆت، خوەت |
| | سێهەم | ئەو | خۆ، خۆی، خوەی |
| کۆ | یەکەم | ئێمە، ئەمە، مە | خۆمان، خوەمان |
| | دووهەم | ئێوە، ئەنگۆ | خۆتان، خوەتان |
| | سێهەم | ئەوان، وان | خۆیان، خوەیان |

### جێناوی کەسی لە کرمانجیی ژووروو

| ژمارە | کەس | جێناوی کەسی | | جێناوی خۆیی |
|---|---|---|---|---|
| | | دۆخی کارا Nominative case | دۆخی بەرکار Accusative case | |
| تاک | یەکەم | ئەز | من | خۆ |
| | دووهەم | تو، تۆ، ئەتو، توو | تە | خو |
| | سێهەم | ئەو | ئـەوی/وی (نێـر)، ئـەوێ/وێ (مێ) | خو |
| کۆ | یەکەم | ئەم | مە | خو |
| | دووهەم | هـوین، هنـگ، هـین، هوون، هونک | وە، هەوە، هونگە | خو |
| | سێهەم | ئەو، ئەوان، وە | ئەوان، وان | خو |

## جێناوی کەسی لە لوڕی

| ژمارە | کەس | personal pron. جێناوی کەسی | reflexive pron. جێناوی خۆیی |
|---|---|---|---|
| تاک | یەکەم | من | خوەم |
| | دووهەم | توو | خوەت |
| | سێهەم | ئەو | خوەی |
| کۆ | یەکەم | ئیمە | خوەمان |
| | دووهەم | ئیوە | خوەتان |
| | سێهەم | ئەوان | خوەیان |

## جێناوی کەسی لە زازا

| ژمارە | کەس | جێناوی کەسی | | جێناوی خۆیی |
|---|---|---|---|---|
| | | دۆخی کارا Nominative case | دۆخی بەرکار Accusative case | |
| تاک | یەکەم | ئەز | مە | خور |
| | دووهەم | تو | تە | خور |
| | سێهەم | (نێر) ئو/ئا (مێ) | (نێر) یی/ئای (می) | خور |
| کۆ | یەکەم | ما | مە | خور |
| | دووهەم | شما | شما | خور |
| | سێهەم | ئی | ئی | خور |

## جێناوی کەسی لە هەورامی

| ژمارە | کەس | جێناوی کەسی personal pron. | جێناوی خۆیی reflexive pron. |
| --- | --- | --- | --- |
| تاک | یەکەم | من | ویم |
| | دووهەم | تو | ویت |
| | سێیەم | (نێر) ئاذ/ئانە (مێ) | ویش |
| کۆ | یەکەم | ئێمە | ویما |
| | دووهەم | شمە | ویتا |
| | سێیەم | ئاذی | ویشا |

## ٢. جێناوی نیشانە

### جێناوی نیشانە لە کرمانجیی خواروو

| ژ | پانتایی | تاک | کۆ |
| --- | --- | --- | --- |
| ١ | نزیک | ئەم، ئەمە | ئەمان، ئەمانە |
| ٢ | دوور | ئەو، ئەوە | ئەوان، ئەوانە |

### جێناوی نیشانە لە کرمانجیی ژووروو

| ژ | پانتایی | تاک | کۆ |
| --- | --- | --- | --- |
| ١ | نزیک | ئەڤ، ئەڤە | ئەڤان، ئەڤانە |
| ٢ | دوور | ئەو، ئەوە | ئەوان، ئەوانە |

## جێناوی نیشانە لە لوڕ

| ژ | پانتایی | تاک | کۆ |
| --- | --- | --- | --- |
| ١ | نزیک | ئەی، ئەیە | ئەیان، ئەیانە |
| ٢ | دوور | ئەو، ئەوە | ئەوان، ئەوانە |

## جێناوی نیشانە لە زازا

| ژ | پانتایی | تاک | کۆ |
| --- | --- | --- | --- |
| ١ | نزیک | ئن | ئنۆن |
| ٢ | دوور | ئنۆ | ئاینۆ |

## جێناوی نیشانە لە هەورامی

| ژ | پانتایی | تاک | کۆ |
| --- | --- | --- | --- |
| ١ | نزیک | ئیذ، ئینە (نێر)/ئیذە، ئین (مێ) | ئیذێ، ئینێ |
| ٢ | دوور | ئاذ، ئانە (نێر)/ئاذە، ئانێ (مێ) | ئاذێ، ئانێ (هەورامی) |

## ٣. جێناوی پرسیار (١٠ وشە)

| کرمانجیی ژووروو | کرمانجیی خواروو | لور | هەورامی | زازا |
|---|---|---|---|---|
| (ئایا) | (ئایا) | ..... | ئایا | ..... |
| کی، کێ | کێ | کی | کی | کۆم |
| کیژ، کیژکە | کام، کامە (کامیان) | کام، کامە، | کام، کامە، | کۆم یۆ |
| (کیژان) | | کامیان | کامەشا | چ |
| چ، چما | چی، چما | چە | چی | سێنین |
| کو، چەوا، چلۆن، | چۆن، چلۆن، کوو | چووین | چەنی | |
| چ توف، چەوان | | | | |
| چەند | چەند، | چەنی | چند | چەندک |
| | | | | چا |
| کیرێ، کیدەرێ، | کوێ، کوێندەرێ، | کو/کوورە | کو، گوگە | کۆم جا |
| کوێدەرێ، | کێندەر | | | |
| کانێ، کا | کوا، کانێ، کوانێ | کوا، کواس | کوون | |
| کەنگێ | کەنگێ، کەینێ، | کەی | کەی | کێ |
| | کەی | | | |
| بۆ، بۆچی، چما | بۆچی، بۆ | ئەڕا | پەی چیشی، | چرا |
| | | | چی | |

## ٤. جێناوی تر (١١ وشە)

| کرمانجی ژووروو | کرمانجی خواروو | لوڕ | هەورامی | زازا |
|---|---|---|---|---|
| هەموو، هەمی | هەموو | گشتی | گرد | هەمە |
| گشت، تەڤ | گشت | گشت | گرد | پێرۆ، هەمە، تێدە، تێڤتەر، |
| هەردوو | هەردوو | هەردگی | هەردوی | تۆپ |
| کەس، کەسان | کەس، کەسان | کەس | کەس | هەردە |
| فلان، بیڤار (فلان و بیڤار) | فلان، فیسار (فلان و فیسار) | فلان و فیسان | فلان، فیسار (فلان و فیسار) | کەس فلان |
| یەکەک/کەسەک | یەکێک/کەسێک | یەکیگ/کەسیگ | یو/کەسیو | یەوێک/کەسێک |
| پرانی | زۆربە | زوریەی/کوت فرەی | فرەتەرین | زافانە، ڤێشانە، بۆلکی |
| هیچ، هیچ کەس/تشت | هیچ، هیچ کەس/شت، تشت | هویچ/ تشت | هیچ، هیچ، کەس/چیو | چ/تو، چکەس/تو کەس، چییەک |
| هەڤرا | یەکتر | یەکتر | یەکتر | پیا |
| پێکڤە | پێکەوە | وە یەکۆ | پیوەرە | پییا |

## چوار: ئاوەڵکردار (٣٥ وشە)

| کرمانجی ژووروو | کرمانجی خواروو | لوڕ | هەورامی | زازا |
|---|---|---|---|---|
| ڤێرێ، ڤێرە، ڤێ دەرێ، ڤر، ڤرە، هر، هرە | ئێرە | ئەیرە | ئێگە | ئیتیا |
| ورا، وێرێ،ور، وێرە، وێ دەرێ | ئەوێ | ئەورە | ئاگە | ئوجا |
| هەردەم، هەرگاڤ تووجار | هەمیشە، هەرسات | هەمیشە | هەمیشە، هەرسات | هەرتەم |
| | هەرگیز | هەرگیز | هەرگیز | چرێ |
| هەروەها | هەروەها | هەروەها | هەرپاسە | زی |
| بەلکی، بەلکو | ڕەنگە، لەوانەیە، بەڵکو، بەشکم | ڕەنگە، بەشکم، بەلکی | ڕەنگا، بەڵکو، بەشکم | بەلکی |
| ب تەنێ | بەتەنها | وە تەنیا | بەتەنیا | ب تێنا |
| ب خوەشی | بەخوشی | وە خوەشی | بە وەشی | ب دڵشادی |
| گەلەک کێم، پچەکی | بەئاستەم | وە زەحمەت | بەئاستەم | ب حەمت |
| ژ نشکەکێڤ، ژ نشکاڤ | لەناکاو | لە ناکاو | جەناکام، ناکامەنە | جاد |
| پڕ کەم، کێم جاران | دەگمەن | دەگمەن | دەگمەن | ڕێ ڕێ |
| نزیکی | نزیکی، نزیکەی | نزیکەی | نزیکو، نزیکەو | نزدی |
| بێگومان | بێگومان | بێگومان | بێگومان | بێگومان |
| دوودلی | دوودڵی | دوودڵی | دوودڵی | تاکەت ناکەتی |
| خراپی | خراپی | خراوی | خراپی | خراپ |
| ساناهی | ئاسانی | ئاسانی | ئاسانی | ئاسان |

| ئاوارتە | ئاوارتە | ئیستیسنا | ئاوارتە | ئیستیسنا، موستەسنا |
|---|---|---|---|---|
| هەلبەت | هەڵبەت | هەڵبەت | هەڵبەت | ئەڵبەت |
| نۆرمال | ئاسایی | ئاسایی | ئاسایی | عەدەتی، نۆرمال |
| گشتی، تەڤاهی | گشتی | گشتی | گشتی | پێرۆیی، هەمەیی، عوموومی |
| تایبەتی | تایبەتی | تایبەتی | تایبەتی | تایبەتی، ئاریزی، کەسی |
| ...... | تەنانەت | تەنانەت | تەنانەت | زی |
| ئەگەر نا | ئەگەرنا، ئەگینا | مەگەر نا | ئەگەر نا، ئەگینا | نێکە |
| بێهوودە | بێهوودە | بێهوودە | بێهوودە | بێهوودە |
| هەرچەند | هەرچەند | هەرچەن | هەرچەند | هەرچەند |
| ئانکو | کەواتە | کەواتە | کەپاسەبو | هوتۆ |
| ژ بەرکو، چنکی | لەبەر ئەوە، چونکە | چوینکە | وەروئانەیە، چونکە | چمکی |
| بەرەبەرە | بەرەبەرە | بەرەبەرە | وەرەوەرە | ڤەراڤەرا، بەرە بەرە |
| هێدی هێدی | هێدی هێدی، وردە وردە، تۆزە تۆزە | وردە وردە | نەرم نەرم، وردە وردە، تۆزەتۆزە | هێدی هێدی |
| زوو زوو، زوو ب زوو | زوو بەزوو | زووی وە زووی | زوو بەزوو | لەز |
| یەک ب یەک | یەک بەیەک | یەک وە یەک | یەک بە یەک | یۆ بە یۆ |
| شەڤ ب شەڤ | شەو بەشەو | شەو وە شەو | شەو بە شەو | شەو بە شەو |
| جار جار | جار جار | جار و جار/بار | جار جار | ڕێ ڕێ |
| جووت ب جووت | چووت بە چووت | جفتاو جفت | جووت جووت | مت مت |
| ڕێز ب ڕێز | ڕیز بەڕیز | ڕیز وە ڕیز | ڕیز بە ڕیز | ڕێز ڕێز |

## پێنج: کردار (١٤ پۆل وشە)

من کردار بە گوێرەی هەندێک پێشگر و کرداری ئاسایی تر ڕێکدەخەم کە بۆ بەراوردکردنی نێوان ئەم دوو دیالێکتە باشە. پرانی وشەکان لە کتێبی قەناتی کۆردۆ (١٩٩٠) و سادق بهاء الدین ئامێدی (١٩٨٧) هاتۆتە وەرگرتن. لە ئەم بەشە وشەی بەرامبەر لە لوڕ، هەورامی و زازا نایەتە نڤیسین.

| ژ | کرمانجی ژوورو | کرمانجی خواروو |
|---|---|---|
| ١ | پێشگری هل/هەڵ | پێشگری هل/هەڵ |
| | هلدان | هەڵدان |
| | هلچوون | هەڵچوون |
| | هلکرن | هەڵکردن |
| | هلهاتن | هەڵهاتن |
| | هلبڕین | هەڵبڕین |
| | هلکشین | هەڵکشان |
| ٢ | دا | دا |
| | داهات | داهات |
| | دامان | دامان |
| | داڕزین | داڕزین |
| | دانین | دانان |
| | داگرتن | داگرتن |
| ٣ | ڕا | ڕا |
| | ڕاگرتن | ڕاگرتن |
| | ڕاخستن | ڕاخستن |

| | | |
|---|---|---|
| | ڕامالین | ڕاماڵین |
| | ڕادان | ڕادان |
| | ڕاپەڕین | ڕاپەڕین |
| ٤ | **<u>پێ</u>** | **<u>پێ</u>** |
| | پێگوتن | پێگوتن، پێوتن |
| | پێدان | پێدان |
| | پێگرتن | پێگرتن |
| | پێکەنین | پێکەنین |
| | پێچۆن | پێچوون |
| ٥ | **<u>تێ</u>** | **<u>تێ</u>** |
| | تێکەفتن، تێکەتن | تێکەوتن، تێکەفتن |
| | تێگرتن | تێگرتن |
| | تێخستن | تێخستن |
| | تێگهیشتن | تێگەیشتن |
| ٦ | **<u>لێ</u>** | **<u>لێ</u>** |
| | لێدان | لێدان |
| | لێهاتن | لێهاتن |
| | لێڤەبوون | لێوەبوون |
| | لێکرن | لێکردن |
| ٧ | **<u>ژێ/لێ</u>** | **<u>ژێ/لێ</u>** |
| | ژێخارن | لێخواردن |
| | ژێچۆن | لێچوون |
| | ژێبرن | لێبردن |
| | ژێگرتن | لێگرتن |

| | | |
|---|---|---|
| | ژێپرسین | لێپرسین |
| ٨ | **دەر** | **دەر** |
| | دەرکەفتن، دەرکەتن | دەرکەوتن، دەرکەفتن |
| | دەرئانین | دەرهێنان |
| | دەرکرن | دەرکردن |
| | دەرچوون | دەرچوون |
| | دەرهاتن | دەرهاتن |
| ٩ | **ڤە/ەوە** | **ڤە/ەوە**[٣٦] |
| | ڤەکرن | کردنەوە |
| | ڤەرشتن | ڕشانەوە |
| | ڤەشارتن | شاردنەوە |
| | ڤەگرتن | گرتنەوە |
| | ڤەگوهورین | گۆڕینەوە |
| | ڤەنڤیسین | نووسینەوە |
| ١٠ | **پێش/پاش** | **پێش/پاش** |
| | پێشکەفتن، پێشکەتن | پێشکەوتن/کەفتن |
| | پێشخستن | پێشخستن |
| | پێشگوتن | پێشگوتن/وتن |
| | پاشکەفتن/کەتن | پاشکەوتن/کەفتن |

[36] هەڵبەت "ەوە" بێجگە واتای دووبارەبوونەوە ئەرکی تریش دەبینێت. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە ڕەئووفی ئەحمەد ئالانی (١٩٨١).
هەروەها لە ک.ژ. "ڤە" هەردەم لە پێش وشە نییە بۆ نموونە: هاتنەڤە، زڤریڤە، بوونەڤە و دێنەڤە. "ەوە" لە زمانی قسەکردن زۆر بەکاردێت بۆ نموونە لەماڵەوە بۆ بازاڕ، لە کەلارەوە بۆ کفری. بەڵام لە زمانی نووسین دەبێت بە ئەم جۆرە بێت؛ لە ماڵ بۆ بازاڕ، لە کەلار بۆ کفری.

| | | |
|---|---|---|
| | پاشخستن | پاشخستن |
| ١١ | **ئا/ها** | **ئا/ها** |
| | ئاڤیتن، هاڤیشتن | هاویشتن |
| | ئانین | هێنان |
| ١٢ | **یا/ا** | **یا/ا** |
| | ڕژیان | ڕژان، ڕژیان |
| | دڕیان | دڕان، دڕیان |
| | وەستیان | وەستان، وسیان |
| | کشیان | کشان، کشیان |
| ١٣ | **i/ـد** | **i/ـد** |
| | کرن | کردن |
| | مرن | مردن |
| | برن | بردن |
| ١٤ | **ڤـ-ف/و-ف** | **ڤـ-ف/و-ف** |
| | پاشکەفتن/کەتن | پاشکەوتن/کەفتن |
| | سەرکەفتن، سەرکەتن | سەرکەوتن، سەرکەفتن |

## شەش: ئامرازی یەکگرتن (٧ وشە)

| کرمانجی ژووروو | کرمانجی خواروو | لوڕ | هەورامی | زازا |
|---|---|---|---|---|
| و | و | و | و | و |
| هەم و هەم | هەم و هەم | هەم و هەم | هەم و هەم | هەمزی و هەمزی |
| نە و نە | نە و نە | نە و نە | نە و نە | نزیٚ و نزیٚ |
| دگەل، ل گەل | لەگەڵ | وەگەڵ، هاگەڵ | چەنی | پیٚ |
| لیٚ، بەس، بەلیٚ | بەڵام | بەڵان | بەڵام | لا |
| یان | یان | یا | یان | یان |
| یان-یان | یان-یان | یا- یا | یان-یان | یان — یان |

## حەفت: ئامرازی گەیەنەر (١٣ وشە)

| کرمانجی ژووروو | کرمانجی خواروو | لوڕ | هەورامی | زازا |
|---|---|---|---|---|
| کو، کۆ، کی | کە — | کە | کە | کە |
| کەنگیٚ، گاڤا | هەرکە، کەی، | کەی، هەرکەی | هەرکە، کەی، | کەی کە، گاما کە، |
| | کاتیٚ | هەتا، تا | کاتیو | دەمۆکە |
| هەتا | هەتاکو، هەتا، تا | | هەتاکو، هەتا، | حەتا، حەتانی |
| | | | تا | هەمە جا دە |
| ل هەر جیٚ | لە هەر شوێنێک | لە هەر | جەهەرکو | سەمەدۆ کە، قاندیٚ، |
| | | شوینیگ | وەروئانەیە | سەبا کە |
| ژ بەر ڤیٚ | لەبەرئەوەی | لەوەر ئەوە | چونکە | چونکە، چکە |
| چونکە، چمکی | چونکە | چوینکە | | |
| هەکە، ئەگەر، | ئەگەر، ئەگەرچی | ئەگەر | ئەگەر، | ئەکە، ئەگەر |
| گەر | | | ئەگەرچی | |
| هەرچەند | هەرچەندە | هەرچەنیگ | هەرچندە | هەرچقاس، چەند کە |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| مێند | هێندە/ئەوەندە | ئەمەنە | ئیندە، ئاندە | هەندە، ئەندە |
| | بەڕادەیەک | وە ڕادەیە | بەڕادیو | سەی، سەکە |
| وەکـی، وەکـو، مینا | وەکو | وەکو | پیسە، پیسەو | جۆکا، جورا، ڕیوالێ ڕا |
| لەما، لەوڕا، لەوما | بۆیە | بۆیە، ئەڕا | | |
| چقاس/ئەوقاس | ئەمەندە/ئەوەندە | ئەمەنە/ئەوەنە | | |

## هەشت: ئامرازی پێشبەند (٥ وشە)

| کرمانجی ژووروو | کرمانجی خواروو | | هەورامی | |
|---|---|---|---|---|
| ل، ژ، د | لە | لە | جە | دە، ڕا |
| ل پاش/ پێش/<br>جەم، رخ/ کن/<br>ژۆر/ ژێر/<br>ناڤین/ لای/ بن/<br>سەر/ دو/<br>تەڤ/ دۆر/ ناڤ | لە پاش/ پێش/<br>تەنیشت/ کن/<br>ژوور/ ژێر/<br>ناوەڕاست/ لای/<br>بن/ سەر/ دوای/<br>تەک/ دوور/ ناو | لە دویا/<br>بەردەم/ لا<br>بان/<br>ناوەراست/ بن/<br>بان/ دوا/<br>دوویر/ ناو | د ماو/ وەڵی/<br>پالو/ لا/<br>مەرۆ، چیر/<br>لیڕاسی/ لاو/ بن/<br>سەر/ ماو/ دوور/<br>دلی | ڤەر دە، پەی دە،<br>هەتەک/هەت، جۆر دە،<br>جێر دە، ئورتە دە، بن دە،<br>سەر ۆ، دما، دووری، میيان<br>دەڤەر را، پەی را، هەتەک/<br>هەت، جۆر را، جێر را،<br>ئۆرتەرا، بن را، سەر را، دا<br>را، دووری را، میيان را |
| بۆ | بۆ | وە | پەی | ب |
| ب—ب<br>ناڤ/لای | بە—بەناو/لای | وە– وە ناو/لای | بە– دلی/ لای | میان را، ڤەر را |

# نۆ: ژمارە Numerals

## یەکەم: ژمارەی بنجی

| کرمانجیی ژووروو | کرمانجیی سەروو | لوڕ | هەورامی | زازا |
|---|---|---|---|---|
| یەک، ئێک | یەک | یەک | یوە | یۆ |
| دوو | دوو | دوو | دوی | د |
| سێ | سێ | سێ | یەری | هیرێ |
| چار | چوار، چار | چوار | چوار | چار |
| پێنج | پێنج | پەنج | پەنج | پۆنج |
| شەش | شەش | شەش | شیش | شیش |
| حەفت، هەفت | حەوت، حەفت | حەفت | حۆت | هۆت |
| هەشت، حەیشت | هەشت | هەشت | هەشت | هەشت |
| نەه، نە | نۆ | نو | نو | نەو |
| دەه، دە | دە | دە | دە | دەس |
| یازدە (یانزدە) | یازدە (یانزە، یانزنە) | یانگزە | یانزە | یۆندەس |
| دازدە (دانزدە) | دوانزە (دوانزدە) | دوانگزە | دوانزە | دویەس |
| سێزدە (سێزدە) | سیانزە (سێزدە) | سیانگزە | سینزە | هیریەس |
| چاردە (چاردە) | چواردە، چاردە | چواردە | چواردە | چارەس |
| پازدە (پازدە) | پازدە (پانزدە) | پانگزە | پانزە | پۆنجەس |
| شازدە (شانزدە) | شازدە (شانزە) | شانگزە | شانزە` | شیزەش |
| هەڤدە (هەڤدە) | حەڤدە | حەڤدە | حۆتدە | هۆتیەس |
| هەژدە (هژدە) | هەژدە | هەژدە | هەژدە | هێشیەس |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| نازده (نۆزده) | نۆزده | نۆزده | نوزده | نەویەس |
| بیست | بیست | بیس | ویس | ڤیس |
| سی، سه | سی | سی | سی | هیرس |
| چل | چل | چل | چل | چۆلای |
| پێنجه، پێنجی | پەنجا | پەنجا | پەنجا | پۆنجاس |
| شێست | شەست، شێست | شەست | شەس | شەست |
| هەفتی | حەفتا | حەفتا | حەفتا | هۆتای |
| هەشتی | هەشتا | هەشتا | هەشتا | هەشتای |
| نوت، نود | نەوەد | نەوەد | نەوەد | نەوای |
| سەد | سەد | سەد | سەد | سێ |
| هزار | هەزار | هەزار | هەزار | هەنزار |

## دووهەم: ژمارەی پلەیی

| کرمانجی ژووروو ( ێ، ئا-ێ) | کرمانجی خواروو ( ەم، ەمین) | لوڕ | هەورامی | زازا |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| یەک- یەکی، ئێکی- ئایەکێ | یەک- یەکەم- یەکەمین | یەک- یەکەم- یەکەمین | یوە- یەکەم — یەکەمین | یۆ —ڤێرین- یوەن |
| دوو — دووێ — ئادوێ | دوو- دووهەم- دووهەمین | دوو- دووهەم- دووهەمین | دوی — دووهەم- دووهەمین | د — دووین |
| سێ — سێیێ — ئاسێیێ | سێ- سێهەم- سێهەمین | سێ- سێهەم- سێهەمین | یەرێ- یەرهەم — یەرهەمین | هیری — هیرین |
| چار- چارێ — ئاچارێ | چوار/چار- چوارهەم- چوارهەمین/چارهەمین | چوار- چوارهەم- چوارهەمین | چوار — چوارەم -چوارمین | چار — چارن |
| پێنج — پێنجێ — ئاپێنجێ | پێنج- پێنجەم- پێنجەمین | پەنج- پەنجەم- پەنجەمین | پەنج- پەنجەم- پەنجەمین | پۆنج — پۆنجن |
| دەه - دەهێ- ئادەهێ | دە- دەهەم- دەهەمین | دە- دەیەم- دەیەمین | دە- دەهەم- دەهەمین | دەس- دەسن |
| سەد- سەدێ- ئاسەدێ | سەد- سەدەم- سەدەمین | سەد- سەدەم- سەدەمین | سەد- سەدەم- سەدەمین | سێ — سێین |
| هزار — هزارێ- ئاهزارێ | هەزار- هەزارەم- هەزارهەمین | هەزار- هەزارەم- هەزارهەمین | هەزار-هەزارەم- هەزارەمین | هەنزارن |

سێهەم: ژمارەی کەرتی

| زازا | هەورامی | لوڕ | کرمانجی خواروو | کرمانجی ژووروو |
|---|---|---|---|---|
| هیرن ڕا یۆ | سێی ەک | سێ یەک | سێ یەک | سێ یەک |
| چارن ڕا یۆ | چوار یەک | چوار یەک | چوار یەک/چار یەک | چار یەک |
| پۆنجن ڕا یۆ | پەنج یەک | پەنج یەک | پێنج یەک | پێنج یەک |
| هەشتن ڕا یۆ | هەشت یەک | هەشت یەک | هەشت یەک | هەشت یەک |
| دەسن ڕا پۆنج | جە دەتە، پەنج | لە دە پێنج | لە دەیا پێنج | ژ دەهان پێنج |
| سێین ڕا دەس | جە سەدەتە، دە | لە سەد دە | لە سەدا دە | ژ سەدان دەھ |
| هەنزارن ڕا د | جە هەزارەتە، دوی | لە هەزار دوو | لە هەزارا دوو | ژ هزران دوو |

# دە . ئامرازی سەرسوڕمان

## ١. هەستی خۆشی و گاڵتەجاڕی:

دەک بەخێر بێن!

هاها ئەڤ پسمامێ منە!

هەی هەی نازەنین تۆراوە! خۆ دوێنێ بردیان بە بوکی!

تۆخەی کە چاوم پێت کەوت!

## ٢. هەستی سەرسوڕمان و ناڕازیی بوون:

وای لە شاسوار چەند نەزانە!

ئیو/عیو گدیانێ تو چەند ترسنۆکی!

هەک کوڕۆ تو ل ڤر چ دکی!

پەک/پەکو ئەڤە چ ئەژدیهایەکە!

دەک/ئەک نەمری بۆ خۆت و کردەوەت!

هەی بۆت بمرم!

هەیهۆ ئیتر نەبڕایەوە!

هەیها ڤێرە کیرێیە ئەز لێ دگەڕم!

پەح چەند پیاوێکی چەنەبازە!

## ٣. هەستی پەژارەیی و دڵتەنگی:

داد بێ داد لە چەرخی گەردوون.

ئای/ئۆی/ئاخ و داخ لە ئەم ئازارە.

حەیف و مخابن ئەو مرۆڤێ هندێ بەرکەفتی دنیا ڕۆهن لێ تاری بوو.

وای لە ئەم زوڵم و زۆرە.

ئۆف لە دەست جەوری زەمانە.

## ٤. بانگکردن:

هۆ هۆ!

کچێ! کچینە!

کوڕە! کوڕینە!

ئازاد!

فلان! فیسار! بیڤار!

## کەرەستەی دووهەم: تێکست

ئەم بەشە لە پێنج تێکست پێکدێت. سێ تێکست بە هەردوو دیالێکتی ک.ژ. و ک.خ. لە هەمبەر یەکدی نووسراون، دوو تێکستەکەی دی، کە چیرۆکی زارۆکانە، بە هەردوو دیالێکتی ک.ژ. و ک.خ. نووسراوە، بەپێی خوارەوە:

| کرمانجی ژووروو | کرمانجی خواروو |
| --- | --- |
| گورگ و هێستر[37] | گورگ و ئێستر |
| د بێژن جارەکێ گورگی گۆت: دێ تۆبە کەم، ئێدی ئەڤ دڕوندی و ئێشاندنا خەلکێ بەسە. بلا رێکا حەجێ بگرم و پاشی حەجێ ژی ل کوژیەکی بو خو ڕوینم، دەست ب پەرستنا (تاعەتێ) خودێ بکەم، هەتا کو ئەمانەتیێ خو ژ من وەردگرتیەڤە. | دەڵێن جارێک گورگ وتی: تۆبە دەکەم و ئیتر بەسە ئەم دڕندەیی و ئازار گەیاندنە بە خەڵک، با ڕێگەی حەج بگرمە بەر و پاش حەجەکە لە گۆشەیەک بۆ خۆم دانیشم خەریکی خودا پەرستی بم تا خودا ئەم ئەمانەتەم لێ وەردەگرێتەوە. |
| گورگی لێ دا هێدی هێدی ل سەرخۆ ب ڕێ کەڤت و چۆ. برسێ ڕۆژ ب ڕۆژێ بێهێز دکر هەتا کو وەسا لێ کری کولەفا بو، لاکە لاکا وی بو ژ برسا. ڕۆژەکێ ژ دویرڤە چاڤێ وی ب هێسترەکا ئازاکری کەڤت، گوت: "خودی د سختنی و تەنگاڤی یادا حەرام حەلال کریە ئەڤە ئەزێ دێ ژ برسادا مرم، بلا من تۆبە ژی کریت و بچمە حەجێ ژی، حەلالە بۆ من ئەز ڤێ هیسترێ بخوم، ژ بەرکو، هەکە نەخوم دێ مرم، دێ ژ هێز و ڤەژن ژێ کەڤم عبادەتێ خودێ ژی ب من ڤە | لێیدا وردە وردە بەڕێ کەوت و ڕۆیشت، برسێتی ڕۆژ بە ڕۆژ بێ هێز تری دەکرد، وای لی هات لاکەی دەهات لە برسانا. ڕۆژێک لە دوورەوە ئێستره گەڕێکی بەر چاو کەوت — کە بەڕەڵا کرابوو — وتی: خودا لە وەختی تەنگ و چەڵەمەدا حەرامی حەڵاڵ کردوە، من ئەوەتا لە برسانا دەمرم، باتۆبەشم کردبێت و بۆ حەجیش بچم، بۆم حەڵاڵە بچم ئەو ئێسترە بخۆم، چونکە ئەگەر نەیخۆم دەمرم و پەکی عبادەت و خوداناسیەکەم دەکەوێت. |

[37] لە کتێبی سادق بهاء الدين ئامێدی (١٩٨٧:٤٦٥).

ناهێت ئەز بکەم.

بەر هێستریّ ڤەچو د دێت خو هوسین و تام ب دەڤێ ئێخست. هێستریّ گۆتیّ: گورگۆ وەغەرا خێریّ بیت، تو و د ڤیّ دەشتیّ دا وەسا هێدی هێدی ل سەر خو دچی و بەر من ڤەتێی؟!

گۆتیّ: وەغەرا مە خێر بیت. من دڤێت بچمە حەجیّ، بەلیّ ئەزیّ کولەفامە ژ برسادا. ب شەرعی بۆ من حەلالە ئەز تە بخوم. ئەزیّ هاتیم تە بخوم و پاشی بچم.

هێستریّ گۆتیّ: وەی تو گەلەک ب خێر هاتی، خودیّ حەجا تە قەبویل کەت. ب ڕاستی ئەز ژی ژ ڤیّ ژینیّ تێرو وەرس بویمە و من دڤێت ژێ قورتال ببم. بەلیّ مامیّ گورگ، گورگیّ منۆ تو ب خو ژی دزانی گەلەک حەدیس و ئایەت ل سەر ڤیّ چەندیّ هەنە، ئەو ژی ئەڤەیە، هەکە گیاندارەک هاتە سەر ژێکرن (ڤەکوشتن) دڤێت ب ئاوایەکیّ (ڕەنگەکیّ) وەسا سەریّ وی بێتە برین — سەریّ وی بێتە ژێکرنّ کو زوی جانیّ وی (روحا) دەرکەڤیت. نهو بزانە ئەز د دەمیّ خو دا کو هاتیمە نالکرن، بزمارەک د دەمیّ نالکرنێدا بۆچی د گوشتیّ پیّ منرا ناچیت، گەلەک من د ئێشینیت، چو حەوی ژ بەر ناکەڤنە من. تو ژی دەست ب خارنا من بکەی دگەل ژان و ئێشا من، ئەڤە کارە بەروڤاژی ژ خودیّ ترسییە یا کو تە بەریّ خو دایێ. هەکە تو ب زەحمەت نەزانی ژ ڕێڤە وی بزمارا چۆیە د پیّ منرا بینییە دەر و پاشی ب دلیّ خو من بخوی دیّ خێرا بینی.

گورگی گۆتیّ: تو ڕاست دبێژی، کانیّ بزمارا د

چوو بەلای ئێسترەکەوە و مرخی خۆی لێ خۆش کرد. ئێستر پێی ووت: مام گورگ ئەوە ئۆغربێت وا لەم دەشتەدا وورده وورده دەڕۆیت و هاتویت بەلای منەوە؟!

ووتی: ئۆغرمان خیر بێت، دەمەوێت بچم بۆ حەج بەڵام زۆرم برسی بوو، بە شەرع بۆم حەڵاڵە تۆ بخۆم، هاتوم بتخۆم و پاشان بڕۆم!

ئێستر ووتی: یاخوا بەخێر بێیت خودا حەجت قەبووڵ بکات، بەڕاستی منیش لەم ژیانە وەڕز بووم و دەمەوێت ڕزگارم ببێت بەڵام مام گورگ، تۆ خۆت دەزانیت گەلێک حەدیس و ئایەت لە سەر ئەوە هەیە کە ئەگەر گیاندارێک سەر بڕرا دەبێت بە جۆرێک سەر ببڕیت کە زوو گیانی دەرچێت، ئێستە منیش وەختی خۆی کە ناڵکراوم بزمارێک لە وەختی ناڵەکەدا چووە بە گۆشتەکەمدا زۆر ئازارم دەدات، تۆ لەو بخۆیت و ئەمیش لەم لاوە ئازارم بدات، ئەمە پێچەوانەی ئەو خودا ناسییەیە کە تۆ گرتووتە بەرا ئەگەر بە زەحمەتی نازانیت لە پێشدا ئەو بزمارە دەربێنیت و پاشان بە شێنەیی بمخۆیت خێرت دەگات!

مام گورگ ووتی: ڕاست دەکەیت، کامەتە تا

## دووهەم: جێناڤ بۆ زمانی فەرمی ٣١ وشە[45]

### ١. جێناڤی کەسی بۆ زمانی فەرمی ٧ وشە

| ژمارە | کەس | جێناوی کەسی | جێناوی خۆیی |
|---|---|---|---|
| تاک | یەکەم | ئەز/من | خۆ |
| | دووهەم | تو | خۆ |
| | سێهەم | ئەو | خۆ |
| کۆ | یەکەم | ئێمە | خۆ |
| | دووهەم | ئێوە | خۆ |
| | سێهەم | ئەوان | خۆ |

### ٢. جێناڤی نیشانە بۆ زمانی فەرمی ٤ وشە

| ژ | پانتایی | تاک | کۆ |
|---|---|---|---|
| ١ | نزیک | ئەم | ئەمان |
| ٢ | دوور | ئەو | ئەوان |

### ٣. جێناڤی پرسیار بۆ زمانی فەرمی ٩ وشە (بێجگە لە ئایا)

| | | |
|---|---|---|
| کێ | کەنگێ | کام |
| چەند | بۆچی | چی |
| کانێ | چلۆن | کوێ |

[45] سەبارەت بە هەڵبژاردنی هەر یەک لە ئەم جێناڤ-انە، بڕوانە بەشی دەهەم/گەنگەشە لە ژێر سەردێری جێناڤ.

٤. جێناڤی دی بۆ زمانی فەرمی ١٠ وشە

| هەموو | هیچ کەس/تشت | پڕانی/زۆربە | هەردوو |
|---|---|---|---|
| گشت/تەڤ | فـــلان و فیسار/بیڤار | هەڤڕا/یەکتر | ———— |
| کەس/کەسان | یەکێک/کەسێک | پێکڤە | ———— |

## سێهەم: ئاوەلناڤ بۆ زمانی فەرمی ٤٥ وشە

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ڕەش | مەزن/گەورە | سادە | پیس | چەتین/دژوار |
| سپی | بچووک | زرنگ | وشک | جامێر |
| قاوەیی | نزم | گەوج | زەرد | ناشیرین/کرێت |
| سوور | پان/بەرین | ژیر | تاڵ | گەور/بۆر |
| سەوز | تەسک تەنگ | خوێڕی/سەرسەری | بلند/بەرز | تووژ/تفت |
| شین/کەو | درێژ | جەسوور/ئازا | قەلەو | ———— |
| مۆر | کورت | ترسنۆک | کەچەل | ———— |
| شۆڕ/سوێر | پیر | لاواز | ئالۆز | ———— |
| شیرین | جوان | نەخۆش/ناساخ | ئەستوور | ———— |
| ترش | گەنج/خورت | پاک | زراف | ———— |

## چوارهەم: ئاوەلکردار بۆ زمانی فەرمی٣٥ وشە

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| بێگومان | ئەگەر نا/ئەگینا | دوو دلی | بە تەنها | دەگمەن |
| هەروەها | بێهوودە | هەلبەت | هەردەم | تەنانەت |
| نزیکی | هەرچەندە | زوو زوو<br>زوو بە زوو | تووجار | ئاستەم |
| گشتی | بەرە بەرە | یەک بە یەک | ئاسایی | لە نشکاف/<br>ناکاو |
| تایبەتی | هێدی هێدی | شەڤ بە شەڤ | ئێرە[٤٦] | ساناهی/ئاسانی |
| خراپی | جار جار | جووت بە جووت | ئەوێ | ئانکو/کەواتە |
| ئاوارتە | بەلکو | ڕیز بە ڕیز | ئینجا | لەبەر هەندێک |

## پێنجەم: کردار بۆ زمانی فەرمی ١٣ کۆمەل/ ٥٩ وشە

| پێشگری هل/هەل | پێشگری لێ | پێشگری ڕا/ | 
|---|---|---|
| هەلدان | لێدان | ڕژان |
| هەلچوون | لێهاتن | دڕان |
| هەلکرن | لێڤەبوون | وەستان |
| هەلهاتن. | لێکردن | کشان |
| هەلبڕین | | |

[46] من وشەی "ئێرە"و "ئەوێ" بە پەسەند دەزانم بۆ زمانی فەرمی چونکە هەردوو وشەکە لە هەموو دیالێکتەکان، بێجگە ک.ژ. بە دەنگی /ئ/ دەستپێدەکات. دیسان هەر دوو وشەکە بۆ هەر دیالێکتێک بە جورەها شێوە دێتە گوتن بەلام لە ڕوانگەی فۆنۆلۆجی نزیک لە یەکدی دێنە بێژانکردن. بێجگە لە هۆکاری دیفتۆنگ هەر دوو وشەکە بە چەندین شێوە دێنە گوتن لە لە ک.ژ..

| | | |
|---|---|---|
| هەلکشین | | |
| **پێشگری دا**<br>داهات<br>دامان<br>داڕزین<br>دانین/دانان<br>داگرتن | **پێشگری ژێ/لێ**<br>لێخاردن<br>لێچوون<br>لێبردن<br>لێگرتن<br>لێپرسین | **دـ**<br>کردن<br>مردن<br>بردن |
| **پێشگری ڕا**<br>ڕاگرتن<br>ڕاخستن<br>ڕامالین<br>ڕادان<br>ڕاپەڕین | **پێشگری دەر**<br>دەرکەفتن<br>دەرهێنان<br>دەرکردن<br>دەرچوون<br>دەرهاتن | **پێشگر/پاشگری ڤە/ەوە**[٤٧]<br>ڤەکرن/کردنەوە<br>ڤەڕشتن/ڕشانەوە<br>ڤەشارتن/شاردنەوە<br>ڤەگرتن/گرتنەوە<br>ڤەگوهورین/گۆڕینەوە<br>ڤەنڤیسین/نووسینەوە |
| **پێشگری پێ**<br>پێکۆتن<br>پێدان<br>پێگرتن<br>پێکەنین<br>پێچۆن | **پێشگری پێش/پاش**<br>پێشکەفتن<br>پێشخستن<br>پێشکۆتن<br>پاشکەفتن<br>پاشخستن | |
| **پێشگری تێ** | **پێشگری ئا/ها** | |

[47] پێشگر و پاشگری ڤە/ەوە بابەتێکە کە ڤەکولینی تایبەت دەخوازێت. لە ئێرە هیچ کارێک دەربارەی ئەم بابەتە نایەتە کردن.

| | | |
|---|---|---|
| تێکەفتن | هاڤیشتن | |
| تێگرتن | هێنان | |
| تێخستن | | |
| تێگەیشتن | | |

## شەشەم: ژمارە بۆ زمانی فەرمی ٤٤ وشە

| ژمارەی بنجی | ژمارەی پلەیی (+ ەم، + ەمین) لە ک.خ.، لوڕ، هەورامی (بەراوردی زازا بکە) | ژمارەی کەرتی |
|---|---|---|
| یەک | یەکەم/ یەکەمین | سێ یەک |
| دوو | دووهەم/ دووهەمین | چار یەک |
| سێ | سێهەم/ سێهەمین | پێنج یەک |
| چار | چارهەم/چوارهەم | هەشت یەک |
| پێنج | پێنجەم/ پێنجەمین | لە دە پێنج |
| شەش | دەهەم/ دەهەمین | لە سەد دە |
| حەفت | سەدەم/ سەدەمین | لە هەزار دوو |
| هەشت | هەزارەم/ هەزارەمین | |
| نۆ | | |
| دە | | |
| یازدە | | |
| دوازدە | | |
| سێزدە | | |

| | | |
|---|---|---|
| چاردە<br>پازدە<br>شازدە<br>حەڤدە<br>هەژدە<br>نۆزدە<br>بیست<br>سی<br>چل<br>پەنجا<br>شێست<br>حەفتا<br>هەشتا<br>نەوەد<br>سەد<br>هەزار | | |

**حەفتەم: ئامرازی یەکگرتن بۆ زمانی فەرمی ۷ وشە**

| | | | |
|---|---|---|---|
| و | نە- و — نە | یان- یان | بەلام |
| هـــــەم — و- هەم | یان | لەگەل | —— |

**هەشتەم: ئامرازی گەیەنەر بۆ زمانی فەرمی ١٠ وشە**

| | | | |
|---|---|---|---|
| وەکو | ئەگەر | هێند | چقاس/ئەوقاس ئەمەندە/ئەوەندە |
| چونکە | هەرچەند | لەوما/لەورا/بۆیە | کەی |
| کەنگێ/کاتێ/گا ڤا | لەبەرئەوە | —— | —— |

**نۆهەم: ئامرازی پێشبەند بۆ زمانی فەرمی ٣ وشە**

| |
|---|
| لە |
| لە پاش/پێش/جەم/رخ/کن/ژۆر/ژێر/ |
| ناڤین/لای/بن/سەر/دو/تەڤ/دۆر/ناڤ |
| بۆ |
| بە—بە ناڤ/لای |

**دەهەم: ئامرازی سەرسوڕمان بۆ زمانی فەرمی**

| هەستی خۆشی و گاڵتەجاڕی | هەستی سەرسوڕمان و ناڕازیی بوون: | هەستی پەژارەیی و دڵتەنگی | بانگکردن |
|---|---|---|---|
| دەک | وای | داد و بێداد | هۆ هۆ! |
| ماما | ئیو/عیو | ئای/ئۆی | فلان! فیسارابیڤار! |
| هەی هەی | هەک/دەک | ئاخ و داخ | کورە! |
| ئۆخەی | پەک/پەکو | حەیف | کابرا! |
| | هەی/هەیهو/هەیها | ئۆف | کچێ! |
| | پەح | | |

### ٢. تێکست:

لە بەشی تێکست، من هەر پێنج تێکستەکە بە ئاراستەی زمانی فەرمی دووبارە دادەڕێژم. لە ئێرە من هەوڵ دەدەم کە جیاوازی فۆنۆلۆجی لە وشەی بەکارهاتووی نێوان هەردوو ک.ژ. و ک.خ. بە گوێرەی ئەو خاڵانەی سەرەوە نەهێڵم. دیسان من هەوڵ دەدەم کە زمانی قسە لە نووسین جودا بکەم؛ بۆ نموونە لکاندنی وشە بە یەکدی و نەگووتنی جێناف ئاسایییە لە قسە بەڵام بۆ نووسین بە پێچەوانە. هەروەها من هەوڵ دەدەم ژمارەی وشە بۆ هەر ڕستەیەک کێم بکەم. بە ئەم جۆرە من ئاستی ئاڵۆزی خوێندن کێم دەکەم. هەنووکە فەرموو لەگەڵ هەر پێنج تێکستەکە:

## ١

## گورگ و هێستر

دەبێژن جارێک گورگ گوتی: ئەز تۆبە دەکەم، ئیتر دڕندەیی و ئازار گەیاندن بە خەڵک بەسە! ئەز ڕێگای حەج دەگرم و پاش حەج لە گۆشەیەک دادەنیشم و تاکو دەمرم خەریکی خودا پەرستی دەبم.

گورگ هێدی هێدی بەڕێ کەفت و چوو. برسیەتی ڕۆژ بە ڕۆژ گورگی بێهێز دەکرد تاکو ئەو لە برسا پەرێشان بوو. ڕۆژێک لە دوور چاڤی بە هێسترێک کەفت کە بەڕەڵا بوو.

گورگ گوتی: خودا لە دەمی تەنگانە حەرام حەڵاڵ دەکات. ئەز لە برسـ
خەریکە دەمرم. ئەز با تۆبەش کردبێت و بۆ حەج بچم. بۆ من حەڵاڵە ئەم هێسترە بخۆم، چونکە ئەگەر ئەز ئەو هێسترە نەخۆم دەمرم و ناتوانم خودا پەرستی بکەم.

گورگ بەرەو لای هێستر چوو و خۆ بۆ پەلامار ئامادە کرد. هێستر بە گورگی گوت: گورگ تۆغر بێت، هێدی هێدی لە ئەم دەشتە دەچیت و بۆ لای من دێیت!

گورگ گوتی: تۆغری ئێمە خێر بێت. من دەخوازم بچم بۆ حەج بەڵام ئەز گەلێک برسییە! بە شەرع حەڵاڵە ئەز تۆ بخۆم. ئەز هاتووم تۆ بخۆم و پاشتر بچم.

هێستر گوتی: تۆ گەلێک بەخێر هاتیت و خودا حەجی تۆ قەبووڵ بکات. بە ڕاستی ئەز لە ئەم ژینە وەڕس بووم و دەخوازم ڕزگار بم. بەڵێ مام گورگ تۆ باش دەزانیت کە گەلێک حەدیس و ئایەت لە سەر ئەم بابەتە هەیە، کە ئەگەر گیاندارێک بێتە سەربڕین دەبێت بە ڕەنگێک بێتە سەربڕین کە زوو گیانی ئەو دەربچێت. هەنووکە بزانە کە ئەز لە دەمی خۆ، کە هاتمە ناڵکردن، بزمارێک لە دەمی ناڵکردن چوو بە گۆشتی پێی من و گەلێک ئازار بە من دەدات. خواردنی من بە ئەم ئێش و ژانە پێچەوانەی خوداپەرستیی تۆ دەبێت! ئەگەر تۆ بە ئەرکی نازانیت لە پێشدا ئەو بزمارەی کە چووە بە پێی من، بهێنیتە دەرو پاشتر بە دڵی خۆ من بخۆ! خێر دەبینیت!

گورگ گوتی: تۆ ڕاست دەبێژیت. کانێ بزمار با من لە پێی تۆ دەربهێنم!

هێستر پێی خۆ بلند کردو نیشانی گورگی دا. گورگ لەسەرخۆ لمبۆزی خۆ بۆ هێستر درێژ کرد تاکو بزمارەکە لە پێی ئەوی بهێنێتەدەر. لە ئەو کاتە هێستر لەقەیەکی لە دەم و لمبۆزی گورگ داو هەموو ددانی ئەوی لە دەم خستە خوار. گورگ بێهۆش کەفت و هێستر لێیدا چوو!

پاشتر که گورگ هاته هۆش خۆ و تەماشای خۆ کرد، بە خۆ گوت: "خودا بتگرێت گورگ! تۆ بابت نالبەند بوو، باپیرت نالبەند بوو! تۆ لە کوێ و نالبەندی لە کوێ! دە بخۆ بلا ئەمە دەردی تۆ بێت"!!

ژمارەی وشە = ٣٧٣

ژمارەی ڕستە = ٣١

نێوەندە ڕستەی درێژ = ٣١/٣٧٣ = ١٢ وشە

ژمارەی وشەی درێژ (پتر لە ٨ تیپ) = ٩

ڕێژەی سەدی وشەی درێژ = ٩/٣٧٣% = ٢.٥

ئاستی ئاڵۆزی بخوێندان = ١٢+ ٢.٥ = ١٤.٥

٢

## گەنجی گوندی ئێمە

گەنجێن گوندی ئێمە کۆمەلەیەکی پێشڕەویان دامەزراندوە کە بە نهێنی کاردەکات. لە گوندی ئێمە زارۆک بە زمانی خۆ ناخوێنن بەلکو ئەوان بە تەنها بە زمانی تورکی دەخوێنن. زارۆک بە نهێنی فێری زمانی خۆ دەبن بەپێی ڕێنووسی لاتینی. گەنجێن گوندی ئێمە دەبێژن "هەموو نەتەوەیەک پێشڤەچووە و بووە بە خودانی دەولەت بەلام نەتەوەی ئێمە لە پاش مایە". گەنجێن کورد لە ناڤخۆ و دەرەڤەی ولات کۆمەلەی ئازادکردن و سەربەستیکردنی کورد و کوردستانیان دروستکردوە. ئەوان شەڕ دەکەن کە ئێمە ئازاد بکەن، کە ئێمە بە سەربەستی فێربین و بخوێنین. ئێمە دەخوازین هاریکاری ئەوان بکەین.

مانگی گولان سالی ١٩٧٩ شڤان، ڕەنجدەر، گاڤان و گوندیی بەلەنگاز کۆمبوون و دەرکەفتنە دەرەڤە. ئەوان خۆ نیشان دان کە مافی مرۆڤی خۆ بستێنن. ئێمە سۆند خواردیە کە وەکو پێشتر نەمێنین، لە پاش ئاغا و بەگی خۆفرۆش ناچین و نابین بە ئامراز بە دەستی دوژمنی نەتەوەی خۆ.

ژمارەی وشە = ١٣٤

ژمارەی ڕستە = ١٠

نێوەندە ڕستەی درێژ = ١٠/١٣٤ = ١٣.٥

ژمارەی وشەی درێژ (پتر لە ٨ تیپ) = ١٥

ڕێژەی سەدی وشەی درێژ = ١٣٤/١٥% = ١١

ئاستی ئالۆزی بخوێندان = ١٣.٥+ ١١ = ٢٤.٥

## ٣

## مەشقی هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان لە لایەن هێزەکانی ئەمریکاڤە دەستیپێکرد

هەولێر ١٩ حوزەیران/یۆنیۆ (ئاکانیوز)

بەرپرسێک لە وەزارەتی پێشمەرگەی حکومەتی هەرێمی کوردستان ڕایگەیاند کە وەکو پێنگاڤی یەکەم هێزی هاڤپەیمانان دەستیان بە مەشقپێکردنی هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان کرد.

جەبار یاوەر ئەمینداری گشتی لە وەزارەتی حکومەتی هەرێمی کوردستان بە ئاژانسی کوردستان بۆ دەنگ و باس (ئاکانیوز) ڕایگەیاند "دوێنێ هەینی لە هەردوو سەربازگەی لەیلان و کەیوان لە شاری کەرکوک، ٢٢٥ کم لە باکوری بەغداد، وەک پێنگاڤی یەکەم ١٠٠ ئەفسەر لە وەزارەتی پێشمەرگەی حکوومەتی هەرێم، لەسەر دەستی هێزەکانی ئەمریکا دەستیان بە مەشقکردن کرد. ئەمەش بەپێی ڕێکەفتنێک لە ناڤبەری وەزارەتی پێشمەرگە و وەزارەتی بەرگریی عێراق".

ناڤبری گوتی "ئەو مەشقە زیاتر سەربازییە. پاش تەواوبوونی مەشقی ئەم ١٠٠ ئەفسەرە خولی دی بۆ پێشمەرگەو ئەفسەری دی دێتە ڤەکردن بۆ ئەوەی لەسەر شێوازی سەردەمییانە بێنە ڕاهاتن".

دیسان یاوەر ئاماژەی کرد کە "ماوەی مەشقەکان نادیارەو نایەتە زانین کەنگێ تەواو دەبێت. ماوەی هەندێک مەشق بە ٣ مانگ تەواو نابێت بەلام هەندێک مەشقی تر ٩ مانگ دەخایانێت بەپێی پێدڤی هەر خولێک".

لە کۆتایی یاوەر گوتی "چونکە هێزی پێشمەرگەی کوردستان بەشێکە لە سیستەمی بەرگری عێراق، بۆیە لە مانگی داهاتوو هێزەکانی عێراق بە یەک سریە لە هێزی پێشمەرگەی کوردستان دەست بە مەشق دەکەن".

(ئاکانیوز)

ژمارەی وشە = ١٧٣

ژمارەی ڕستە = ٨

نێوەندە ڕستەی درێژ = ٨/١٧٣ = ٢١.٥

ژمارەی وشەی درێژ (پتر لە ٨ تیپ) = ٣٥

ڕێژەی سەدی وشەی درێژ = ١٧٣/٣٥% = ٢٠

ئاستی ئاڵۆزی بخوێندان = ٢٠+ ٢١.٥ = ٤١.٥

٤

## بێچووه چۆلەکه

سۆلاڤ یەک بەچکە چۆلەکەی دیت کە لە هێلانەی سەر داری مالی خۆ کەفتبووە خوار. ئەویّ بەچکەی هەڵگرت و لە ناڤ قەفەزێک دانا. بەڵام بەچکە چۆلەکەکە لە قەفەزەکە دلتەنگ بوو. پاش ماوەیەک دایکی سۆلاڤ بانگی سۆلاڤی کرد: سۆلاڤ سۆلاڤ، بڕوانە ئەو چۆلەکە لەسەر ئەو هێلانەی دارە! وا دیارە ئەو تشتێکی لێ گووم بووە؛ سەیر بکە چەند گوناهە. سۆلاڤ گوتی: دایە گیان بەچکەی چۆلەکەیەک لەژێر ئەم دارە کەفتبوو و زۆر برسی و ماندوو بوو. من ئەوم هێنا بۆ ئەوەی بەخێوی بکەم و گەورە بێت. دایکی سۆلاڤ گوتی: کەواتە ئەو چۆلەکە دایکە بۆ بەچکەکەی وا دەکات کە گووم بووە. تۆ نەدەبوو ئەم کارە بکەیت. تۆ ناتوانیت ئەو بەچکە چۆلەکە بەخێو بکەیت، چونکە هەر کەسێک لە لای دایکی خۆ دێتە بەخێوکردن. پاشتر سۆلاڤ بە بێدەنگی بەچکەکەی خستە ناڤ هێلانەی خۆ.

ژمارەی وشە = ١٢٧

ژمارەی ڕستە = ١١

نێوەندە ڕستەی درێژ = ١١/١٢٧ = ١١.٥

ژمارەی وشەی درێژ (پتر لە ٨ تیپ) = ٨

ڕێژەی سەدی وشەی درێژ = ٨ /١٢٥% = ٦

ئاستی ئالۆزی بخوێندان = ١١.٥+ ٦ = ١٧.٥

## ٥

# کەڤالێ ڕەنگین

کاروان وێنەی چیایەکی بلند کێشاو بە رەخ ئەو چیا رویـارێکی جـوان دەهاتـە خوار لەگەل دارو بارێن کەسک. دیسان ئەوی، وێنەی هەتاڤەکی دێم گرنژین کێـشا و لە پشتی ئەو ئاسمانێکی شین هەبوو. لێ ئەوی، هزر کـرد کـە تـشتێکی کێمـە. پاشتر ئەوی، هەندێک وێنەی زارۆکان لـە وێنـەکـە کێـشاو لـە نـاڤ ئـەو دارستانە جوان یاری دەکردن. ئەوی بە ڤێ چەندێ گەلێک دلشاد بوو.

پـشتی هێنگـێ ئـەوی وێنـەی ئـەو زارۆکانـە لابـردو لـە شـوینی ئـەوان وێنـەی هەندێک چۆلەکەی جوان لە ناڤ قەفەسێک کـە زینـدانکردی بـوون کێـشا. پاشـتر کاروان بە خۆ گۆت هەنووکە ئـەم وێنـە گـەلێـک جـوانترە. بـەڤـی ئاڤـایی کـاروان کەڤالێ خۆ هێلاو دەرکەفت.

چۆلەکەیەک گوتی: ئاخ بۆ تۆ کاروان، دلێ تۆ چەند ڕەقە!

یەکێکی دی گوتی: تۆ زارۆکێکی خراپی و تۆ دەخوازێت زیـان بگـەیـەنێـت بـە ئێمە!

هەندێک چۆلەکەی دی گۆتن: هەنووکە ئێمە نەشێین بە ئازادی بژین.

(کاژین)ی خوشکی کاروان گوهداری دەنگێ بالندان بوو ... ئەوێ هاتـە ژۆرڤـە دیتی کە بـرای ئـەوێ ئـەو چۆلـەکـەیـێن جـوان زینـدان کردیـە. کـاژین رابـوو ئـەو قەفەسـەی لابـرد و دووبـارە وێنـەی چۆلـەکـان کێـشا کـە لـە دۆرمانـدۆری دارێـک دەفرین ... پاشی وێنەی یەک زارۆکی جوان کێشا کە خودانـا دوو چـاڤێن شـین و پڕ چەکا زەرد بوو. ئەو زارۆک لەگەل چۆلەکان یاری دەکرد. ئەو زارۆکـا جـوان لـە

دوورڤه رابوو چوو هەندێک گەنم بۆ چۆلەکەکان هێنا و هەموو بـوون بـه هـەڤـالێن یەکدی ... .

ژمارەی وشه = ۲۰۸

ژمارەی ڕسته = ۱۷

نێوەنده ڕستەی درێژ = ۱۷/۲۰۸ = ۱۲

ژمارەی وشەی درێژ (پتر له ۸ تیپ) = ۱۳

ڕێژەی سەدی وشەی درێژ = ۱۳ /۲۰۸% = ٦

ئاستی ئاڵۆزی بخوێندان = ۱۲+ ٦ = ۱۸

# بەشی نۆیەم

## گەنگەشە

### گەنگەشە

### پێشەکی

من لە ئەم پەرتووکە، لە ڕوانگەی فۆنۆلۆجی، دیالێکتۆلۆجی و سیمانتیک، هەوڵی ڕێکخستنی دەنگی وشەم بۆ زمانی فەرمی داوە. ئەز، بەپێی ئەم سێ ڕوانگە، دەتوانم بێژم کە بەڵی دەکرێت دەنگێن/دەنگەکانی زمانی کوردی و چۆنیەتی بەکارهێنان و نووسینی وشە لە بواری فەرمی بۆ زمانی کوردی بێتە ئەنجام دان. هەڵبەت ئەم سێ ڕوانگە پانتایی دی بە دەوڵەمەندی ئەم ڤەکۆڵینە دەدات؛ ئەو ژی ڕوانگەی سۆسیۆلینگویستیک و سایکۆلۆجیی زمانە. بۆ زمانی فەرمی پێدڤی و گرنگە کە هەموو تاکی کورد لە کوردستانی مەزن هەست بە پشکی شێوازی ئاخافتنی خۆ لە ئەو زمانی فەرمی-یە کە دێتە دروست کردن، بکات. لەوما ئەم ڤەکۆڵینە ڕوانگەی دادپەروەری هەیە.

هەنووکە پێکڤە تەماشای ئەنجامی خشتەی وشە و تێکست دەکەین:

### یەکەم وشە:

من لە ئێرە بە کورتی، بە گوێرەی ئاستی وشە، سەرنج و بۆچوونی خۆ لەسەر وشە لە خشتەکان دەنووسم:

یەکەم: وشەی ناوەڕۆکی

١. ناڤ

لە تێکڕای ٢٢٢ ناڤ کە بۆ ئەم فەکۆلین هاتیە بەکارهێنـان ئـەوا لـە ٥١.٥ % وشە لە نێـوان هـەردوو ک.ژ. و ک.خ. وەک یـەکـدین. ٧ % وشـەکـان هاوواتـان. ٩ % وشەکان وەک یەک نین "جیاوان، بێگانە یان هۆی دی". ئـەم جیاوازییـە لـە ڕوانگەی دیـالێکتۆلۆجی و سـێمانتیک دێتـە چـارەسـەرکـردن. ٣٢.٥ % جیـاوازی نێـوان ک.ژ. و ک.خ. هۆکـاری فۆنۆلـۆجی هـەیـە. ئـەم جیاوازییـە لـە ڕوانگـەی فۆنۆلۆجی و دیالێکتۆلۆجی دێتە چارەسەرکردن.

٢. جێناڤ

لە جێناڤ ڕەچاوی فاکتەری ئاسانکاری، گونجانی ڕێزمـانی و دیالێکت هاتۆتـە کردن. لە ک.ژ. و زازا دۆخی کارا و بەرکار هەیە بەڵام لە ک.خ.، لوڕ و هـەورامـی نییە. من هەبوونی جێناڤی کارا و بەرکار بـە پـەسـەنـد نـازانم بـۆ زمـانی فـەرمـی چونکە لە دەمی بەکارهێنانی جێنـاڤ لـە ڕسـتە ڕۆڵـی کـارا و بـەرکـار دیـارە، بـۆ نموونە:

| | |
|---|---|
| من بە تو دەبێژم. | من 'کارا' تو 'بەرکار' |
| ئێوە بە ئێمە دەڵێن. | ئێوە 'کارا' ئێمە 'بەرکار' |
| ئەوان لە ئێوە دلتەنگ بوون. | ئەوان 'کارا' ئێوە 'بەرکار' |
| تو بە من دەبێژیت. | تۆ 'کارا' من 'بەرکار' |

لە هەموو ڕستەکان پێشبەند پێش جێناڤی بەرکار دێت.

هەروەها جێناڤی "من" لە ک.ژ. لە هەردوو دۆخی کارا و بەرکار دێتە بەکارهێنـان. هەرچۆنێک بێت ئەز/من وەکو دوو وشـەی هاوواتـا لـە زمـانی فـەرمـی دەتوانرێت بێتە بەکارهێنان.

من جێناڤی تاک بۆ کەسی یەکەم و دووهەم 'ئەز/من و تو' بە پەسەند دەزانم بۆ زمانی فەرمی چونکە لە هەموو دیالێکتەکان دێتـە بـەکارهێنـان. هـەروەک ک.ژ. من جێناڤی 'ئەوی "نێر" و "ئەوێ "مێ"' بۆ کەسی سێهەم بە پەسەند دەزانم بۆ زمانی فەرمی چونکە دەستنیشانی ڕەگەز دەکات و ئاشـکرا دەستنیـشانی کـەسـی ئامـاژەپێـدراو بـۆ دووایە دەکـات لـە تێکست. لـە ڕێزمـان بـە ئـەمـە دەگوترێت ئەنتیسیدێنت anticedent.

من ئێمە وەک جێناڤی کۆ بۆ کەسی یەکـەم بـۆ زمـانی فـەرمـی بـە پـەسـەند دەزانم چونکە لە ک.خ.، لوڕ و هەورامی هەیە. دیسان 'مـە' دەشـێت کـورتکراوی 'ئێمە' بێت کە لە دۆخی بەرکار لە ک.ژ. دێتە بەکارهێنان. من ئێـوە وەک جێنـاڤی کۆ بۆ کەسی دووەم بۆ زمانی فەرمی بە پەسەند دەزانـم چونکـە لـە ک.خ. و لـوڕ دێتە بەکارهێنان. دیسان وە دەشێت کورتکراوی 'ئێوە' بێت کە لـە دۆخـی بـەرکـار لە ک.ژ. دێتە بەکارهێنـان. مـن ئـەوان وەک جێنـاڤی کـۆ بـۆ کـەسـی سـێهەم بـە پەسەند دەزانم چونکە لە ک.ژ.، ک.خ. و لوڕ دێتە بەکارهێنان.

ئەز لەبەر هۆکاری ئاسـانکاری ڕێزمـانی بـۆ زمـانی فـەرمـی خـۆ وەک جێنـاڤی خۆیی بۆ کەسی تـاک و کـۆی یـەکـەم، دووهـەم و سـێهەم بـە پـەسـەند دەزانـم. هەڵبەت خۆ لە ک.ژ. دێتە بەکارهێنان.

ئەز ئەم، ئەمە، ئەمان و ئەمانە بۆ جێناڤی نیشانە بۆ کەس و شمەکـی تـاک و کۆی نزیک پەسەند دەکەم. ئەم جێناڤە لە لایـەن هـەمـوو دیالێکـتـەکـان جیـاواز دێتـە بـەکارهێنـان. لـە ئێـرە دەنگـی /ڤ/ و /م/ جیـاوازی دەخاتـە نێـو ک.ژ. و

ک.خ.. پێشتر لە ڕوانگەی فۆنۆلۆجی ڕەچاوی دەنگی /ڤ/ هاتیە کردن، لەوما لـە ئێرە دەنگی /م/ دێتە پەسەندکردن. ئـەو، ئـەوە، ئـەوان و ئـەوانـە وەک جێنـاڤی نیشانە بۆ کەس و شمەکی تاک و کۆی دوور بە پەسەند دەزانم چونکـە لـە ک.ژ.، ک.خ. و لوڕ دێنە بەکارهێنان.

جێنـاڤی پرسـیار نـۆ وشـە پێکـدەهێـنن کـە لـە ڕوانگـەی فۆنۆلـۆجی و دیالێکتۆلۆجی هەڵبژاردنی جێناڤی پرسیار بۆ زمانی فـەرمی ئاسـان بـوو. ئـەز لـە ئێرە وشەی کورت کە لە یەک بڕگە پێکدێت بە پەسەند دەزانم لە هەمبـەر وشـەی درێژی دوو بڕگە؛ بۆ نموونە کوێ پەسەندە کە یەک بڕگەیە لە هـەمبـەر کـێـرێ کە دوو بڕگەیە.

لێکچوون لـە نێـوان ک.ژ. و ک.خ. لـە جێنـاڤی دی کـە لـە دە وشـە پێکـدێت زۆرە. شەش وشـە وەکـو یـەکـدین و دوو هاووتـا. دیـسان دوو وشـە لـە ڕوانگـەی فۆنۆلۆجی دێتە چارەسەرکردن بۆ زمانی فەرمی.

### ٣. ئاوەلناڤ

لە تێکڕای ٤٥ وشـە، ٦٩ % وشـەی ک.ژ. و ک.خ. وەکـو یـەکـدین. ٦.٥ % وشە هاووتایـە. ٢٤.٥ % جیـاوازی نێـوان هـەردوو دیالێکـت هۆکـاری فۆنۆلـۆجی هەیە کە لە ڕوانگەی فۆنۆلۆجی و دیالێکتۆلۆجی دێتە چارەسەرکردن.

### ٤. ئاوەڵکردار

لە تێکڕای ٣٥ وشە، ٣٧ % وشـەی ک.ژ. و ک.خ. وەکـو یـەکـدین. ٨.٥ % وشـە هاووتایـە. ١٧ % جیـاوازی نێـوان هـەردوو دیالێکـت بـەکارهێنـانی وشـەی بێگانـە و هۆکـاری تـرە کـە لـە ڕوانگـەی سـێمانتیک و دیـالێکتۆلۆجی دێتـە

چارەسەرکردن. ٣٧ % جیاوازی نێوان ک.ژ. و ک.خ. هۆکاری فۆنۆلۆجی هەیە کە لە ڕوانگەی فۆنۆلۆجی و دیالێکتۆلۆجی دێتە چارەسەرکردن.

### ٥. کردار

ئەز لە بەشی کردار، بەپێی پێشگر، پاشگرو هەندێک دەنگی ناڤین، چاردە کۆمەڵ کردار-م لە نێوان ک.ژ. و ک.خ. هەڵبژارد. هەندێک کردار لە هەردوو دیالێکت وەک یەکترن بەڵام هەندێکی تر لە ڕوانگەی فۆنۆلۆجی لە یەکدی جیاوازن. هەرچۆنێک بێت، بەپێی میتودی کارکردن، هەموو جیاوازیی فۆنۆلۆجی نێوان هەردوو دیالێکت دێتە چارەسەرکردن، بێجگە پێشگری /ڤە/ لە ک.ژ. کە لە هەمبەر پاشگری /وە/ لە ک.خ. هەیە. ئەم بابەتە پێدڤی بە ڤەکولێنی تایبەت هەیەو بۆیە هیچ چارەسەر بۆ ئەو نەهاتیە دانان.

### ٦. ژمارە

ژمارە بۆ سێ کۆمەڵ هاتە دابەشکردن؛ بنجی، پلەیی و کەرتی.

لە ژمارەی بنجی پڕانی وشە وەکو یەکدین لە هەموو دیالێکتەکان، نەمازە لە ک.ژ. و ک.خ. هەندێک جیاوازیی فۆنۆلۆجیی کێم هەیە لە نێوان ک.ژ. و ک.خ. کە بە ساناهی دێتە چارەسەرکردن بۆ زمانی فەرمی.

ڕێسای ژمارەی پلەیی بۆ وشەی بەکارهێنراو لە ک.خ.، لور و هەورامی وەکو یەکدین؛ ئەم ڕێسایە نزیکایەتی زۆری هەیە لەگەڵ ڕێسای ژمارەی پلەیی بۆ زازا. ڕێسای ژمارەی پلەیی بۆ ک.ژ. جودایە لەگەڵ هەموو دیالێکتێن کوردی. لەوما ڕێسای (+ەم+مین) دێتە پەسەندکردن بۆ زمانی فەرمی؛ مینا یەک-یەکەم-یەکەمین.

ڕێسای ژمارەی کەرتی تاکو ڕادەیەکی زۆر بۆ ک.ژ.، ک.خ.، لوڕی و هەورامی وەکو یەکدین. لەوڕا ئەم ڕێسایە بۆ زمانی فەرمی دێتە پەسەندکردن.

٧. سەرسوڕمان

تێکڕای وشەی سەرسوڕمان لە ک.ژ. و ک.خ. وەکو یەکدین، بێجگە دوو وشە کە دەکرێت وەکو وشەی هاوواتا لە زمانی فەرمی بێنە بەکارهێنان.

دووهەم" وشەی ڕێزمانی

٨. ئامرازی یەکگرتن

لە حەفت وشە پێنج وشە لە نێوان ک.ژ. و ک.خ. وەکو یەکدین بەڵام جیاوازیی فۆنۆلۆجی هەیە لە نێوان دوو وشە کە بەپێی میتۆدی کارکردن بە ساناهی دێنە چارەسەرکردن بۆ زمانی فەرمی.

٩. ئامرازی گەیەنەر

لە دە وشە لە نێوان ک.ژ. و ک.خ. پێنج وشەی وەکو یەکدین، سێ وشە هاوواتایە و دوو وشە جیاوازی فۆنۆلۆجی هەیە کە بەپێی میتۆدی کارکردن بە ساناهی دێنە چارەسەرکردن بۆ زمانی فەرمی.

١٠. ئامرازی پێشبەند

بە گشتی چار وشەی ئامرازی پیشبەند هەیە بەڵام تەنها یەک پێشبەند وەکو یەکە لە نێوان ک.ژ. و ک.خ.. سێ پێشبەندەکەی تر جیاوازی فۆنۆلۆجی هەیە کە بەپێی میتۆدی کارکردن بە ساناهی دێنە چارەسەرکردن بۆ زمانی فەرمی. ئەز

دەخوازم بێژم کە پاشبەندی /ژ/، /د/ و /ل/ هەمان ڕۆڵ و ئەرکی ڕێزمان لە ڕستە دەبینن. لەوڕا من پێشبەندی /ل/ پەسەند دەکەم کە ئەمڕۆ دەبێت بە /لە/ بۆ زمانی فەرمی.

## تێکست

ئەز لە تێکستەکان هەوڵی زمانی نووسینم داوە، بۆ نموونە وشە، بڕگە یان دەنگی لابراو یان زیادکراو هاتۆتە گۆڕین و دووبارە بە دروستی هاتۆتە نووسین. هەلبەت لە ک.خ. جێناف لەگەڵ وشەی دی دێتە لکاندن؛ ئەمڕۆ دەبێت بە هۆکاری دژواری تێگەیشتن بۆ خوێنەرێن ک.ژ.. هەروەها من هەوڵم داوە کە تێکست ئاراستەی گشتی خوێنەری کورد بێت، نەمازە خوێنەری ک.ژ. و ک.خ.. دیسان تێکست سادە هاتۆتە داڕشتن، واتە ژمارەی وشە لە ڕستە کێمە.

مخابن بوار نەبوو ئەم تێکستانە لە لایەن قوتابی و خوێندکار لە قوتابخانەکانی کوردستان بێنە خوێندن و ئاستی تێگەیشتنی ئەوان بۆ هەر یەک لە ئەم تێکستانە بێتە زانین. هەروەها سەرنج و تێبینی مامۆستایێن زمانی کوردی لە قوتابخانەکانی کوردستان پێدڤی بوو بۆ هەڵسەنگاندنی تێکستەکان.

# بەشی دەیەم

## دەرئەنجام

### دەرئەنجام

زمانی کوردی، وەک هەر زمانێکی دی لە ئەم جیهانە، پێکهاتەی چەندین دیالێکت و دەڤۆک و زاراوەی جوداجودایە. مرۆڤ دەبێت جیاوازی لە نێوان دوو جۆر زمانبەکارهێنان بکات: زمانی قسە، یان جۆرەها شێوازی قسە، کە هەیە لەگەڵ ئەو زمانەی کە دەبێت بکرێ یان دەبێت ببێت بە زمانی تێکڕای نەتەوەیەک. مەبەست لە زمانی تێکڕای نەتەوە، زمانی ستانداردە یان فەرمی. هەندێک جار ئەو زمانەی کە دەبێت ببێت بە ستاندارد شێوەی قسەی ناوچەیەکی دیاریکراو بووە بەڵام لە ڕەوشێکی مێژوویی و ڕامیاری و ئابووری بووە بە زمانی ستاندارد بۆ نەتەوەیەک. لە ڕەوشی ئەمڕۆی کوردستان هیچ دیالێکتێک ناکرێت بێتە سەپاندن بەسەر تێکڕای دانیشتوانی کوردستان چونکە لە لایەن گشت نایەتە پەسەندکردن و زەمینەی جێبەجێکردنی نییە. لەوما پێویستە زمانی ستانداردی کوردی لە هەناوی هەردوو کرمانجی ژوورو و خوارو، بە یارمەتی لوڕ، هەورامی و زازا، بێتە دروستکردن. زمان وەک هەر زیندەورێک، ئامێرێک یان دیاردەیەکی جڤاکی دی، دەبێت خزمەت بکرێت، وزەی بە ئەو بدرێ، بێتە بەکارهێنان و ڕێکبخرێت.

داوای سەپاندنی دیالێکتێک یان جووت ستانداردی نەک هەر ناکردە نییە بەڵکو نازانستییە. ئەو کەسانەی کە بانگەشەی سەپاندنی دیالێکتێک بەسەر تێکرای دانیشتوانی کورد دەدەن پشت بە کام فەکۆڵینی زمانی دەبەستن؟ تەنها بەکارهێنانی دیالێکتێک لە لایەن دەستەڵاتداران لە هەولێر و سلێمانی و مێدیای ئەم دوو شارە نابێت بکرێ بە بیانوو بۆ فەرامۆشکردنی شێوازی زمانی بەکارهاتووی پارچەکانی تری کوردستان. وەکو بەرپەرچدانەوەیەک بۆ ئەم بۆچوونە هەندێک چەمکی جووت ستاندارد بەکاردەهێنن. جووت ستاندارد واتای لەتکردنی نەتەوەی کوردو فەرامۆشکردنی دیالێکتەکانی لوڕ و هەورامی (زازا و گورانی) دەگەیەنێت. لەوڕا ئەو کەسانەی کە باسی جووت ستاندارد دەکەن باسی پێنج ستانداردژی دەکەن، گوایە دادپەروەرن!

زمانی ستانداردی کوردی دەکرێ لە هەلومەرجی ئێستای کوردستان بەدی بهێنرێ. ئەگەر پسپۆڕانی زمان، بە تایبەتی لە زانکۆکان و ئەکادیمی کوردی، لەسەر بنەمای دیالێکتۆلۆجی، لێکسیلۆجی، سۆسیۆلینگویستیک، سایکۆلینگویستیک، فۆنۆلۆجی، ئیتمۆلۆجی، وێژەو هی تر فەکۆلین بکەن ئەوا بێگومان زمانی ستاندارد دێتە بەرهەمهێنان.

ڕاستییەکەی گرفت لە ئەوە نییە کە زمانی کوردی لە چەندین دیالێکت و زاراوە پێکدێت بەڵکو گرفت لە بەکارهێنەرانی زمانی کوردییە. لە ڕوانگەی مێژوو بڕوانین ئەوا نەتەوەی کورد هەمیشە لەت لەت بووە و گیانی لووتبەرزی و دووبەرەکی، دوژمنکاری و تۆڵە لەیەکتر سەندن زاڵ بووە. هەر ئەم هۆیانە ناهێڵێت کە ئێمە زمانی کوردی یەک بخەین. کام زمان لە ئەم جیهانە لە چەندین دیالێکت و زاراوە پێک نەهاتووە؟ نەتەوەیین تر گرنگی بە زمانی خۆ دەدەن و ڕێزی لە زمانی خۆ دەگرن چونکە ڕێزگرتن لە زمان واتای ڕێزگرتن لە هەبوونی،

له ڕابردووی-، داهاتووی-، کەلتووری خۆ، له ژیان و ئابڕوو و هەست و ئامانجی خۆ دەگەیەنێت وەکو نەتەوە.

به شێوەیەکی سەرەکی زمان بریتییه له سێ یەکە: دەنگ، وشه و ڕسته. ئەم سێ یەکه له یەکدی نایەته جوداکردن و بەڵکو هەر یەک بە تەنیا کاریگەری بەسەر ئەوانی دی هەیه. له ئەم پەرتووکه ئەوە هاتۆته سەلماندن کە دەنگ و وشە لە زمانی کوردی دێتە ڕێکخستن. ئەمەش کارئاسانی باش بۆ ڕێسای ڕستەسازی بۆ زمانی فەرمی دەکات. هەرچۆنێک بێت، ئێمه پێکڤه دەبێت لەسەر بنەمای زانستی زمان هەوڵی دروستکردنی ڕێسای ڕێزمان بدەین بۆ داڕشتنی ڕستە. ئەمڕۆ بێسەروبەری و ناحەقییەکی زۆر لە هەمبەر ڕێسای دەنگی، وشەسازی و ڕستەسازی کوردی دەکرێت. هەرکەس تاڕادەیەکی زۆر بە ئارەزووی خۆ دەنووسێت و دەپەیڤێت. ئەم ڕاستییه هێندە ئاشکرایە کە پێدڤی بە بەڵگە هێنان ناکات.

خوێنەری هێژا!

بلا خەڵکی کرماشان، پاوە، کەرکوک، هەکاری و هتد. جودا قسه بکەن بەڵام با هەموو وەکو یەک بنووسن. با هزری ئێمە نەتەوەیی بێت نەک دیالێکتی، خێلەکی و پاشکەفتی. بلا ئێمە کورد و کوردستانی بین نەک موکریانی، بادینانی، فەیلی و شەبەکی هتد.

خوێنەری هێژا!

زمانی فەرمی نوێنەرایەتی نەتەوەی کورد و خاکی کوردستان دەکات. هەبوونی زمانی فەرمیی کوردی واتای خاپورکردنی هزری خێل، عەشیرەت،

ناوچەگەری، دوژمنداری و دەرەبەگایەتی دەکات. زمانی فەرمی واتای شارستانی و تەبایی دەکات لە نێوان کوردانی ئیلام، ماردین، سلێمانی، قامیشلی و بازێڕێن تری کوردستان. زمانی فەرمی بۆ کوردستان بە واتای ئازادبوون و فراوانبوونی هزری مرۆڤی کورد دەکات، زمانی فەرمی بە واتای باوەڕنەبوون بە سنووری دەستکردو دابەشکراوی خاکی کوردستان دەکات، زمانی فەرمی واتای هێز، باوەڕ، وزە، دڵنیایی، یەکڕیزی و توانای پێکڤە کارکردن دەکات. زمانی فەرمی بە واتای بە گژداچوونی فیتنەیی، دووبەرەکی، ناحەزی و دوژمنداری لە ماڵی کورد دێت.

خوێنەری هێژا!

ئێمە پێکڤە دەتوانین زمانی فەرمی بۆ کوردستان چێ بکەین. تو چی دەبێژیت؟

# ژێدەر

Dahllöf, Mats (1999). Språklig betydelse. En introduktion till semantik och pragmatik. Studentlitteratur. Lund.

Sjöström, Sören (2006). Språkets struktur, betydelse och användning. Norstedts Akademiska Förlag. Falun.

Ljung, Magnus & Ohlander, Sölve (1996). Allmän grammatik.Gleerups. Malmö.

Akmajian, Adrian & others (1995). Linguistics. An introduction to Language and Commuinication. Massachusetts Insititute of Technology. Fourth edition.

Holmberg, Per & Karlsson Anna-Malin (2006). Grammatik med betydelse. En introduktion till funktionell grammatik. Hallgren & Fallgren. Uppsala.

Hultman. Torg G. (2003). Svenska Akademiens språklära. Svenska Akademiens. Stockholm.

Hyltenstam, Kenneth & Stod, Christopher (1991). Språkbyte och språk bevarande. Studentlitterartur. Lund.

Ilse, Lehiste (2000). Språkkontakt. Alhambras Pocketencyklopedi / 75.

Lars-Gunnar Andersson (1999). Språktypologi och språksläktskap. Almqvist & Wiksell. Göteborg.

Ledin, Thomas (1993). Språkens landskap i Europa. Studendlitteratur. Lund.

Nyström, Staffan (1996). Introduktion till dialektologin. Stockholm Universitet, Institution för Nordiska språket. Stockholm.

Svensson, Jan (1993). Språk och offentlighet. Om språkbruksförändringar i den politiska offentligheten. Lund Univeristy Press. Lund.

Trudgill, Peter (1994). Language contact and dialect contact in linguistic change. I, Kotsinas, Ulla-Britt & Helgande, Jhon (utg.). Dialektkontakt, Språkkontakt och språkförändring I norden. MINS 40. Stockholm: institiution for nordiska sprak. P.13-22.

Trudgill, Peter (2000). Sociolinguistics. An introduction to language and society. Penguin books. Fourth edition.

ئیسماعیل تاها شاهین (٢٠٠٨). ژ بۆ رێنڤیسەکا چێتر. ئێکەتیا نڤیسەرێن کورد. دهۆک

بەدران ئەحمەد حەبیب (پێداچوونەوە و پەسەندکردنی ئەنجومەنی کۆڕی زانیاری کورد) (٢٠٠٤). *ڕێنووسی یەکگرتووی کوردی*. بڵاوکراوەکانی ئاراس. هەولێر.

د. ئەوڕڕەحمانی حاجی مارف (١٩٧٩). *ڕێزمانی کوردی. مۆرفۆلۆژی. بەشی یەکەم ناو*. چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد.

د. ئەوڕڕەحمانی حاجی مارف (١٩٨٧). *ڕێزمانی کوردی. وشەسازی بەشی. دووەم جێناو*. دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی. بەغدا.

د. ئەوڕڕەحمانی حاجی مارف (١٩٩١). *ڕێزمانی کوردی. وشەسازی بەشی سێیەم ئاوەڵناو*. لە بڵاوکراوەکانی کۆڕی زانیاری عێراق. دەستەی کورد.

د. ئەوڕڕەحمانی حاجی مارف (١٩٩٨). *ڕێزمانی کوردی. وشەسازی بەشی چوارەم ژمارە و ئاوەڵکردار*. دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی. بەغدا.

د. ئەوڕڕەحمانی حاجی مارف (٢٠٠٠). *ڕێزمانی کوردی. وشەسازی بەشی پێنجەم کردار*. زنجیرە کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم. سلێمانی.

د. کوردستان موکریانی (٢٠٠٤). *سینتاکسی ڕستەی تێکەڵ*. دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس. هەولێر.

د. عبدالرحمان قاسملۆ (٢٠٠٤). *کوردستان و کورد*. چاپخانەی کتێبی ئەرزان. سوید.

د. سادقی شەرەفکەندی (١٩٩٥). *کورتە مێژووی بزوتنەوە نەتەوایەتی یەکانی کورد*. چاپخانەی ئاپێک. سوید

جەمال نەبەز (١٩٧٦). *زمانی یەکگرتووی کوردی*. بڵاوکراوەی یەکێتیی نەتەوەیی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا.

جگر خوین (١٩٦١). *اواو دەستورا زمانی کوردی*. ب اریکاریا جامعا بەغدا هاتیە چاپکرن. چاپخانا صلاح الدین. بەغدا.

وريا عمر امين (١٩٨٦). *رێزمانی ڕاناوی لکاو*. دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی. وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن. کۆماری عێراق.

نەریمان عەبدوڵڵا خۆشناو (٢٠٠٩). *رێزمانی کوردی (بەشەکانی ئاخاوتن)*. چاپخانەی منارە/هەولێر.

ڕەئووفی ئەحمەد ئالانی (١٩٨١). *کێشەیەک لە ڕێزمانی کوردیدا، پاشگر و نیشانەی ەوە//وە*. کۆماری عێراق، وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن. دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی. زنجیرەی زمان ٤.

ڕفیق محەمەد محێدین شوانی (٢٠٠٣). *ئامرازی بەستنەوە لە زمانی کوردیدا*. دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم. سلێمانی.

د. ڕەفیق شوانی (٢٠٠٨). *زمانی کوردی و شوێنی لە ناو زمانەکانی جیهاندا*. دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریان. هەولێر.

فازل عمر (٢٠٠٤). *چەند ئاورەک ل زمانێ کوردی*. دەزگەها سپیریز یا چاپ و وەشانێ. دهوک.

فواد حەمە خورشید (١٩٨٥). *زمانی کوردی — دابەشبوونی جوگرافیایی دیالێکتەکانی*. وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن. دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی. بەغداد.

سەلاح سەعدولا (١٩٩٩). *قاموسا سەلاحەدین ئینگلیزی — کوردی*. کتێبی هەرزان. سوید. چاپی دووهەم.

سادق بهاء الدین ئامێدی (١٩٨٧). *رێزمانا کوردی. کرمانجی یا ژۆری و ژێری یا هەڤبەرکری*. وەزارەتی فێرکردنی باڵا و لێکۆڵینەوەی زانیاری زانکۆی سەلاح الدین. چاپا یەکێ.

لارس میلین (٢٠١٠). *سایکولۆژیی زمان*. ئەکادیمیای کوردی. و. غازی عەلی خورشید.

غـازی عـەلـی خورشـید (٢٠١١). *فۆنـەتیـک و فۆنۆلـۆجی*. دەزگـای چـاپ و پەخشی سەردەم. سلێمانی.

لیژنەیـەک لـە وەزارەتـی پـەروەردە (٢٠٠٧). *زمـان و ئـەدەبـی کـوردی. پـۆلی چوارەمی ئامادەیی*. حکومەتی هەرێمی کوردستان — عێراق. وەزارەتی پەروەردە.

دکتر پرویـز ناتـل خـانلری (١٣٦٩). *دسـتور زبـان فارسـی*. انتـشارات تـوس. چاپ دهم.

Qanate Kurdo (1990). Gramera zmane kurdi: Kurmanci - Sorani. Wesanen Roja nu. Stockholm.

گۆڤاری سڤۆرە 4 -12 -2010 http://www.eduhok.net/sivore/

ماڵپەڕی زانکۆی دهۆک 01 -12 -2010 http://www.uod.ac/ku/presidentwelcome

گۆڤاری پەپولە. ژ.١٥٣ ل. ٢٠ 2010- 07- 20 http://www.khak.org/pdfs/p15320.pdf

01 - 12 – 2010 ماڵپەڕی سبەی http://www.sbeiy.com/ku/news.aspx?cat

ماڵپەڕی ئەڤرۆ 01 – 12 – 2010

http://evropress.com/in.php?page=kotar&id=419

ڕۆژنامەی هاوڵاتی ٢٠١٠- ٠٥- ١٨

ماڵپەرا ئێکەتییا نڤیسەرێن کورد- دهۆک 03- 08 – 2010

http://www.duhokwriters.net/130-Dr-EbdilwehabXalid1552010-cugrafiyazimani.htm

فەرهەنگی سویدی — کرمانجیی خواروو

http://lexin.nada.kth.se/lexin/#searchinfo=both,swe_sdh

فەرهەنگی سویدی — کرمانجیی ژووروو

http://lexin.nada.kth.se/lexin/#searchinfo=both,swe_kmr

## پاشكۆ

د . عبدالوهاب خالد موسی- ماڵپەڕێ ئێكەتییا نڤیسەرێن كورد —
دهۆک ٢٠١٠/٨/٣

### جوگرافیا زمانی

مێژوویا سـەرهلـدانا جوگرافیـا زمـانی د زڤریتـەڤـە بـۆ پێـدڤیا ل دویڤچوون و ڤەكولینا بنەماییێن دیالێكتێن جیاواز ، واتە ژ بـۆ خرڤـەكرنـا پێزانینـان دەریـارەی دیـالێكتێن زمانـەكـێ دیاركری و بـەلاڤبوونـەڤـەیا جـوگرافی یـا وان دیالێكتـان و تایبەتمەندییێن هویرێن وان ب رەنگەكێ گشتی ، ئەڤە ژی ژ بۆ ئارمانجا دیتنەڤـەیا سیماییێن جوراوجور و بەلاڤەییێن زمانەكێ دیاركری ل سەر هاتیە ئاڤاكرن.

ڤەكولین ل سەر دیاردا هەبوونا دیالێكتان ژ لایەكیڤە ل بن روناهیا گـەشـەكرنا مێژوییـا زمـانی هاتیـەكـرن و ژ لایـەكـێ دیترڤـە ڤـەكولـەران رێبـازا وەسـفی — بونیاتگەری — گرتیەبەر بۆ ڤەكولینا دیالێكتان . مەیدانا ڤـەكولین و ل دویڤچوونا دیالێكتان سیماییێن هویر و زانستیانە بخوڤەدگریت ، چونكی ئـەو زانیـارییێن دهێنـە كومكرن نە بتنێ كاریگەریا خو بۆ مەیدانا شروڤەكرنا زمانی یا هـەی ، بـەلكو بـۆ دیاركرن و ساخكرنەڤەیا مژارێن جودا جوداییێن رەوشەنبیریێ یا هـەی ، كـو ئـەڤـە بخوژی رێگەكە بۆ چوونە ناڤ وان مژارێن كو هێشتا ڤـەكـولینێن رژد ل سـەر نـە هاتینەكرن.

جوگرافیا زمانی، د سەدێ بیستێدا رێبازا خویا تایبەتا ڤـەكولینێ و چـارچوڤێ دیاركریێ كارێ خو گرتـەبـەر، هـەرچـەنـدە رهـێن بابـەتـێ ڤـەكولینـا دیالێكتـان د زڤرنەڤە سەدێ نوزدێ، واتە بنەماییێن جوگرافیا زمانی ل دەوروبەرێن سـالا ١٨٧٠ز دەستپێكریە ل سەردەستێ وێ گرۆپا رێزمانڤانێن ئەلمانی ئەوێـن رەنجـەكـێ بـاش

مـەزاختـی د واریٚ ڤـەکـولینێن زمـاني دا و ل دەمـێ خـو هاتینـە نـاڤکرن ب ( رێزمانڤانێن لاو ) ، ئەڤان زانایا گرنگیـەکا تایبـەت ب ڤـەکولینـا دیـاردا هـەبوونـا دیالێکتان ددا ، چونکی ل وێ باوەرێ بوون کو دیاردا هـەبوونا دیالێکتـان دشـێت باشترین بەلگەیا بدەتە وان دەربارەی تیورێن وانێن تایبەت ب گەشەکرنا زمـانی و بەراوردکرنا زمانێن ئێک خێزان نەخاسمە خێزانا زمانێن هندو ئوورووپی.

تیـورا جوگرافیـا زمـانی ژ کـارێن مـەیـدانی دەسـتپێکر و گـەشـەکرنـا وێ یـا بەرچاڤ د سنورێ نەخشەکێشان و بەرهـەڤکرنـا ئـەتلـەسێن دیالێکتانـدا بـوو. ل دەسپێکێ زماننناسێن فەرەنسی رابەرێن ڤێ رێبازێ بـوون، پـشتی ڤـان زمانناسـێن ئیتالی رۆلەکێ بەرچاڤ هەبوو، ب تایبەتی لایـەنگرێن قوتابخانـا زمانناسیا نـوێ، کـو ئـەڤانـا چـەنـدین ئـەنجـامێن گرنـگ د زانـستێ دیالێکتانـدا پێشکێـشکرن و ژ ئەنجامێ کارێ بەرچاڤێ وان ناڤەکێ نوی د مەیدانا دیالێکتولۆژییدا سەرهلـدا، ئـەو ژی (زمانناسیا روویـەر) بـوو. دوماهیـا سـەدێ نـوزدێ و دەسـپێکا کارکرنـەکا ب بەرهەم بـوو د بـوارێ بـەرهـەڤکرنـا ئـەتلـەسێن دیـالێکتێن چـەنـد زمـانێن هنـد و ئوورووپیێن جیاوازدا ب تایبەتی زمانێن جێرمانی و رومانسی .

ئێکەمین ئەتلەسا مەزنا دیالێکتان (ئەتلەسا زمانێ ئەلمانی) بوو ، کـو ل سـالا ١٨٧٦ز ژ لایێ زمانناسێ ئەلمانی (جورج ڤینکەر)ڤە هاتـە دانـان و ئـەڤ کـارە د مەیدانا جوگرافیا زمانیدا ب کارەکێ بەرچاڤ دهێتە هژمارتن، هەرچـەنـدە ژ لایـێ رێبازا بەرهەڤکرنێڤە یا ڤالە نینە ژ هندەک کێماسـیان . ژ لایـەکـێ دیترڤـە هـزرێن سەرەکیێن زانا (جول چیرون ١٨٥٤-١٩٢٦ ز) ی بەلاڤەبوون ، کـو لایـەنگرەکـێ ب نـاڤ و دەنگـێ جوگرافیـا زمـانی بـوو ل دوماهیـا سـەدێ نـوزدێ و دەسـپێکا سـەدێ بیـستێ، ژ هـەژی دیارکرنێیـە ئـەڤـی زانـای ل ژێـر کاریگـەریـا قوتابخانـا زمانناسیا فەرەنسی ڤەکولینێن خـو ئـەنجـام ددا. چیرونـی د ڤـی واریـدا کـارەکـێ

بەرچاڤێ کری، ئەوژی دانانا ئەتلەسا زمانێ فەرەنسی بوو د چەند بەرگادا و ل ناڤبەرا سالێن ( ١٩٠٢-١٩١٢ ز ) ئەڤ ئەتلەسە یا هاتیە بەلاڤکرن و داتایێن ئەڤی کاری ژی ل ناڤبەرا سالێن (١٨٩٧-١٩٠١ز ) یێن هاتینە کۆمکرن. ب راستی ئەڤ ئەتلەسە ب کارەکێ بنەرەتیێ زانستێ دیالێکتان دهێتە هژمارتن. پشتی زانا چیرونی چەندین زمانناسا کارێن ژ وی رەنگی ئەنجامدان، بۆ نمونە ژ وان زانایا هەردوو ڤەکولەرێن سویسری (یابرگ و ج .یود)ی ئەتلەسەک ب ناڤێ (ئەتلەسا زمانی و چەند تشتەک دەربارەی ئیتالیێ و زمانێن باشوورێ سویسرا) ل سالێن ١٩٢٥- ١٩٤٠ ز بەرهەڤکر.

ژ لایەکێ دیترڤە ئەو ئەنجامێن کو د وارێ ئەتلەسا زمانیدا ب دەست کەفتین رێ خوشکر بۆ بابەتێ ڤەکولینێن فەرهەنگی (فەرهەنگسازی) کو ل دەمێ دانانا فەرهەنگ و ڤەکولینێن هەڤشێوە هزر ل پشکنینا ئەوان پەیڤان هاتەکرن، کو د ئاخفتنا رۆژانەو گشتیدا دهێنە بکارئینان. د ڤی واریدا زانایێن جوگرافیا زمانی هەول دا دووبارە مێژوویا ڤان پەیڤا ئاڤا بکەنەڤە ل سەر بنەمایێ ل بەرچاڤ وەرگرتنا؛ واتاو گەردان و ئەرکێ ئاڤاکرنا پەیڤان. د ڤی واریدا شەنگستەیەک دامەزراند بۆ ڤەکۆلینا مێژوویا پەیڤا ب هاریکاریا ئەوان هۆکارێن کو پەیوەندی ب جوگرافیاو جڤاک و مێژوویا زانیاریانڤە هەی، دیسان هەر د ڤی واریدا ڤەکولین ل زانستێ دەروونیێ نەتەوەیی هاتنەکرن، واتە پێڤەگرێدانا خەلکێ ئێک نەتەوە ب زمانێ خوڤە ژ لایەکیڤە و ژلایەکێ دیترڤە پێڤەگرێدانا ئاخفتنکەرێن ئێک دیالێکت ب دیالێکتا خویا سروشتیڤە واتە زکماکیڤە، ژ بۆ گەهەشتنا ئەنجامێن باش و زانستی ڤەکولەران تێکست و دیکۆمێنتێن زمانیێن تایبەت، چ دکەڤن و مێژوویی بن چ د هەڤچەرخ و نوی بن ب هویری پشکنین . هەروەسا د ڤی واریدا

لایەنگرێن جوگرافیا زمانی گرنگی ب وان زانیاریان دا ئەوێن دیاردێن جوراوجورێن ژیانا زمانی ژ ئەنجامێ گەشەو گوهورینێ و هۆکارێن جیاواز پشت پێ دبەستیت.

ئەڤ رێبازە، کو ئارمانج ژێ بۆ ل دویڤچوون و دیتنەڤەیا چارەسەری و گەهەشتنا راستیان بوو دەسکەفتەکێ باش بوو د وارێ زانستێ دیالێکتولۆژیێ نویدا. ڤەکولەرێن زمانێن رومانسی یەکەم کەس بوون، کو ئەڤ بنەمایە هەلبژارتی و ڤەکولینێن خو ل دویڤ ڤێ رێبازێ ئەنجام داین، ژ ڤی لایڤە تیرۆژکەکا نوی ئێخستە سەر دیروکا وی دەستودارو ماوەیێ ،کو ئەورویا رۆژئاڤایی بەرەڤ رومانسیەتی دچوو و ب تایبەتی ل سەدێ یەکەمێ زایینی. ب ڤێ ژی جیاوازی د ناڤبەرا لاتینی و مەسیحیەتێ و لاتینی و بوتپەرستییێدا دهاتە کرن، هەروەسا د ڤەکولینێن وانێن دیالێکتولۆژیدا بزاڤ هاتەکرن، کو جیاوازی د ناڤبەرا لاتینیا د هاتە بکارئینان و لاتینیا ستاندەرد دا بهێتە دیارکرن. ئەڤێ چەندێ ژی بۆ دیروکا نێزیک مفاو گرنگیەکا باش هەبوو د لێکدانەڤەیا سامانێ فەرهەنگا فەرەنسی و گەشەکرنا وێدا.

زماننا سێن جوگرافیا زمانی رژدی ل سەر هندەک بنەمایان کر، کو نهو ب بەراهیێن زانستێ دیالێکتولۆژیێ نوی دهێنە هژمارتن ، وەکو:

١-جوداهیێن د ناڤبەرا دیالێکتێن ئێک زماندا، ب رەنگەکێ ئاسایی و سروشتی ب بەرفرەهی د هەردوو وارێن فەرهەنگی و ب لێڤکرنا دەنگادا خویا دبن و هێدی هێدی بەرەڤ کێمبوون دچن د هەردوو وارێن مۆرفۆلۆژی و سینتاکسیدا. بۆ روونکرنا ڤێ خالێ وەکو ل سەری دیار ئەڤێ چەندێ مەترسی نینە ل سەر ئێککرتنا زمانەکێ فرە دیالێکت، بەلێ ژ ئەنجامێ هەر هۆکارەکێ هەبیت ئەگەر گوهورینێن سینتاکسی د رێزمانا ئەوان دیالێکتاندا رویدان، وی دەمی ئەڤە رەنگەکا مەترسیدارە لسەر چارەنڤیسێ نێزیکبوونا ئەوان دیالێکتان د زمانەکێ

هەڤگرتیدا، باهرا پتریا جارا ژی هۆکارێ ب هێزێ ڤێ گوهورینێ ئەوە ئەگەر دیالێکتەک ژ وان هەڤسویا زمانەکێ هەمان خێزانا زمانێ خو بیت. چونکی زمانێن ژ خێزانەکا دی ئەگەر ب ساناهی کار ل فەرهەنگا زمانەکی یان دیالێکتەکێ بکەن، بەلێ نەشێن زوی ب زوی ب ساناهی کار ل یاساییێن سینتاکسییێن دیالێکتەکا جودای خێزانا خو بکەن. بۆ نمونە : کارتێکرنا زمانێ فارسی یا کاریگەرتر و مەترسیدار ترە لسەر دیالێکتێن زمانێ کوردی ژ کارتێکرنا هەردوو زمانێن تورکی و عەرەبی، چونکی فارسی هەمان خێزانەو تورکی و عەرەبی خێزانەکا بیانینە ژ بلی فەرهەنگێ نەشێن کار ل یاساییێن سینتاکسی بکەن.

٢-هۆکارێن جڤاکی وئاییني و مێژوویی و سیاسی کارتێکرن و گرنگیەکا بەرچاڤا هەی د پەیدابوونا جیاوازیان دناڤ زمانەکیدا. بۆ نمونە : ل سەردەمێ دەرەبەگایەتیێ دیالێکت د زێدەبوونێدا بوون یان ژ ئەگەرێ پەیدابوونا ئایین و ئولێن جیاواز دناڤ نەتەوەکێ ئێک زماندا یان ژ ئەگەرێ داگیرکرن و دابەشکرنا نەتەوەکێ ئێک زمان د ناڤبەرا چەند داگیرکەراندا فرەدیالێکتی پەیدا دبیت گەشە دکەت هەروەکو دەست و دارێ نهویێ زمانێ کوردی ، ب بەروڤاژی ڤێ چەندێ ژی ل سەردەمێ هەبوونا دەسەلاتەکا ناوەندی بۆ ئاخفتنکەرێن ئێک زمان ئەڤ جیاوازییە کێم دبنەڤە.

٣-هۆکارێن جوگرافی کاریگەریەکا سەرەکی د جیاوازیێن زمانیدا یا هەی، د جوگرافیا زمانیدا دەڤەرێن چیایی ب دەڤەرێن لاوەکی دهێنە هژمارتن، ئەگەر بهێنە بەراوردکرن لگەل دەڤەرێن دەشتاهی. ئاخفتنا دەڤەرێن چیایی یا دابیە ژ ئەگەرێ جهێ وان یێ سەخت و ئاسێ و نەبوونا رێ و باراو هاتن و چوونێ و پەیوەندیکرنێ. بۆ نمونە :هەروەکو سروشتێ دەڤەرا (هەورامان) و ڤەدەربوونا دیالێکتا وان ژ دیالێکتێن دیترێن زمانێ کوردی و نێزیکبوونا هەردوو دیالێکتێن

کوردیێن باکوور و ناڤەراست ژ هەڤدوو، کو ئەڤ نێزیکبوونە ژ وێ گەشەیا بەلاڤا ئاخفتنا خەلکێ دەڤەرێن دەشتاهیدا رووی ددەت کو ب ساناهی ل دەڤەرێن دەشتاهیدا بەلاڤ دبیتەڤە. ئەڤە ژ لایەکیڤەو ژ لایەکێ دیترڤە کپبوون و ژناڤچوونا دیالێکتان بو وێ چەندێ درڤریتەڤە کو خەلکێ چیا بزاڤێ دکەن لاساییا ئەوێ رۆشنبیرێ بکەن ئەوا ل بازێرا بەربەلاڤ، ب ڤێ ژی رۆژ بۆ رۆژێ دیالێکتێن وان بەرەف لاوازبوونێ دچن.

گرنگترین دەسکەفتێن جوگرافیا زمانی د وارێ تیورا زمانیدا بوون، ب پشکداریکرنا وێ د شروڤەکرنا ئەوان یاساێێن سەرەکیێن زال دەست لسەر گەشەیا فەرهەنگیا زمانی. ب راستی ژی پراکتیکرن و تێگەهەشتنا ڤی تێگەهی ڤەدگەریتەڤە بۆکارێن زانا چیرونی، کو ڤی زانای دوو هۆکار دیتنەڤە یێن کو دبنە ئەگەرێ پەیدابوونا داهێنانێ و بەرفرەهبوونا سامانێ پەیڤێن هەر زمانەکی، ئەو هۆکار ژی ئەڤەنە:

١- بەروڤاژیا هەڤدەنگان.

٢- دیاردا رێکنەکەفتنا پێکهاتنا -ئاڤاکرنا- پەیڤان.

تێرمێ بەرو ڤاژیا هەڤدەنگا وێ چەندێ دگەهینیت، کو ئەگەر دوو پەیڤێن هەڤدەنگ هەبن و دوو واتاێێن جودا بدەن ل دویڤ چارچوڤێ ئاخفتنێ — کۆنتێکستی- ، پاشی ئەڤ دوو پەیڤە د چارچوڤێ ئاخفتنێدا بهێنە بکارئینان و ئەو رامانا کو پێدڤیە بهێتە زانین ب دەست نەکەڤیت، ل وی دەمی پەیڤەکا دیتر بهێتە بکارئینان ژ بۆ شرۆڤەکرنا واتایەکێ ژ وان، هۆسا دێ هەڤدەنگی ژ ناڤ چیت .

ل دویڤ بوورینا مێژوویێ بەردەوام گوهورین بسەر پێکهاتنا دەنگادا دهێن، گەلەک جارا وەلێ دهێت کو پەیڤەک هەبیت د بنەرەتدا یا گونجای بیت لگەل

ئەركێ خو پاشی هاتبیتە درێژكرن یان كورتكرن یان دەنگەك لێ هاتبیتە زێدەكرن یان چەند جاركی گوهورین ب سەردا هاتبن كو ب زەحمەت بهێتە نیاسین. دڤان حالەتادا حسابەكا دیتر دگەل وێ پەیڤێ دهێتەكرن..

(زانستێ دیالێكتولۆژیێ نوی)

ڤەكولەرێن بونیاتگەری بابەتێ ڤەكولینا دیالێكتان فەراموش نەكر، بەلكو ئەوان ژی دووپاتكرەڤە كو د شیاندایە ئەو گرنگیا كو جیلێ كەڤن ژ زانایێن بونیاتگەری ب ڤەكولینا دیالێكتان ددا پتر گەشە پێ بهێتە دان ژ لایێ جیلێ د دویڤ واندا د پراكتیكرنا رێبازێن نوی د وارێ دیالێكتاندا.

ژ وێ هژمارا زۆرا ڤەكولینێن وەسفی بۆ رێكخستنا دیالێكتان خویابوو، كو نابیت ڤەكولین و دیاركرنا سیماییێن دیالێكتان هەر ب تنێ ب رەنگەكێ رووت بمینیت ل سنورێ خرڤەكرنا كەرەستان دابیت و پاشی ئەڤ كەرەستە بهێنە پێشچاڤكرن، بەلكو پێدڤیە ئەو بنەماو تایبەتمەندی بهێنە دەستنیشانكرن كو پەیوەندیا دناڤبەرا كەرەستێن هەڤپشكێن هەمی لڤادا بهێنە ئاشكەراكرن، پاشی لڤێن هەڤ شێوە ژ دیالێكتێن جوداجودا بهێنە هەمبەركرن. ئەڤ چەندە ژی تیۆرێكەكا نوی دئێخیتە سەر دیاردێن هەڤشێوەو جیاواز د ناڤبەرا دیالێكتانداو ئاسۆیێن نوی لبەر سینگێ تیورا زماناسیڤە دكەتەڤە.

د قۆناغا بونیاتگەریا ڤەكولینا دیالێكتاندا چەند تێرم و تێگەهێن نوی هاتنە بكارئینان ، وەكو (پەیرەوێ دوولایەنی) و (دیالێكتا كەسی) و .. هتد . ل ژێر كارتێكرنا جوگرافیا زمانی ڤەكولین ل وارێ (گەهەشتنە ئێكا زمانا — التماس اللغوي) گەشە كر، واتە ئەو كومەلگەهێن كو د ئێك دەمدا ب دوو زمان یان دیالێكتێن جیاواز دئاخڤن . نمونە بۆ ڤێ چەندێ : سنورێ گەهەشتنە ئێكا دوو دیالێكتێن ئێك زمان، وەكو دەڤەرێن ئاكرێ و هەریر د ناڤبەرا زمانێ كوردیێ

ژووری و ناڤەراستدا، یان ئەگەر دوو زمانێن جودا بن، وەکو خەلکێ دەوروبەرێن هەردوو بازێرێن دهوک و مویسل کو باهرا پتریا وان دشێن ب کوردی و عەرەبی بپەیڤن. ل ڤێرێ ئەڤ دیالێکتە یان ئەڤ زمانە کارتێکرنەکا ئالوگوری ل پێکهاتنا جوداجودایا هەڤدوو دکەن، کو پێکڤە ژیان و پەیوەندیێن راستەوخوییێن د ناڤبەرا خەلکیدا ئەڤ چەندەیا سەپاندی .

ئەڤی جورێ ڤەکولینا هندەک ئەنجامێن گشتی ب دەستڤە ئینان، کو گرنگیەکا باش هەبوو د مەیدانا ڤەکولینێن زمانیدا، هەر ژبەر ڤێ چەندێ ژێ ڤەکولەرێن زماننناسیێن نوی گرنگیەکا تایبەت دا ڤان جورە ڤەکولینا، ب تایبەتی ئەو پسپورێن د وارێ زماننناسیا دەروونی و زماننناسیا جڤاکیدا کار دکر و گرنگی و ددا کریارا گەهاندنێ و نەخوشییێن گوتنێ و کێشەیێن جڤاکی و ..هتد، دیسان ئەڤی گروپێ زاناو پسپوران زەمینەیەکا خوش و گونجای د ڤی واریدا ل گەل زانایێن دیالێکتولوژیێ رەخساندو ئەزمونا خو د وارێ ڤەکولین ل دیاریێن زماننناسی ڤەگوهاستە دەڤ وان .

زانایێن دیالێکتولوژیێن ئەمریکی (هانز کیوارپ و راڤن ماک داڤید و ولیەم لابوڤ) رەوتەکا دیترا ڤەکولینێ د وارێ دیالێکتاندا گرتەبەر، کو پتر گرنگی ب وان جیاوازیان دا ، ئەوێن ژ ئەنجامێ هەبوونا چین و تەخێن جودا جودایێن کومەلی پەیدا دبن، نەکو ئەو جیاوازیێن ژ هوکارێن جوگرافی پەیدا دبن.

ل نیڤا دویێ ژ سەدێ بیستێ پسپورێن زمانی، ژ بو وەسفکرن و پولینکرنا دیالێکتان رێبازو رێکێن ماتماتیکێ و ئامارێ ب رەنگەکێ بەرفرە گرتینە بەر، بو دانانا گریمانەیان و ب دەستڤەئینانا بەهایێن جوداجودا د وارێ دیارکرنا پێکهاتن و وەکهەڤی و جیاوازیێن د ناڤبەرا دیالێکتانداو پولینکرنا وان. ژ هەژی دیارکرنێیە ل ڤان سالێن دوماهیێ رێبازێن جوداجودا ل دور ڤی بابەتی پەیدابووینە،

هەروەکو (رێبازا هێلێن دابەشکرنێ) یا زانایێ پولەندی (ڤ. دورسێڤسکی)، کو گرنگیێ ددەتە بەلاڤەبوونا دیاردێن زمانی د ناڤ چارچوڤێ کومەلگەهەگێ دیارکریێ زمانیدا*.

## نووسەر لە چەند دێڕێک:

- بەکالوریۆس لە مامۆستایی پیشەیی/ئەندازەی میکانیک لە بەشی مامۆستایانی پیشەیی. زانکۆی تەکنەلۆجیی بەغداد ١٩٩١.
- ماجستێر لە زانستی زمان ئینستۆی زمانەکانی باکوور. زانکۆی ستۆکهۆڵم ٢٠٠٧.

بەرهەمی نووسراو:

- سایکۆلۆژیی زمان ٢٠١٠. ئەکایمیای کوردی. هەولێر. وەرگێران.
- زمان لە ڕوانگەی ڕەگەزەوە ٢٠١٠. سەنتەری کوردۆلۆجی. سلێمانی. وەرگێران.
- ئاوی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ٢٠١٠. دەزگای موکریان. هەولێر. وەرگێران
- فۆنەتیک و فۆنۆلۆجی ٢٠١١. دەزگای سەردەم. سلێمانی.